# سەردەم

گۆڤارێکی تایبەتە بە وەرگێڕان و کەلتووری بیانی

**51**

**حوزەیرانی**
2007
**ســــــاڵی نۆیەم**

–سەردەم گۆڤارێکە بە دوو مانگ جارێك دەردەچێت، تایبەتە بە وەرگێڕانی کەلتووری بیانی لە بواری فەلسەفە و فیکر و رەخنە و لێکۆڵینەوە و داهێنانی ئەدەبی و هونەریدا.

–تکایە ئەو بەرهەمانەی بۆ سەردەمی دەنێرن، ناوی نووسەر و وەرگێڕیان لەسەر بێت، دەقی وتارە ئەسڵییەکەی لەگەڵدا بێت، لەسەر دیوێکی پەڕەکە نووسرابێتەوە یان کۆمپیوتەر کرابێت. پەراوێز و سەرنجەکانیش لە کۆتایی وتارەکەدا هەبن. ئەگەر یەکێك لەو مەرجانە نەهاتنە دی دەستەی نووسەران مافی بڵاونەکردنەوەی هەیە و پێشەکی داوای لێبوردن لە وەرگێڕی بەڕێز دەکات.

–بەرهەمەکان بڵاوبکرێنەوە یان نەکرێنەوە نادرێنەوە بە خاوەنەکەی.

–هەموو پەیوەندییەك لە ڕێگای سەرنووسەرەوە دەبێت.


**خاوەنی ئیمتیاز: شێرکۆ بێکەس**

**سەرنووسەر: ڕەووف بێگەرد**

**دەستەی نووسین**

**ڕێبین هەردی** **شوان ئەحمەد**

**د. شاهۆ سەعید**

**دەرهێنان و کاری کۆمپیوتەری**

**تاڤگە فائق**

**بەرگ: قادر میرخان**

**هەڵەچنی چاپ: ساکار رەووف**

**سەرپەرشتیاری چاپ: فەرهاد رەفیق**



**ناونیشان**

سلێمانی – شەقامی سالم

دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم

تەلەفۆن/ سەرنووسەر 2136659

دەزگای سەردەم *3129609*

**بۆ پەیوەندیکردن لە دەرەوەی وڵاتەوە**

**Tel - Fax: 0044 7543129839**

ناردنی بابەت لە دەرەوەی وڵاتەوە لە رێی سندوقی پۆستی ژمارە ( ***14665/615*** و ***14665/616***) تاران

**لە ڕێگەی ( ئیمەیل )ەوە:**

govarysardam@yahoo.com

govarisardam@sardamco.com

www.sardamco.com



**دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم بڵاویدەکاتەوە**

# ناوەرۆك



## وێستگەکانی سەردەم



**نرخی** (1200) **دینارە**

SARDAM No. 51 2007

# پرۆژەی تێگەیشتن و راڤەکردنی ئاین

## سۆسیۆلۆژیا و ئاین

نووسینی: دانیال هیرڤیۆلێژی
ژان پۆل ویلیەم
لە فەرەنسییەوە: عادل باخەوان

### بەشی یەکەم

**پێشخوێندنەوە:**

یەکەم گرفتی هەر خوێنەرێکی کورد لە بەرامبەر دەقێکی زانستیدا بریتییە لە: هەرسکردنی چەمکەکان. بە درێژایی سەدەی بیستەم کێڵگەی رۆشنبیریی کوردی دەستەوسانبووە لە بەرامبەر تێگەیشتن و کورداندنی چەمکەکاندا. کاتێکیش هەوڵ دراوە، چەمکێك رابگوێزرێتە نێو ئەم کێڵگەیەوە، زۆرجار لە مانا سەرەکییەکانی بەتاڵ کراوەتەوە.

هەر زانایەك سیستەمێك لە چەمك و زاراوەو گوزارشتی تایبەت بە خۆی هەیە و بە بێ تێگەیشتن لێیان زۆر ئەستەمە خوێنەر بتوانێت پێبنێتە نێو گەردوونی کردەی راڤەکردن و بەرهەمهێنانە زانستییەکانی ئەو زانایە. چۆن دەتوانین لە مارکس تێبگەین بەبێ تێگەیشتن لە چەمکی "ئانفرا-ستراکتۆر" و "سووپەر ستراکتۆر" یان چەمکی "دیتێرمینیسم" کە هەموو بیرکردنەوەی مارکسی لەسەر دامەزراوە؟ بێگومان بۆ فەرەنسیەك ئەم کارە ئاسانە، چونکە کاتێك لە دەقێکدا لە چەمکی "دیتێرمینیسم" تێناگات، راستەوخۆ دەگەڕێتەوە سەر فەرهەنگی چەمکە زانستییەکان، بەلأم خوێنەری کورد بۆ کوێ بگەڕێتەوە؟ پەنا بەرێتە بەر کام فەرهەنگی زانستی؟

لە هەندێك هەلومەرجی تایبەتیدا خوێنەر، گەر خۆی زۆر ماندوو بکات، دەکرێت دەستی لە چەند چەمکێکی کوردێنراو گیر ببێت، بەلأم ئەم

چـەمکانە ئەوەنـدە ئـاڵۆز کـراون و ئەوەنـدە تـەماوی کـراون کـە خوێنـەر نـەتوانێت سـەریان لێدەربکات. لە نێو کیڵگەی رۆشنبیری کوردیدا هەنـدێکجار هەسـت بـەوە دەکـەم، وێنـەی رۆشـنبیری هـەرە گـەورە بـووە بـە وێنـەی ئـەو نووسـەرەی کـە هـەموو چـەمکەکان بەڕادەیـەك ئاڵۆز دەکات کە کەس سەریان لەبەر دەرنەکات. ئـەم جـۆرە لـە رۆشـنبیر تـەنها لـە کێڵگـەی رۆشـنبیریی کوردیـدا جێگـای دەبێتـەوەو گـەر وەری بگێڕینـە سـەر زمانـەکانی دیکـە بـەهیچ شێوەیەك و هیچ کێڵگەیەکی رۆشنبیریی جیهان دەرگای بۆ ناکاتەوە.

پیـەر بۆردیـۆ، کـە یەکێکـە لـە دامەزرێنـەرانی زانستە کۆمەڵایەتییەکان لەسەر ئاستی جیهـان، کاتێك سەردانی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمـەریکا دەکـات و لـە قوتابخانـەی شـیکاگۆ "کەشـفی" کارگـە فیکریەکـەی ئیڤرین گۆفمـان دەکـات، کـە تـەواو پێچـەوانەی کارگـە فیکریەکـەی ئـەوە، دەگەڕێتەوە فەرەنساو پرۆژەیـەك دادەمـەزرێنێت بە ناوی: "پرۆژەی بەفەرەنسیکردنی گۆفمان" و لیژنەیـەکی فراوانـی وەرگێڕان دروستدەکات بـۆ ئـەوەی هـەموو کتێبـەکانی گۆفمـان بکـات بـە فەرەنسـی. کـە لێـی دەپرسـین بـۆ ئـەم کـارە دەکەیت، ئەو دەڵێت: "بۆ ئەوەی خوێنـەر لە من تێبگات، دەبێت کارگە فیکریەکەی ئەوانی دیکە بخوێنێتەوە".

ئێمـە، بـە هاوکـاری و پشـتیوانی دەزگـای سـەردەم، بڕیارمانـداوە حەڤـدە قوتابخانـەی گـەورەی جیهـانی لـە بـواری زانسـتە کۆمەڵایەتییەکاندا بخەینە بەردەست خوێنـەری کورد. ئەم قوتابخانانە بە مارکس دەستپێدەکات و لـە پیـەر بۆردیـۆدا کۆتـایی پێـدێت. بێگومـان کاری ئێمە لێرەدا زیاتر بریتییە لە خستنە سەر شـانۆی تێگەشـتنە زانسـتییەکانی ئـەم زانایانـە لەسـەر دیـاردەی ئاین. واتـە ئێمـە قسـە لـە کۆی قوتابخانـەکان ناکـەین، بـەڵکو گڵـۆپ لەسـەر یـەك گۆشـەیان دادەگیرسـێنین. گۆشـەی ئـاین لـە فیکری ئەواندا.

ئـەوەی ئـەمڕۆ لـە رۆژهـەڵاتی ناوەڕاسـت بـە گشـتی و لـە کوردوسـتاندا بەتایبـەتی وەڵامـی پرسیاری: ئاین چیە؟ دەداتـەوە، ئیماندارەکانن. واتـە ئـەو کەسـانەن کـە بڕیـاری خۆیـان داوەو خۆیـان یـەك لایـی کردووەتـەوە. بێگومـان ئێمـە باس لەوە ناکەین کە وەڵامی ئیماندارەکان باشە یان خراپ، باش و خراپ زاراوەی زانستی نین. بـە پێچەوانەوە، ئێمـە لـە رێگـای وەرگێڕانـی ئـەم حەڤـدە قوتابخانـەوە، دەمانـەوێت نـەك هـەر بـە تـەنها وەڵامـی ئـەو پرسـیارە بدەینـەوە، بـەڵکو تێگەیشـتنی ئیمانـدارەکان لـە ئـاینیش راڤـە بکـەین. بـە کـوردیکردنی ئـەم حەڤـدە قوتابخانەیـە، رووبەڕووکردنـەوەی نـەوەی نـوێی کۆمەڵگـەی کوردیـە لەگـەڵ فیکـری حەڤـدە قوتابخانـەی جیهانیـدا لەسـەر ئـاین. حەڤـدە قوتابخانە کە بە حەڤدە مێتۆدۆلۆژیای زانستی لەیـەکتر جیـا وەڵامـی پرسـیاری: ئـاین چییە؟ دەدەنەوە.

بـۆ ئـەوەی بـە شـێوەیەکی کـاتی، کـاری خوێنـەری کـورد ئاسـان بکـەم، هەوڵمـداوە لـە کۆتـایی هـەر قوتابخانەیەکەوە چەند چەمکێکی سـەرەکی زانـای باسـکراو شـیبکەمەوەو ئامۆژگـاری خوێنـەر دەکـەم کـە لـە چـرکەی خوێندنـەوەی ئـەم دەقـەدا بـەردەوام بگەڕێتـەوە

سەریان. تا ئەوکاتەی کە لەگەڵ دەزگای سەردەمدا هەوڵدەدەین پرۆژەیەکیش بۆ بە کوردی کردنی چەمکەکانی زانستە کۆمەڵایەتیی و مرۆییەکان ئامادە بکەین، ئومێد دەکەم ئەو خزمەتە بچووکە سوود بە خوێنەری مەحرومی کورد بگەیەنێت.

عادل باخەوان

پاریس

23ی ئەڤریلی 2007

## بەشی یەکەم

### کارل مارکس (1818-1883) و فردریك ئینگلس (1820-1895)

#### 1- بە هێزی و لاوازی راڤەکردنی مارکسیانەی ئاین

بۆچی سۆسیۆلۆژیای ئاینەکان دەبێت گرنگی بدات بە مارکسیسم؟ لە راستیدا ئێمە تا ئێستاش مارکس و ئینگلس وەك رەخنەی فەلسەفی و سیاسی دژە ئاین دەناسین (ئاین ئەفیونی گەلە) نەك وەك سۆسیۆلۆگی کردە ئاینیەکان. ئەگەر راستبێت کە رەگەزەکانی راڤەکردنی کردەی ئاینیی لای مارکس و ئینگلیس (لای ئینگلس زیاتر و رونتر) لە دوو توێی رەخنەیەکی گشتی لە ئایندابن، ئەوەش راستە کە ئەم دوو زانایە چەندین رەگەزی بەهاداری راڤەکردنی ئاین و چەندین پرسیاری گرنگیان لە ئاین کردووەو هەموو ئەو رەگەز و پرسیارانەش راستەوخۆ پەیوەندن بە مەیدانی سۆسیۆلۆژیاوە. ناموبوون (ئەلیەناسیۆن) و هەیمەنە (دۆميناسیۆن) و ململانێ (کۆنفلی) پرسیارە هەرە گرنگەکانی راڤەکردنی مارکسیانەی ئاینن.

ناموبوون (ئەلیەناسیۆن): پرسیارە لە هەموو ئەو شتانەی کە بەشداری دەکەن لە هەڵوەشانەوەو پاشان بیناکردنەوەی دەزگای وێناکردنی جیهانی کۆمەڵایەتی ئەکتەرە کۆمەڵایەتیەکان.

هەیمەنە (دۆميناسیۆن): بایەخدانە بە پەیوەندیەکانی دەسەڵات لە چرکەی راڤەکردنە سۆسیۆلۆژیەکاندا، بە تایبەتی بایەخدان بەو پەیوەندیانەی لەسەر بناغەی چینە کۆمەڵایەتییەکان دادەمەزرێن و دەرەنجامی چالاکی بەرهەمهێنانن.

ململانێ (کۆنفلی): ململانێی چینەکان وەك رەهەندی سەرەکی ژیانی سەرجەم کۆمەڵگاکان و کردەی بەرەوپێشەوە چوونیان.

هەموو ئەم پرسیارانەی کە چوارچێوەی راڤەکردنی کۆمەڵگەی سەرمایەداری لای مارکس و ئینگلس دەستنیشان دەکات، چۆنیەتی کارکردنیشیانمان لەسەر ئاین پێ دەناسێنن:

ئاین وەك ناموبوون دێت و جیهانی کۆمەڵایەتیمان لێ تاریك دەکات. ئاین وەك هەیمەنە دێت و شەرعیەت دەدات بەوەی کە دەسەڵاتی لەدەستدایە. هەروەها ئاین وەك ئەو رەگەزەی کە داپۆشراوە بە کارایی ململانێی چینەکان. هەموو ئەمانە لای ئەم دوو زانایە تێکەڵبوون بە روانینێکی فەلسەفی و سیاسی. لەم روانینەدا ماتریالیسمی دیالیکتیك جێگای کردە ئاینیەکان دەگرێتەوە، چونکە وەك بەدیلێکی زانستیانەی پێشکەوتووخوازانەی

بینینە ئاینیەکان پێشنیارکراوە.

گوتاری مارکسیست لەسەر ئاین "بە تەنها" لەسەر راڤەکردنێکی سۆسیۆلۆژیانەی ئاین نیە، بەڵکو لە هەمانکاتدا رەخنەیەکی فەلسەفی و سیاسیانەی ئاینیشە. لە بیرمان نەچێت کە مارکسیسم لەسەر ئاستی فەلسەفی میراتگری سەردەمی رۆشنگەری و جیهانبینی لودویگ فیورباخە (1804-1872) کە لە کتێبی جەوهەری کریستیانیسم دا (1841) توێژینەوەیەکی ئەنترۆپۆلۆژیانەی ئاینی ئەنجامداوەو بەوردی "نامۆبونی ئاینی" راڤەکردووەو گەشتوەتە ئەو ئەنجامەی کە ئەم نامۆبوونە دەرەنجامی هەوڵدانی مرۆڤە بۆ "وەرگێڕانی" خۆی لە بوونێکی فیزیکیەوە بۆ بوونێکی غەیبانی. هەروەها لەسەر ئاستی سیاسیش، مارکسیسم پێیوایە ئاین کەرەسەیەکی بەکارهێنراوە لەلایەن چینی هەیمەنەدارەوە بۆ شەرعیەتدان بە هەیمەنەکردن و رێگرتن لەهەر راپەڕینێکی هەیمەنە لەسەر کراوەکان.

لە روانگەی سۆسیۆلۆژیاوە، تێبینی ئەوە دەکەین کە مارکسیسم ئاین وەك دیاردەیەکی سوپەر – ستراکتۆر تەماشادەکات و لەبەرامبەر بنەما سەرەکیەکانی کۆمەڵگەدا ئۆتۆنۆمیەکی "رێژەیی"هەیە. بنەما سەرەکیەکانی کۆمەڵگەش لای مارکس بریتین لە دەزگاکانی بەرهەمهێنانی شتە مادیەکان و هەموو ئەو پەیوەندیە کۆمەڵایەتیانەی کە لە نێو ئەو دەزگایانەدا دروست دەبن.

بێگومان لە گەردوونی مارکسیسمدا ئەوەی بۆ ئێمە گرنگە چۆنیەتی راڤەکردنی سۆسیۆلۆژیانەی ئاینە، بەڵام پێمانوایە بۆ گەشتن بەم ئامانجە، دەبێت لەسەر رەخنە سیاسیەکانی ئەم قوتابخانەیە رابوەستین و لێیان وردبینەوەو هەڵیانبسەنگێنین، چونکە زۆر جار، راڤەکردنە سۆسیۆلۆژیەکانی مارکس و ئینگلس لەسەر دیاردە ئاینیەکان بوون بە ژێر رەخنە سیاسیەکانیانەوە.

## 2- کارل مارکس و فردریك ئینگلس: ژیانێکی تێکۆشەرانە

کارل مارکس سالی 1818 لە ترێڤ *treves* لەدایك دەبێت و لە باوەشی خێزانێکی جولەکەدا گەورە دەبێت. خێزانێك کە لە ژێر زەبری سەردەمی رۆشنگەریدا رەنگە ئاینیەکەی تەواو کاڵدەبێتەوە.

باوك و دایکیشی لە نێو دوو خانەوادەی "حاخام"دا پەروەردە کرابوون. واتە مێژووی خانەوادەکەی لکاوە بە مێژووی پیاوە گەورەکانی ئاینی جولەکەوە. لە ساڵی 1816 دا باوکی لە ناوچەی "رێنانی" ژێر دەسەڵاتی پروسیەکاندا پارێزەربوو، بۆ ئەوەی پیشەکەی لەدەست نەدات، ناچار بوو ئاینەکەی بگۆڕێت و خۆی وەکو پرۆتیستانت بناسێنێت. تەنانەت مارکس خۆشی ناچارکرا بچێتە نێو ئاینی پرۆتیستانەکانەوە.

مارکس لە شاری بۆن و بەرلین دەست بە خوێندن دەکات و ساڵی 1841 دوکتۆرا لە فەلسەفەدا بەدەست دەهێنێت. سەرەتا بە رۆژنامەنووسی دەستپێدەکات و پاشان دەبێت بە سەرنووسەری رۆژنامەیەکی دیموکراتخوازی شۆڕشگێر بەناوی *Rheinische Zeitung*، کە

دواتر لەلایەن حکومەتەوە قەدەغە دەکرێت و سەرنووسەرەکەشی ناچار دەکرێت وڵات بەجێبێڵێت و فەرەنسا وەك مەنفا هەڵبژێرێت. لەسەر داوای حکومەتی پرووس فەرەنسای "گویزۆ"یش دەرگاکانی خۆی لەسەرداددەخات و داوای لێدەکات خاکەکەی بەجێبێڵێت. مارکس بەناچاری لە ساڵی 1845دا وەك پەناهەندە ڕوودەکاتە برۆکسل. ساڵی 1848 برۆکسلیش ناچاری بە ڕۆشتنە دەرەوە دەکات. مارکسی بێلانە، لەلایەن حکومەتە نوێیە شۆڕشگێڕەکەی فەرەنساوە بانگهێشت دەکرێت و پەنا دەدرێت. لە هەمان ساڵدا مارکس مانیفێستی کۆمۆنیست *Le Manifeste communiste* بڵاودەکاتەوە. پێشتر کۆمەڵەی کۆمۆنیستەکان لە کۆنگرەی دووەمیاندا لە لەندەن، ساڵی 1847 ئەم داوایەیان لێکردبوو.

دواتر مارکس دەگەڕێتەوە بۆ ئەڵمانیا، بەڵام خێرا تێدەگات لەوەی کە لەم وڵاتەدا جێگای نابێتەوە، سەرلەنوێ ڕێگای مەنفا دەگرێتەبەرو ئەمجارە وەك پەناهەندە ڕوودەکاتە لەندەن (1849). هەر لێرە یەکەم بەشی کتێبە بەناوبانگەکەی "سەرمایە" بڵاودەکاتەوە (1867)، هەر لێرەش و بۆ یەکەمجار "ڕێکخراوی جیهانیی کرێکاران" دروستدەکات و دواتر وەك "یەکەم ئەنتەرناسیۆنال" ناوبانگ دەردەکات. مارکس ساڵی 1883 لە لەندەن بۆ یەکجاری کۆچی دوایی دەکات.

مارکس لەهەموو ژیانیدا مامۆستای زانکۆ نەبووەو موچەیەکی مانگانەی جێگیری نەبووەو بە یارمەتی بەردەوامی هاوڕێ و هاوکارە هەرە نزیکەکەی "ئینگلس" ژیاوە. ئینگلس ساڵی 1844 لە پاریس مارکس دەناسێت و لەو ساتەوە سەرمایەکەی خۆی دەخاتە خزمەتی.

فردریك ئینگلس ساڵی 1920 لە بارمێن *Barmen* لەدایکبووەو لە خانەوادەیەکی پیشەسازیدا گەورە بووە. ئەم خانەوادەیە دواتر لە شاری مانشستەر لە بەریتانیادا جێگیر دەبێت. ئنگلس لە منالێدا کەسێکی تەواو ئیماندار بووەو لە ژێر کاریی تەقواو خواناسی پرۆتستانتدا بووە. ئەوە دەڵێت:

"من لە نێو ئەوپەڕی تەقواو خواناسیدا پەروەردەکرام"

ئینگلس پەیوەندی لەگەڵ دوو هاوڕێی منداڵیدا دادەمەزرێنێت، هەردووکیان برابوون و خوێندکاری تیۆلۆژیای پرۆتستانت بوون و ناویان *Graeber* بوو. لە سەرەتاوە دەکەوێتە نێوان بەرداشی ئیمانە قوڵە ئاینیەکەی و قەناعەتە عەقڵیەکانی، بەڵام دواتر و بەخێرایی هەموو ئیمانە ئاینیەکەی سەردەمی منالی و لاوێتی لەدەست دەدات و بەتەواوی خۆی بۆ جیهانە عەقڵیەکەی یەکلایی دەکاتەوە.

### 3- ڕەخنەی فەلسەفی - سیاسی لە ئاین و ڕاڤەکردنی سۆسیۆلۆژی

لە کتێبی "ڕەخنە لە فەلسەفەی مافی هیگل" کە لە ساڵی 1844 دا بڵاوبووەوە، مارکس پێماندەڵێت بۆچی، بێگومان بە بۆچوونی ئەو، ڕەخنەگرتن لە ئاین بازاڕی گەرمە. هەر لەم نووسینەدا ئەو پێیوایە کە کاتی ئەوە هاتووە کردەی ڕاڤەکردن و ڕەخنە ئاراستەی خودی ئاین نەکرێت، بەڵکو

ئاراستەی ئەو کۆمەڵگەیە بکرێت کە وەهمی ئاینی بەرهەم دەهێنێت:

"رەخنە لە ئاین سەرەتای هەموو رەخنەکانە. (...) بناغەی رەخنەی نائاینی بریتیە لەوەیکە: مرۆڤ خۆی ئاین دروستدەکات، نەك ئاین مرۆڤ دروستدەکات. (...) مرۆڤ خۆی جیهان و دەوڵەت و کۆمەڵگەی مرۆڤە. دەوڵەت و کۆمەڵگە ئاین بەرهەمدەهێنن.. ئاین وشیاری لنگاوقووچی جیهانە..

ئاین:

- تیوری گشتیی جیهانە.
- کۆی ئەنسکلۆپیدیای جیهانە.
- لۆژیکیەتی لە فۆرمە جەماوەریەکەیدا.
- شەرەفە رۆحیەکەیەتی.
- حەماسیەتیەتی.
- چوارچێوە ئەخلاقیەکانیەتی.
- کامڵبوونە سروتگەراکانیەتی.
- دڵدانەو بەهانە جیهانیەکانیەتی.
- ئاین پانتایی بەدیهێنانی فانتاستیکانەی خودی مرۆڤە، چونکە مرۆڤ خاوەنی واقیعێکی راستەقینە نیە.

لێرەوە ململانێ لەگەڵ ئایندا بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ دەبێت بە ململانێ لەگەڵ ئەم جیهانەدا کە ئاین "بۆن"ە رۆحیەکەیەتی. کلۆڵی ئاین، بۆ لایەك، گوزارشتە لە کلۆڵی واقیع، بۆ لایەکی دیکەش ناڕەزاییە بە رووی کلۆڵی واقیعدا. ئاین:

- هەناسەی چەوساوەکانە.
- دڵی جیهانێکی بێ دڵە.
- رۆحی ئەو هەلومەرجە کۆمەڵایەتیانەیە کە رۆحیان تیادا نەماوە.
- ئاین ئەفیونی گەلە.

سووربوون لەسەر پشتکردنە وەهمەکانی جیهانی کۆمەڵایەتی گەل سووربوونە لەسەر پشتکردنە جیهانێکی کۆمەڵایەتی کە پێویستی بە وەهم هەیە. رەخنە لە ئاین رەخنەیە لەو دۆڵی فرمێسکەی کە ئاین تیایدا دەدرەوشێتەوە. (...) لێرەوە:

- رەخنە لە ئاسمان دەبێت بە رەخنە لە زەوی.
- رەخنە لە ئاین دەبێت بە رەخنە لە ماف.
- رەخنە لە تیۆلۆژیا دەبێت بە رەخنە لە سیاسەت."[(1)] (*SR, 41-42*)

ئەم دەقە گرنگە، لە روانگەی مارکسیستەوە، دەریدەخات کە راڤەکردنی ئاین لەیەککاتدا گرنگەو گرنگیش نیە، پلەیەك و پلە دووشە. گرنگە چونکە سەرەتای راڤەکردنێکی رەخنەییانەی هەلومەرجە مرۆییەکان و کۆمەڵگەیە، گرنگیش نیە چونکە بە درێژایی مێژوو رەخنەی زۆرمان لێیان گرتووە و ئێستا کاتی ئەوە هاتووە کە پێبنێینە قۆناغی رەخنەگرتن لەو کۆمەڵگەیەی کە نامۆیی ئاینی بەرهەمدەهێنێت، نامۆییەك کە کاردەکات لەسەر بیناکردنی:

"پارادیگمی هەموو فۆرمەکانی دیکەی نامۆیی، مرۆڤ هێزێکی لە دەرەوەی خۆی خەڵقکردووەو ناشیەوێت وەك مەخلوقێکی خۆی تەماشای بکات[(2)]".

لێرەوە ئێمە تێدەگەین لەوەی کە بۆچی، لە تێکستە مارکسیستەکاندا، ئاین جیهانێکی ئۆتۆنۆم نیە و خاوەنی لۆژیکی سەربەخۆی خۆی نیەو هەڵقوڵاوی واقیعێکی کۆمەڵایەتی

تایبەتــە. بــەلاّم لەگــەلّ ئــەم بۆچوونەشـــدا، مارکس و ئەنگلس پێدادەگرن لەسەر ئەوەی کە ئــاین بەتــەنها گوزارشــت نیــە لــە کلۆلّیــە واقیعیــەکان، بــەلّکو نارەزاییــەکی تووندیشــە بــە رووی هــەموو کلۆلّیــە واقیعیەکانیشــدا. مــارکس دەیەوێت پێمانبلّێت:

گــەر ئــاین بەرهەمهێنــەری چــەند شــتێکی وەهمــیش بێــت، خــۆی لــە خۆیــدا وەهــم نیــە، چــونکە پڕاوپــڕ گوزارشــتە لــە واقیعێکــی کۆمەلاّیــەتی کــە بــوونێکی بەرجەســتەبووی هەستپێکراوی تێبینیکراوی هەیە. گوزارشتە لە واقیعـی دڕانـی مرۆڤێـك کـە تـەنها لـە چرکەی کوژانەوەی نامۆیی ئابوریدا (کە بناغەی هـەموو نامۆییەکانی دیکە) کۆتایی پێدێت.

پێناســــەکردنی ئــــاین وەك "ئــــەفیون" داهێنـانێکی مـارکس نیـەو پـێش ئـەو (1875-1812) *Hess* و *Moses* (1856-1797) *Heine* *Henrich* هــــەمان دەســــتەواژەیان بەکارهێناوە. هـەروەها *Emmanuel Kant*یش لـە کتـێبی "ئـاین لـە سنورەکانی عـەقلّی سـادەدا" (1794) بــــەکاریهێناوە. ئــــەوەی مــــارکس جیادەکاتــەوە لەوانــەی پێشــوو چــۆنیەتی مامەلّەکردنیەتی لەگەلّ پێناسەکەدا. قسەکردنی ئـەو لـە ئـاین وەك ئـەفیونی گـەل، تۆمـارکردنی کردەی رەخنەگرتنە نەك لە خودی ئاین بەلّکو لە سیاســـەت. ئــــەوەی بــــۆ مــــارکس گرنگــــە" رزگــارکردنی وشــیاریە لــە دەســەلاّتی ئــاین" (رەخنــــە لــــە پرۆگرامــــی پــــارتی کرێکــــاری ئەلّمانی، 1875).

مارکس رەخنە دەگرێت لە ئازادی وشیاریی بــۆرژوا چــونکە بــەلای ئــەوەوە "پانتــایی دەرکەوتنی هەموو فۆرمەکانی ئازادی وشیاریی ئاینیــە". لــە بــەرگی یەکــەمی "ســەرمایە"دا مارکس دەنووسێت:

"کــارایی ئــاین بەســەر واقیعــەوە بــەردەوام دەبێت تا ئەو کاتەی کە هەلومەرجی کارکردن و ژیــانی پراکتیــك چــەند پەیوەندیــەکی شــەفاف و عەقلانی لەگەلّ مرۆڤەکانی دیکە و سروشتدا بە مرۆڤ دەناسێنن." لا 614.

کاتێك مـارکس دەلّێت "ئـاین مـرۆڤ دروسـت ناکـات، بــەلّکو مــرۆڤ ئـاین دروسـت دەکـات"، دەرگایــەك بەســەر زانســتە کۆمەلاّیەتیەکانــدا دەکاتــەوە. بــۆ تێگەشــتن و راڤــەکردنی کــردە ئاینیەکان زانستە کۆمەلاّیەتیەکان ئەم پرانسیپە مارکســیە، لەســەر چــەند ئاســتێکی جیــاواز، وەردەگرن و کاری لەسەر دەکەن، بۆ نموونە:

- نوێنەرایــــەتیکردنی جیهــــانی غــــەیبی (نەبینراو).
- جولاّنەوە ریتویلەکان (سروت - تقوس).
- مۆدێلەکانی ژیان.
- کۆبوونــەوە ئاینیــەکان و کــۆی پەیوەندیــە ناوەکیەکانیان.

هەموو ئەمانە وەك چەند دیاردەیەکی مرۆیی مامەلّــــەیان لەگەلّــــدا دەکرێــــت و زانســــتە کۆمەلاّیەتیــــەکان هەولّــــدەدەن لــــە رەگــــەزو گەشەکردن و کاراییەکانیان تێبگەن.

جیــــاوازی نێــــوان مارکسیســــم و زانســــتە کۆمەلاّیەتیــەکان لەوەدایــە کــە مــارکس بــە ماشــینێکی رەخنەگرتنــەوە دێــت و "فــەزحی" ئــاین و گوزارشــتە ئاینیــەکان دەکــات، بــەلاّم زانســتە کۆمەلاّیەتیــەکان بــە پێچــەوانەوە کــار لەسەر بنەمایەکی دیکە دەکەن کە دەکرێت ناوی

بنێین" حسابکردن بۆ گوزارشتە ئاینیەکان وەك دیاردەی کۆمەڵایەتی[3]". بێگومان جیاوازی نێوان ئەم دوو "موقارەبەیە – *approche*" لەسەر ئاستی پلە نیە. واتە تەنها چەند پلەیەك لەیەك جیاواز نین، بەڵکو کۆی سروشتی کارکردن و روانین و تێگەشتنیان لەیەکتری جیاوازە. دەکرێت کارکردنی زانستە کۆمەڵایەتیەکان بە "موقارەبەی" تێگەشتن و راڤەکردن ناوبەرین و کارکردنی مارکسیسمیش بە "موقارەبەی" هەڵوێستی سیاسی و فەلسەفی ئەنتی – ئاین بخەینە سەر شانۆ.

لە "موقارەبەی" مارکسیستدا رەخنەی فەلسەفی و رەخنەی سیاسی یەکتری بەهێز دەکەن. دەبێت لەبیرمان نەچێت کە مارکس لە سەردەمێك و لە وڵاتێکدا دەنووسێت کە ئاین و سیاسەت تێکەڵ بەیەکتری دەبن و کەنیسەی لۆتەری ئاوێزانی دەوڵەتێك دەبێت کە بە مەسیحی ناوی دەرکردبوو (مەبەست لە پروسی فردریك گیوم *III* و *IV* و گیومی یەکەمە). لەم دەوڵەتەدا کەنیسە بەشداریەکی بەهێز دەکات لە شەرعیەتدان بە دەسەڵات و دیاریکردنی چوارچێوە کۆمەڵایەتیەکاندا.

لەو سەردەمەدا تەنانەت سۆسیالیسمی پێش مارکسیش هیچ جۆرە دژایەتیەکی لەگەڵ ئاین بە گشتی و کریستیانیسمیش بەتایبەتیدا نەبوو، بەڵکو زۆر لە سۆسیالیستەکان مومارەسەی جۆرێك لە ئاینداریان دەکرد، دەکرێت لێرەدا باس لە فوریە و کابێ و ڤیتلینگ بکەین. مارکس و ئینگلس بە توندی رەخنە لەم سۆسیالیسمە دەگرن و بە "سۆسیالیسمی یۆتۆپی" ناودەبەن. ویلیەم ڤیتلینگ (1808–1875) کۆمۆنیسم و کریستیانیسمی تێکەڵ بەیەکتری دەکرد و لە قوتابخانەی ئیڤۆنژیلیسمی دژە – کەهەنوتیدا عیسا وەك یەکەم شۆڕشگێر دەناسێنێت (ئینجیلی هەژارێکی گوناهبار، 1843–1845).

بە پێچەوانەی ڤیتلینگەوە کە دەڵێت "هەموو مرۆڤەکان برای یەکترن" مارکس و ئینگلس دەڵێن "کرێکارانی جیهان یەکگرن". *Moses Hess* (1812–1875) کە بە "حاخامێکی کۆمۆنیست" ناوبانگی دەرکردبوو، کاراییەکی زۆر لەسەر مارکس و ئینگلس دادەنێت. بەڵام ئەم دوانە دواتر بە توندی رەخنە دەگرن لە کۆمۆنیسمە قیامەتیەکەی.

ئاوێزانکردنی رەخنە فەلسەفی و سیاسیەکان لەلایەن مارکس و ئینگلسەوە سۆسیالیستەکانی فەرەنسای ئەو کاتە بێزار دەکات و تووشی گومان و بێ متمانەییان دەکات بەو ئەڵمانیانەی کە "کەوتوونەتە داوی دژە ئاینەوە."[4]

ساڵی 1847، لە بڵاوکراوەی *Gazette allemande de Bruxelles* دا مارکس بە توندی رەخنە لە "پرانسیپە کۆمەڵایەتیەکانی کریستیانیسم" دەگرێت و پێوایە ئەم پرانسیپانە سەرچاوەی سەرەکی سیاسەتی حکومەتی "پروسی"ن. ئەو رەخنەیەی مارکس وەڵامە بە بابەتێك کە لە *Observateur* دا کە ئۆرگانی رەسمی حکومەت بوو بڵاوبووبوەوە. ئەم تێکستە کارەکتەری جەدەلی "موقارەبەی" مارکس ئاشکرا دەکات. جەدەلێك کە لە رێگای ململانێ سیاسیەکانی مارکسەوە دەرگا لەسەر خۆی دەکاتەوە:

"مــاوەی هــەژدە ســەدەیە کــە پرانســیپە کۆمەڵایەتیەکانی کریستیانیسم گەشە بە خۆیان دەدەن و ئێستا پێویستیان بە راوێژکارێکی حکومەتی "پروسی" نیە بۆئەوەی بێت و گەشەیان پێبدات.

پرانسیپە کۆمەڵایەتیەکانی کریستیانیسم پاساویان بۆ کۆیلایەتی ئەنتیك هێنایەوە، دەستخۆشیان لە سیستەمی دەرەبەگایەتی سەدەکانی ناوەڕاست کرد و لە هەمان کاتیشدا دەیانەوێت رێگری لە چەوسانەوەی پرۆلیتاریا بکەن!

پرانسیپە کۆمەڵایەتیەکانی کریستیانیسم بانگەشە بۆ "زەرورەتی" دوو چین دەکەن، چینی "هەیمەنەکار" و چینی "هەیمەنە لەسەرکراو". تەنها شتێکیش کە دەتوانن بە چینی دووەمی ببەخشن دوعاکردنە.

پرانسیپە کۆمەڵایەتیەکانی کریستیانیسم هەموو ئەو بێحورمەتیانەی کە بە کرێکاران دەکرێت و راوێژکارەکەمان باسیان دەکات دوادەخات تا کاتی گەڕانەوە بۆ ئاسمان، بۆ ئەوەی پاساو بۆ مانەوە لەسەر زەوی بهێنێتەوە.

پرانسیپە کۆمەڵایەتیەکانی کریستانیسم دەیانەوێت باوەڕمان پێبێنن کە تاوانی "هەیمەنەکارەکان" لە بەرامبەر "هەیمەنە لەسەرکراوەکان"دا لە دوو شت تێناپەڕێت: یان سزای گوناهی یەکەمیانە، یان تاقیکردنەوەی خوایە بۆ ئیماندارەکان.

پرانسیپە کۆمەڵایەتیەکانی کریستیانیسم بانگەشە دەکەن بۆ:

- ترسنۆکی.
- بۆ بێنرخکردنی خود.
- بۆ سەفالەت.
- بۆ سەرشۆڕی.
- بۆ بێرێزی
- بە کورتی بۆ هەموو سیفەتێکی ناشیرین.

پرۆلیتاریا کە نایەوێت وەك کۆیلە تەماشا بکرێت پێویستی بە ئازایەتی و هەستکردن بەشەرەف و رێز هەیە. پرانسیپە کۆمەڵایەتیەکانی کریستیانیسم پرانسیپی قۆڵانچەن و پرۆلیتاریاش شۆڕشگێڕە." (*SR, p. 82-83*)

بۆ هەڵسەنگاندنی رەخنەیەکی لەم جۆرە لە ئایین، زانستە کۆمەڵایەتیەکان تەنها یەك رێگایان لەبەردەستدایە کە بریتیە لە: قسەکردن لەسەر کردەکان. واتە هەوڵدان بۆ تێگەشتن و راڤەکردنی هەڵوێستی کرداریی و پراکتیکیی کەنیسەو مەسیحیەکان لەسەر گرفتە کۆمەڵایەتیەکان و بەگشتی و لەسەر پرسیاری کرێکارانی سەدەی نۆزدەهەم بەتایبەتی.

تەواو بە پێچەوانەی مارکسەوە، کاری زانستە کۆمەڵایەتیەکان بریتیە لە توێژینەوەی ئەزمونگەرای و مێژوویی لەسەر کارایی سۆسیۆ- پۆلیتیکەکانی مەسیحیەت و مەسیحیەکان لەو سەردەمەدا، نەك کارکردن بۆ دۆزینەوەی پێناسەیەکی گشتی و تیۆری مەسیحیەت لەسەر شتەکان. لێرەوە چۆنیەتی کارکردنی سۆسیۆلۆگ و مێژوونووسێك لە چۆنیەتی کارکردنی کارل مارکس، کە لە ژێر زەبری گریمانە فەلسەفیە دژە ئاینیەکانیدا دەناڵێنێت و لە لێکۆڵینەوەی ئاینێکی وەك مەسیحیەتەوە دەگاتە ئەو دەرەنجامەی کە

هـــەموو ئاینـــەکان کۆنـــەپارێزن و کاردانـــەوەن، جیادەبێتەوە.

گوزارشـــتە ئاینیـــەکان لـــە رابـــوردوداو لـــە ئەمڕۆشـــداو لـــە داهاتووشـــدا دەکرێـــت بـــبن بـــە "ئەفیونی گەل"، ئەمە هیچ گومانی تیادا نییە. لـــــە ســـــەردەمی لـــــەدایکبوونی کۆمەڵگـــــەی پیشەسازیدا، کەهەنووتیەکان، هەرچەند خۆیان وا دەردەخســـت کـــە خـــەمی کرێکارانیانـــە، بـــەردەوام بانگەشـــەیان دەکـــرد بـــۆ ســـەپاندنی" یاسـای غـەیبانی لەسـەر نایەکسـانی سروشـتی مرۆڤەکان" و "تەماشاکردنی کار وەك کەفارەتی گونـاه و" داواکـردن لـە کرێکـاران کـە "هـەموو خەونـــەکانیان بـــە زەویـــەوە نەبەســـتنەوەو لـــە چرکەی کارکردندا ئاسمانیان لەبیر نەچێت[5]". بـەڵام دەبێـت ئامـاژەش بـەوە بـدەین کـە، لـە هەمانکاتـدا، گوزارشـتە ئاینیـەکان، دوێـنێ و ئەمڕۆ و سبەینێش، دەکرێت ببن بە مەشخەڵی ئازادی گەلانی چەوساوە[6].

کـردە سۆسـیۆ-پۆلیتیکـەکانی ئاینێـك لـە ئاینـەکان، کریستیانیسـم/ ئیسـلام/ جودایسـم، مـــۆر نـــەکراون و دوا بڕیـــاری کۆتـــایی نـــین و ترادیسیۆنە ئاینیەکان دەکرێت بەپێی سەردەمو کۆنتێکســـــتەکان بگـــــۆڕێن. لـــــە ســـــەردەم و کۆنتێکستێکدا دەکرێت شەرعیەت بە دەسەڵات بـدەن و لـە سـەردەم و کۆنتێکسـتێکی دیکـەدا دەکرێـت چـەکی دەسـتی چەوسـاوەکان بـن، هەروەك چۆن دەکرێت لەیەککاتدا هەردووکیان بـــــن. رەخنـــــە سیاســـــیەکانی مـــــارکس "یەکجەمسـەرین – ئـوینیلاتیرال" و لـە ڕەخنـە فەلسـەفیەکانیەوە سەرچاوە دەگرن کە ئاین بە هۆکـاری هـەموو نـامۆ بوونـەکانی مـرۆڤ دەزانـن. گـرفتی رەخنـەی مـارکس لـە ئـاین لەوەدایـە کـە کۆنتێکسـتێکی تایبـەت بەسـەر هـەموو مێـژوودا دەگشتێنێت. بێگومان ئەمە کارێکی مەحاڵە.

بـــە دیـــوێکی دیکـــەدا دەتـــوانین بڵـــێین، لـــە بەرامبـەر شۆڕشـی پیشەسـازی و دروسـتبوونی چـینی کرێکارانـدا، کەنیسـەکان زیـاتر بـەلای کۆنــــــەپارێزە سۆســــــیۆ-پۆلیتیکەکانــــــدا دایانشـکاندووە کـەمتر پشـتیوانی بەرژەوەنـدی کرێکاران بوون.

لـە هەلومـەرجێکی ئـاوادا بزووتنەوەیـەکی سۆسیالیســـمی ئـــەنتی ئـــاینی باوەشـــی بـــۆ کرێکـاران و بەرژەوەندیـەکانیان کـردەوە. بـەڵام دەبێت لەبیرمان نەچێت کە کەنیسەی کاتۆلیکی، وەك ئیمیل پولا بە جوانی بۆی باسکردین[7]، لە یەککاتـــدا هەڵوێســـتی نارەزاییانـــەی خـــۆی دەردەبڕێـــت بەرامبـــەر بـــۆرژوازی لیـــبراڵ و سۆسیالیسم. وەك چـۆن بـە تونـدی رەخنـە لـە کەپیتالیســـم دەگرێـــت ئـــاواش رەخنـــە لـــە سۆسیالیسم دەگرێت. بڵاوکراوەی پاپا پـی *IX* "*Quanta cura et le Syllabus*" ساڵی 1864 بە تونـدی و لـە یـەك کاتـدا ئیدانـەی ناداپـەروەری لیبرالیسمی ئابوری و کۆمۆنیسم و سۆسیالیسم دەکات. ساڵی 1843 نزیکەی پەنجا ساڵ پێش بڵاوکـراوە بابـەوی کۆمەڵایـەتی سـاڵی 1891 پیـاوێکی ئاینی بـەناوی مـاگر ئـەفر لـە پـاریس هەســـــتا بـــــە "دادگـــــاییکردنی سیســـــتەمی کەپیتالیســـمی پیشەســـازی و ئـــازادی ئـــابوری بێســــــنووری ئــــــەخلاقی و دەرەنجامــــــە مەترســـیدارەکانی، ئـــەو دەیگـــووت: موچـــەی کرێکـاران کەمکراوەتـەوە، کرێکـاران کـراون بـە کۆیلـــەی نـــوێ، ئـــابوری زانســـتی چـــۆنیەتی

کڵۆڵکردنی کرێکاران بە حاسیبە دەپێوێت و دەیانچەوسێنێتەوە[8]".

بەبێ ئەوەی بمانەوێت ئاستی بەرپرسیاری هەریەکێك لەم دوولایەنە لە ئاڵۆزکردنی پەیوەندیەکانیاندا کەم بکەینەوە (مەبەست کەنیسە و جیهانی کرێکارانی سەدەی نۆزدە و بیستە)، دەتوانین بڵێین ئیلحادی مارکسی بەشدارییەکی زیندوی لە دروستکردنی ئەم پەیوەندییە ئاڵۆزەدا کردووە و وەك چۆن کۆنەپارێزی سۆسیۆپۆلیتیکی کەنیسەی بەهێزکردوە ئاواش رەخنە سیاسی و فەلسەفیە دژە ئاینیەکانی بەرەی کرێکارانیان لە دژی ئاین مۆبیلیزەکردووە تا ئەو رادەیەی کرێکاران ئاین بە چەکی دەستی بۆرژواو سەرمایەداران بزانن.

لەگەڵ هەموو ئەم چوارچێوە فەلسەفی و سیاسییەی رەخنەکانیدا، زانستە کۆمەڵایەتییەکان دەتوانن لە خوێندنەوەی مارکسیانەی ئایندا چەند رەگەزێکی گرنگ بدۆزنەوە کە دەکرێت گفتوگۆیان لەسەر بکرێت. ئەو رەگەزانە لەسەر سێ ئاستی گرنگ دەردەکەون:

1- بەشداری لە سۆسیۆلۆژیای ئایدۆلۆژیەکاندا.

2- راڤەکردنی ماکرۆ-سۆسیۆلۆژی.

3- بەشداری لە سۆسیۆلۆژیای چینە کۆمەڵایەتیەکان دا.

سۆسیۆلۆژیای مارکسیست لەم سێ ئاستەدا کاری گرنگی ئەنجامداوەو سۆسیۆلۆژیای تەواو دەوڵەمەند کردووە. لە لاپەرەکانی داهاتوودا هەر یەکێك لەو سێ ئاستە بەوردی دەخوێنینەوە.

**4- راڤەکردنی ئاین وەك بەشداری لە سۆسیۆلۆژیای ئایدۆلۆژیەکاندا**

لە کارەکانی مارکس و ئینگلسدا ئایدۆلۆژیا چەمکێکی ئاڵۆز و فرە مانایە و لەسەر هەر ئاستێك، سیاسی و فەلسەفی و مێژوویی، بەشێوەیەکی جیاواز دەردەکەوێت.

لەسەر ئاستی سیاسی ئایدۆلۆژیا وەك سیستەمی نوێنەرایەتیکردن لە خزمەتی دەسەڵاتدا خۆیمان پیشاندەدات. لەم پانتاییەدا ئایدۆلۆژیا لە رێگای شەرعیەتدان بە دەسەڵاتەوە خۆی پێناسە دەکات و دەبێت بە کۆی نوێنەرایەتیکردنێك کە تا سەر ئێسقانی لکاوە بە رەهەندی هەیمەنەوە.

لەسەر ئاستی فەلسەفە ئایدۆلۆژیا خۆی وەك سیستەمی نوێنەرایەتیکردنێکی شێواوی واقیع پێشنیار دەکات. لێرەدا پرسیاری وشیاری دێتە پێشەوەو ئایدۆلۆژیاش وەك نوێنەرایەتیکردنێکی هەڵە و ناتەواو شێوێنراوی واقیع پێناسە دەکرێت.

لەسەر ئاستی مێژوویش ئایدۆلۆژیا خۆی وەك سیستەمی نوێنەرایەتیکردنێك کە بەردەوام کار لەسەر وروژاندنی "کردە" دەکات خۆی دەردەخات. لێرەدا پەیامی ئایدۆلۆژیا دەبێت بە مۆبیلیزەکردنی جەماوەر.

مارکسیسم وەك فەلسەفەی رەسمی بزوتنەوەی کۆمۆنیست خۆی لە خۆیدا و زۆر بە روونی ئەم سێ ئاسۆیەی مانای ئایدۆلۆژیا دەخاتە بەردەستمان: کاتێك مارکسیسم دەبێت بە سیستەمی بیرکردنەوەی رەسمی دەوڵەت، ئێمە زۆر بە ئاسانی دەتوانین تێبینی مانای

یەکەم بکەین، واتە مارکسیسم وەك ئایدۆلۆژیای هەیمەنە.

لە قۆناغێکی دیکەدا مارکسیسم بریتی بووە لە ئایدۆلۆژیای شێواوی واقیع و تەنانەت ئەو کاتانەش کە ئایدۆلۆژیای هەیمەنە یان ناڕەزایەتی بووە، نەیتوانیوە واقیع وەك ئەوەی هەیە ببینێت.

لە قۆناغێکی دیکەشدا مارکسیسم بریتی بووە لەو ئایدۆلۆژیایەی کە بە ناوی داهاتوویەکی باشترەوە توانیویەتی هەزاران هەزار مرۆڤ مۆبیلیز بکات و بیانهێنێتە سەر جادەکان تا ئەو رادەیەی ئامادەبن گیانی خۆیان بکەن بە قوربانیی.

لای مارکس چەمکی ئایدۆلۆژیا لەو گفتوگۆیەوە سەرچاوە دەگرێت کە لەگەڵ هیگلدا دەیکات. مارکس هێگلیسمی سیاسی وەك چوارچێوەی ئایدۆلۆژیای ئەڵمانیای مەنگبوو تاوانبار دەکات. ئەو پێیوابوو فەلسەفەی سیاسی هیگل کارکردنێکی بەهێزە بۆ تیۆریزەکردنی دەوڵەتی مەسیحی و کوێ نوێنەرایەتیکردنێك کە هەوڵدەدات پاساو بۆ سیستەمی هەیمەنەدار بهێنێتەوەو شەرعیەت بدات بە چەند وێنەیەکی سیاسی. لێرەوە مارکس رەخنە لە چەمکێکی دیاریکراو دەگرێت کە بریتیە لە: فەلسەفەی هیگل وەك بەرگریکردن لە دەوڵەتی بیرۆکراتی مۆدێرن، لە دەوڵەتی سەرمایەداری شەرعیەت پێدراو لەلایەن کریستیانیسمەوە. ئەو بە توندی هیگل تاوانباردەکات بە:

کارکردن بۆ گۆڕینی مرۆڤ لە "بوون"ەوە بۆ ئەرکی – بوون، بە کارکردن بۆ بەجیهانیکردنی چەمکە مێژووییەکان بە شێوەیەکی ناشەرعی، بە کارکردن بۆ بەخشینی رەهەندی هەمیشەیی بە شتە کاتیەکان. مارکس تیری رەخنە سوتێنەرەکانی ئاراستەی دەوڵەتی مەسیحی "پروس"ی سەردەمی خۆی دەکات:

"لە دەوڵەتێکی ئەڵمانی – مەسیحیدا، دەسەلاّتی ئاین بریتیە لە ئاینی دەسەلاّت[9]"

دەوڵەتێکی ئاینی، بەپێی مارکس، دەوڵەتێکی ناتەواوە، چونکە:

"لە یەککاتدا گوزارشت لە هەڵوێستێکی سیاسی لەسەر ئاین و هەڵوێستێکی ئاینی لەسەر سیاسەت دەکات" (پرسیاری جولەکە، 85)

لەگەڵ ئەم بۆچوونەشدا مارکس پێیوایە:

"رزگارکردنی دەوڵەت لە ئاین یەکسانی نیە بە رزگارکردنی راستەقینەی مرۆڤ لە ئاین"

ئەو پێیوایە بۆ ئەوەی مەسیحیەك، جولەکەیەك، یان هەر ئایندارێکی دیکە، لەسەر ئاستی سیاسی خۆی رزگار بکات لە ئاینەکەی، تاکە رێگایەك بریتیە لە:

"رزگارکردنی دەوڵەت لە جودایسم، لە کریستیانیسم، لە ئاین بەشێوەیەکی گشتی" (پرسیاری جولەکە، 67)

لێرەدا مارکس بە گۆشت و ئێسقانەوە باس لە کردەی لایسیزاسیۆنی (لایسیتیٚ: جیاکردنەوەی دەوڵەت لە ئاین) دەوڵەت دەکات:

"مرۆڤ کاتێك لەسەر ئاستی سیاسی دەتوانێت خۆی لە ئاین رزگار بکات کە لە پانتاییە گشتی و مافە گشتیەکانی دوور بخاتەوە و بیخاتەوە نێو چوارچێوە شەخسیەکانەوە" (پرسیاری جولەکە، 79)

بەڵام کردەی "لایسیزاسیۆن"ی دەوڵەت، کە سیفەتێکی دەوڵەتی دێمۆکراتە، بەس نیە بۆ رزگاربوونی مرۆڤ، چونکە، لە سێبەری لایسیتێدا ئاین وەك دیاردەیەکی فەردی دەمێنێتەوەو دەکرێت ببێت بە ماکینەی ژیانی تاکەکان و لەناوەوە بیاندرپێنێت. هەر لەم مەیدانەدا، مارکس زیاتر دەڕوات تا دەگاتە رەخنەگرتن لە دەوڵەتێك کە دێت و چەمکی هاوڵاتی لە مرۆڤی راستەقینە دادەبڕێت و پێناسە و ماف و ئەرکی دیکەی دەخاتە سەر شان و پێیوایە ئەم هەڵوێستە وەك هەڵوێستی:

"ئاسمان بەرامبەر زەوی و هەڵوێستێکی زیاتر رۆحانیە نەك واقیعی" (پرسیاری جولەکە، 75).

بە دیوێکی دیکەدا مارکس دەیەوێت پێمانبڵێت دەوڵەت پانتایی بەرهەمهێنانەوەیەکی سکۆلاری ئاینە:

"ئاین بریتیە لە لەدایکبوونەوەی مرۆڤ لە لایەن هێزێکی لنگاوقوچەوە، لە لایەن "وەسیت"ێکەوە. وەك ئەولایەنە، دەوڵەتیش "وەسیت"ە لە نێوان مرۆڤ و ئازادی مرۆڤدا. هەروەك چۆن مەسیح "وەسیتە و مرۆڤ کۆی سروشتە غەیبانیەکەی پێدەسپێرێت و خۆی دەدات بە دەست هەموو ئەو سنورانەوە کە ئاین بۆی دیاری دەکات، ئاواش دەوڵەت "وەسیت"ەو مرۆڤ کۆی سروشتە ناغەیبیەکەی و کۆی ئازادیە مرۆییەکانی پێدەسپێرێت" (پرسیاری جولەکە، 70-71)

پارادۆکس لەوەدایە کە مارکس دێت و هەر لێرەدا شەرەفێکی گەورە بە کریستیانیسم دەبەخشێت بەوەی کە دەیکات بە رەگەزی سەرەکی دیمۆکراسی:

"دیمۆکراسی سیاسی دیمۆکراسیەکی مەسیحیە، چونکە مرۆڤ، هەموو مرۆڤێك، لەو دیمۆکراسیەدا وەك کەسی سەروەر و بالاّ تەماشا دەکرێت، بەلأم لە هەمانکاتدا، ئەم مرۆڤە کەسێکی نەخوێنەوار و ناکۆمەلأیەتی و (...) نامۆیە. بە کورتی ئەم مرۆڤە هێشتا نەبووە بە کەسێکی زیندووی کارا" (پرسیاری جوولەکە، 93).

ئەم رەخنەیەی مارکس لە دیمۆکراسی بۆرژوا، کارابیەکی بەهێز دادەنێت بەسەر پرۆژەی رزگارکردنی مرۆڤ لە زەبرە دەوڵەتیەکان. گرنگی تێبینیەکانی مارکس لەوەدایە کە بە تەنها لەسەر پرسیاری لایسیزاسیۆن راناوەستێت و راڤەکردنەکانی رادەکێشێتە نێو مەیدانێکی فراوانترەوە کە پەیوەندی نێوان سیاسەت و ئاینە، پەیوەندیەك کە زۆر لەوە ئالۆزترە کە ئێمە بیری لێدەکەینەوە. بە تایبەتی گفتوگۆ لەسەر ئەوەی ناوی دەنێین تیۆلۆژیکۆ - سیاسی، لەسەر ئاینی مەدەنی، لەسەر گەردونی سیاسی و هاوڵاتیبوون. هەموو ئەمانە زۆر لەوە قوڵتر و ئالۆزترن کە ئێمە بیریان لێدەکەینەوە.

لە کتێبی "ئایدۆلۆژیای ئەڵمانی"دا (1845-1846)، مارکس و ئینگلس ئایدۆلۆژیا وەك نوێنەرایەتیکردنێکی لنگاوقووچی واقیع دەناسێنن و ئەوان بە ناوی مۆدی بەرهەمهێنانەوە رەخنەکانیان ئاراستەی گەردونەکانی نوێنەرایەتیکردن دەکەن و پێیانوایە: بناغەی سەرەکی ژیانی کۆمەلأیەتی

لە نێو وشیاری و بیروبۆچوونەکاندا ونکراوە. لێـــرەوە راڤـــەکردنی واقیعـــی ســـوپەر – ســـتراکتۆرەکان دەبێـــت بـــە لادانـــی پـــەردە لەسەریان و "کەشفکردن" و "فەزحکردن" یان:

بەرهەمهێنانی بۆچوون و نوێنەرایەتیکردن و وشـــیاری بـــە شـــێوەیەکی راســـتەوخۆ و پـــێش هـــەموو شـــتێك لکـــاوە بـــە چـــالاکی و بازرگـــانی مـــاددی مرۆڤەکانـــەوەو زمـــانی ژیانی واقیعیە.

نوێنەرایەتیکردنـــەکان، فیکـــر، بازرگـــانی کولتـوری مرۆڤـەکان هەمیشـە وەك هـەڵقوڵاّن لـە رەفتارە ماددیەکانیانەوە دەردەکەوێت. هەروەها بەرهـــەمهێنانی رۆشـــنبیری وەك ئـــەوەی کـــە دەردەکـەوێت لـە زمـانی سیاسـەت و یاسـا و مـۆراڵ و ئـاین و میتافیزیـك و گـەل و هتـد دا هـــەڵقولاّوی رەفتـــارە ماددیەکانـــە. مرۆڤـــەکان خۆیـــان بەرهەمهێنـــەری نوێنەرایـــەتیکردن و بۆچوونەکانن. گرفتەکە لەوەدایە ئەم مرۆڤانـە لە ژێـر زەبـری هەلومـەرجێکی پەیوەنـدی نێـوان بەرهەمهێنان و بەرهەمهێنەرو کارو خاوەن کاردا لەقاڵبـدراون. وشـیاریش هـیچ نیـە جگـە لـە وشـیاری بـوون نـەبێت. دەرکـەوتنی مـرۆڤ و پەیوەندیـــەکانی بـــە لنگاوقوچـــی لـــە نێـــو ئایدۆلۆژیایەکـدا پەیوەنـدی راسـتەوخۆی بـەو رەوتە مێژووییەوە هەیە کە تیایدا ژیاوە.

بە پێچەوانەی فەلسـەفەی ئەڵمانیـەوە کە لە ئاسمانـەوە دادەبەزێتـە سـەر زەوی، لێرەدا ئێمـە زەوی بەرزدەکەینەوە بەرەو ئاسمان. واتە لێرەدا ئێمـە ئـیتر لـە رێگـای گوتـار و خەیاڵـدان و چۆنیەتی بینین و قسـە و چۆنیەتی وێناکردنی ئەویتری فیکری مرۆڤەوە هەوڵنادەین لە مرۆڤ تێبگەین، بەڵکو لە رێگای چالاکیە واقیعیەکانی مرۆڤـــەوە هەوڵـــدەدەین لـــە خـــودی مـــرۆڤ تێبگەین.(...)

لێـرەوە، هـەموو شـتەکان، مـۆراڵ، ئـاین، مێتافیزیـك، ئایـدۆلۆژیا، وشـیاری لـە نێـو پرۆسەیەکی مێژوویدا گەشەدەکەن. ئەم شتانە خۆیـان لـە خۆیانـدا مێـژوویان نییـە و گەشـە ناکـەن، بـەڵکو مرۆڤـەکان لـە رێگـای کـردەی بەرهـەمهێنانی شـتە ماددیـەکان و پەیوەندیـە ناوەکیەکانیانـەوە مێـژوویان بـۆ دروستدەکەن و وەریاندەگێڕنـە سـەر چوارچـێوە واقیعـی و فیکریەکانی دیکە.

واتـە ئـەوە وشیاری نیە کـە چوارچێوەکانی ژیـان دیـاری دەکـات، بـەڵکو ئـەوە ژیانـە کـە چوارچـێوەکانی وشـیاری دیـاری دەکـات". (*SR, 73-75*).

سروشتی هەڵچووی ئەم تێکستەی کە دژ بە ترادیسـیۆنی فەلسـەفەی ئـەڵمانی ئیدیالیسـت نوســـراوە، مـــارکس و ئیـــنگلس وەك دوو فەیلەســـووف رەخنـــەی رادیکـــاڵی جیهـــانی بۆچـــوونەکان کـــە هـــەرگیز ئۆتۆنـــۆم نـــین دەردەخات. لێرەدا تێبینی دەکەین کە ئەم دوو زانایە بە هەموو شێوەیەك نەفی ئەوە دەکەن کە ئاین مێژوویەکی تایبەت و سەربەخۆی هەبێت و پێیانوایە هەموو گۆڕانکاری و گەشەکردنەکانی ئـــاین لکـــاوە بـــە گـــۆڕان و گەشـــەکردنی تیکنیکۆ- ئابوریەوە.

هـەر لێـرەوەو لـە چوارچـێوەکانی تیـۆری رەنگدانـەوەوە، ئـەوان پێیانوایـە کـە کـۆی نوێنەرایەتیکردنـــــەکان و چـــــەمکەکانی مـرۆڤ سـەبارەت بـە ژیـان هـیچ نیـە تـەنها

ڕەنگدانەوەی هەلومەرجی ژیانی کۆمەڵایەتی – ئابوری نەبێت.

لە تێکستە مێژووییەکانیاندا، مارکس و ئینگلس "موقارەبەیەکی" دیالیکتیکی توندتر لەسەر دیاردە ئایدۆلۆژیەکان بە گشتی و ئاین بە تایبەتی پێشنیار دەکەن. لە توێژینەوەیەکدا ساڵی 1852 لەسەر "18"هەمین برومێری لوی پۆناپارت (کۆدێتاکەی پۆناپارت و دەستگرتن بەسەر دەسەڵاتدا)، مارکس دەڵێت:

"چۆن نەتەوەیەکی 36 ملیۆن کەسی لەبەرامبەر سێ ئەسپسواری بازاڕیدا" بەبێ بەرەنگاری خۆیان دا بەدەستەوە(10). لێرەدا داننراوە بە کارایی ڕەگەزی تراديسیۆندا کەلای مارکس بەشێکە لە ململانێی چینەکان:

"تراديسیۆنی نەوە مردووەکان کارایی بەهێز دادەنێت بەسەر مێشکی زیندووەکانەوە" (مارکس سەرەتای برومێر 18)

تراديسیۆن هێزێکی گەورەیەو بە پێچەوانەی پێشکەوتنەوە کاردەکات، لای ئینگلس *la vis inertiae de lhistoire*. تراديسیۆن بەرپرسیارە لە گەشەکردنی بۆچوونەکان لەسەر گۆڕان و هەندێك جاریش دەبێت بە هۆی دواخستنی گەشەکردنی ئابوری. ئینگلس، چەند ساڵێك دواتر لە نامەیەکیدا بۆ جۆزێف بلۆش گوزارشت لە هەمان بۆچوون دەکات:

ئێمە بە دەستی خۆمان مێژووی خۆمان دروستدەکەین، بەڵام لە هەلومەرجی لەقاڵبدراودا. لە نێو هەموو هۆکارەکاندا، هۆکاری ئابوری دەسەڵاتدارترەو توانای دیاریکردنی چوارچێوەکانی هەیە. بەڵام لە هەمانکاتدا هۆکاری سیاسی و تراديسیۆنیش کە دەلکێت بە دەماغەوە ڕۆڵی گرنگ دەبینن، هەرچەند وەك ئابوری یەکلاییکەرەوە نین" (نامە بۆ جۆزێف بلۆش، 1890، ***SR***، 269).

لێرەوە تێگەیشتنێکی دیالیکتیکی بەهێز لە نێوان ئایدۆلۆژیا و ئانفرا–ستراکتۆر دا دەردەکەوێت، وەك چۆن ئەم پەرەگرافەی هەمان نامە ڕونی دەکاتەوە:

"لە گۆشەنیگای تێگەیشتنی ماترلیالیستانەی مێژوودا، ئەو ڕەگەزەی کە زیاتر لە هەموو ڕەگەزەکانی دیکە، ڕەورەوەی مێژوو دیاریدەکات بەرهەمهێنان "***Production***" و بەرهەمهێنانەوە "***Reproduction***"ی ژیانی واقیعیە. نە من و نە مارکس بەپێچەوانەی ئەمەوە قسەمان نەکردووە. بەڵام گەر دواتر کەسێك بێت و بیەوێت شتێکی دیکە لەم ڕستەیە باربکات و بڵێت بە تەنها فاکتەری ئابوری ڕەورەوەی مێژوو دیاری دەکات، کارێکی هەڵە دەکات و گوتارەکەی ئێمە لە ماناکانی بەتاڵدەکاتەوە.

ڕاستە هۆکاری ئابوری بناغەیە، بەڵام چەندین ڕەگەزی سوپەر – ستراکتۆر بەشداریدەکەن لە دیاریکردنی ئاسۆکانی ململانێ مێژووییەکانداو لە هەندێك دۆخیشدا دەکرێت دوا بڕیاریان لە دەستدا بێت. ئەو ڕەگەزانەش دەکرێت هەموو ئەمانەبن:

- فۆرمە سیاسیەکانی ململانێی چینەکان و دەرەنجامەکانیان.
- دەستوری دانراو لەلایەن چینی براوەوە.
- فۆرمە یاساییەکان.
- وێناکردنی ململانێی واقیعی لەلایەن ئەکتەرە بەشدارەکانەوە.

- تیۆریـــــە سیاســـــی و یاســــــایی و فەلسەفیەکان.
- تێگەیشــتنە ئاینیــەکان و گەشــەکردنیان وەك سیستەمی دۆگمەکان.
- لەبەرامبەر ئەم رەگەزانەدا چەندین کردەو پەرچەکردە ئامادەیەو بزوتنـەوەی ئـابوریش وەك "زەرورەتێـــك" هەمیشــــە رێگایـــەك دەدۆزێتــەوە بــۆ ئــەوەی فــەرزیبکات بەســەر جەماوەردا" (*SR, 268-269*).

## پەراوێزەکان:

1–ئـەو ئیقتیباسـەی سـەرەوە وەرگـیراوە لـە کتـێبی "لەســەر ئـاین"ی کـارل مـارکس و فردریـك ئیـنگلس. تێکستەکانی ئەم کتێبە لەلایەن بادیا و بانژو بۆتیژیل وە هەڵبـژێردراون و وەرگێراونەتـە سـەر زمـانی فەرەنسـی و سـاڵی 1968 لــە پـاریس و لــە دووتـوێی کتێبێکـدا بلاوکراونەتـەوە. ئێمـە بـۆ ئامـاژەکردن بـەم سەرچاوەیە هــەردوو پــیتی *SR* لەگــەڵ ژمــارەی لاپەڕەکــەدا تۆمــار دەکەین.

2–فردریـك ڤاندەنبـەرگ، رەخنـە لـە سۆسـیۆلۆژیای ئەڵمانی، نامۆبوون و بەشتبوون، بەرگی یەکەم: مارکس، زیمۆل، ڤێبەر، لوکاش، چاپخانەی دێکوڤێرت، پـاریس، 1997، لا 69.

3–زیـاتر لـە دوو سـاڵە هەوڵـدەدەم ئـەم گوزارشـتە فەرەنسـیە وەربگێڕمـە سـەر زمـانی کـوردی، بـەڵام تـا ئێسـتاش پێموانیـە تـوانیبێتم. لـە زمـانی فەرەنسـیدا گوزارشتەکە بەم شێوەیەیە: *Rendre compte*. دەکرێت بە کــوردی بڵــێین: حســابکردن، لەقەڵەمــدان. گوزارشــتە فەرەنسـیەکە لــە زانسـتە کۆمەڵایەتیەکانـدا بـۆ ئـەوە بەکاردێت کە توێژەر حسابیکات بۆ هەموو ئەو گوتار و رەفتارانــەی کــە ئەکتــەرێکی کۆمەڵایــەتی بەرهــەمی دەهێنێــت. واتــە توێــژەر نابێــت پێیوابێــت ئەکتــەری کۆمەڵایــەتی "توێژینـــەوە لەســـەرکراو" ئەحمـــەق و ناوشـیارە و هـیچ شـارەزاییەکی نیـە لەسـەر گوتـارو رەفتارەکانی. بە پێچەوانەوە، توێژەر دەبێت حسابیکات بۆ کۆی گوتار و رەفتارەکانی "توێژینەوە لەسەر کراو". ئومێد دەکەم خوێنەرم لە بەهێزی گوزارشتە فەرەنسیەکە نزیککردبێتەوە.

4–شــارل ڤاکنهــایم، ئیفلاســی ئــاین دوای کــارل مارکس، پاریس، 1963، لا 193.

5–ژان بروهـات، دژە– کەهەنوتیسـم و بزووتنـەوەی کرێکـاری لـە فەرەنسـای پـێش 1914دا، وەرگـیراوە لـە کتێبی "کریستیانیسم و جیهانی کرێکاری" کە لەلایـەن فرونسوا بێداریدا و ژان مێترۆنـەوە سەرپەرشتی کراوە، بەرگی یەکەم، پاریس، 1975، لا 106–109.

6–ڤیکتۆریـۆ لانتــەرناریۆ، بزووتنــەوە ئاینیــەکانی ئازادی و رزگاری گەلانی چەوساوە، پاریس، 1960.

7–ئیمیل پـۆلا، کەنیسـەی دژی بۆرژوازی، پـاریس، گەلمان – لیڤی، 1977.

8–پۆل درولیۆ، کاتۆلیسیسم و بزوتنەوەی کرێکاران لــە فەرەنســای ســەدەی نۆزدەهەمــدا، لــە کتــێبی "کریستیانیسم و جیهانی کرێکاری" 1975، پـاریس، لا 41.

9–کـارل مـارکس، دەربـارەی پرسـیاری جولەکـە، بـیلانگ، پـاریس، 1971. دەقەکـەی مـارکس لـە سـاڵی 1844 دا بلاوبووەتەوە.

10–کارل مارکس، سیاسەت 1، چاپخانەی گەلیمار، پاریس، 1994، لا 442.

# دەمارگیری ئایینی

**هاشم ساڵح**

**لە عەرەبییەوە: شوان ئەحمەد**

بیریارە گەورەکان چۆن باس لە کێشەی دەمارگیری ئایینی دەکەن؟ چۆن چۆنی تێیدەگەن؟ ئەم کتێبەی ئێستا لەبەردەستماندایە و بەناوی: (هەڵنەکردن و دەمارگیری)* ییەوەیە، وەڵامی ئەم پرسیارە دەداتەوە. لە نوسینی ئەم کتێبەدا، لانی کەم چل تا پەنجا توێژەر لەسەرتاسەری جیهاندا بەشداربوون بێگومان. ناتوانین وەڵام و بۆچونی هەر هەموویان باس بکەین، بۆیە لە حاڵەتێکی وەهادا ناچار دەبین بژاریان بکەین و هەندێکیان وەلاوە بنێین. رەنگە بەهێنانەوەی یەك دوو پەرەگراف لە بۆچوونی هەر نوسەرێك و کۆکردنەوەیان پێکەوە، بگەینە دەرەنجامێکی باش دەربارەی ئەو مەسەلەیە.

ئەڵبەتە ناهەقی دەکەین گەر گرنگی بەوەڵامی بیریارێك بدەین و وەڵامی بیریارێکی دیکەش پشت گوێ بخەین، بەڵام چی بکەین ئەمە گوناهی ئێمەی تێدانییە. بۆ ئەوەی شتێك دەربارەی گرنگی بەشداربوانی ئەم کتێبە بڵێین، هێندە بەسە کە ناوی: (ئیمپرتۆ ئیکۆ - فەیلەسوف و رۆماننوسی ئیتاڵی - و پۆل ریکۆر - پیری فەیلەسوفانی هاوچەرخی فەرەنسی و یەکێك لە مەزنە بیریارانی خۆرئاوا - و جاك لۆگۆڤ - مێژوونوسی بەناوبانگی سەدەکانی ناوەڕاست - و رینێیە ریمۆن - یەکێك لە پسپۆرە مەزنەکانی مێژووی ئاینزای کاتۆلیکی لە فەرەنسا و پرسی دەمارگیری ئایینی - و محەمەد تاڵیبی - یەکێك لە گەورە بیریارانی وڵاتی تونس -، لەگەڵ محەمەد ئەرکۆن - کە لە ئێستاداو لە رێی پرۆژە مەزنەکەیەوە شۆڕشێکی ئەپستمۆلۆژی لە کایەی ئیسلامیدا خوڵقاندووە - و .. هتد).

من لێرانەدا بەشێوەیەکی سەرەکی بایەخ بە وەڵامدانەوەکانی ئەم پۆلە بیرمەندە دەدەم: (پۆل ریکۆر، جاك لۆگۆف، رینێیە ریمۆن) لەبەرەی فەرەنسایییەکان، لەگەڵ (محەمەد تاڵیبی و محەمەد ئەرکۆن) لە بەرەی ئیسلامیدا. چونکە بەمجۆرە دەتوانین حاڵی بین لەوەی کە چۆن لە

هـــەردوو ئـــەو بەرەيـــەدا بـــاس لـــە چـــەمكی تـــۆلێرانس و دەمـــارگیری دەكرێـــت و لـــەوەش تێبگـەین كـە جیـاوازی نێوانیـان چییە، ئـەویش بەهۆی ئەو جیاوازییە مێژویی و كلتورییەی لە نێوانیاندا هەیە.

لـە باسـێكدا بـە ناونیشـانی: (بیركردنـەوە لـە دەمـارگیری لـە هەلومـەرجی ئێسـتادا)، "پـۆل ریكـۆر" دەڵێـت: (دەمـارگیری گوزارشـت لـە خواستێكی خۆڕسك و سروشتی دەكات كە لە هەموو مرۆڤەكاندا هەیە. هـەموو كەسـێك یـاخود هـەموو دەسـتەو تاقمێـك، حـەز بـەوە دەكـات بۆچوون و بیرو بـاوەڕی خـۆی بەسـەر كەسـانی تـــردا بســـەپێنێت، كاتێـــك بـــەم كـــارەش هەڵدەستێت، ئەگەر هێـز و دەسـەڵاتی پێویسـتی هـەبوو. كەواتــە دەمـارگیری بـە پلـەی یەكـەم بریتییـە لـە سـڕینەوەو بـە سـوك تەماشـاكردنی بۆچـون و بیروبـاوەڕی كەسـانی دی، هـەروەها بەڕویەكی دیدا بریتیە لەوەی بەزەبری هێز ڕێگە لـەوانی دی بگرێـت تـەعبیر لـە ڕاوبۆچـوونی خۆیـان بكـەن و بـە ئاشـكرا بیرو بـاوەڕی خۆیـان ڕابگەیـەنن.. هاوكـات دەتـوانین بڵـێین تێكـڕای ئـــایین و ئاینزاكـــان دەمارگیرییـــان هـــەبووە و كاریـــان پێكـــردووە، بـــە تایبـــەت لـــە مـــاوەی سەدەكانی ناوەڕاستداو تەنانەت تا ئێستاش لە چەندین شوێندا هەرماوە). لێرەدا "پۆل ڕیكۆر" لە نێوان دوو قۆناغی سەرەكی مێژووی فیكردا جیـاوازی دەكـات: قۆنـاغی بـەر لـە مۆدێرنـەو قۆنـاغی پـاش مۆدێرنـە. لـە قۆنـاغی یەكەمـدا دەمارگیری شتێكی ئاسایی و سروشتی بوو و مایەی هیچ سەرسوڕمانێك نەبوو، ئـەوەی سـەیر بـــوو لـــەو قۆناغـــەدا هـــەڵكردن بـــوو لەگـــەڵ بیروبـاوەڕی كەسـانی دیكـەدا. بـۆ نمونـە لـە ئەوروپا ئاینزاكـانی مەسـیحی یـەكتریان تـەكفیر دەكرد و بە تاوانی گومڕایی و ونكردنی ڕاستە ڕێگـــای مەســـیحیەت، لەســـەنگەردا بـــوون بـــۆ یـەكتری. ئەمـەش بوو بـە سـەرەتای مێژوویـەكی درێژی ململانێی خوێناوی لە نێوان كاتۆلیك و پرۆتستانتەكاندا.. ئەم دۆخە وەختێك كۆتـایی هـات كـە ڕۆشـنگەری لـە بـەریتانیا و هۆڵەنـداو دواتـریش لـە سەرەتاسـەری ئـەوروپادا دەسـتی پێكـرد. بـەمجۆرە بـۆ یەكـەمین جـار لـە مێـژووی خۆرئـاواو لـە مێـژووی فیكـری مرۆڤایەتیـدا بـە گشتی، چەمكی حەقیقەت دوچاری قـەیران بـوو. بـەڵام ئـاخۆ مەبەسـت لـەوە چـییە كـە دەڵـێن حەقیقەت دوچاری قەیران بووە؟

مەبەسـت لێـی ئەوەیـە تـا ئـەو كاتـە مرۆڤـی كـاتۆلیكی پێیوابـوو حەقیقـەتی ڕەهـای ئـایینی مەسـیحی و ئـایین بـە گشـتی لای ئـەوەو كـۆی ئایین و ئاینزاكانی دیكەش پوچ و بـەتاڵن، بـەڵام كێشەكە لەوەدایە كە پرۆتستانت مەزهـەبێكیش هەمان شتی بۆ خۆی بە ڕاست دەزانی و هـەمان قەناعەتی هەبوو. لەبەرئەوە شەڕ و پێكدادانێكی بێئامـان لـە نێوانیانـدا ڕویـدا. بـەڵام لەگـەڵ دەسپێكی چـاخی ڕۆشـنگەریدا، هـەر لایەنـە و كەوتـە پرسیاركردن لـە خـۆی: چـۆنە گـەر ئـەوی دی بەشـێك لـە حەقیقـەتی لەلا بێـت؟ بۆچـی هـەر دەبێـت تـەنها ئـاینزا و بیروبـاوەڕی خـۆم ڕاسـت بێـت؟ بـەمجۆرە گومـان لـە نـاخی ڕۆشـنگەرانی هەردوو ئاینزاكەدا دروست بوو، كە بووە مایـەی كەمبونـــەوەی دوژمنایـــەتی و شـــەڕانگێزی لـــە نێـوان كاتۆلیـك و پرۆتسـتانتەكاندا و هـەروەها بووە مایەی لێك نزیك بوونەوەو دەستپێكردنی دیـــالۆگكردن لەگـــەڵ یەكـــدا. لـــەم قۆناغـــەدا گەیشـتنە ئـەوەی كـە بێمانایـە لەگـەڵ یـەكتردا

بەشەڕ بێن و لەسەر شوناس و بەهۆی جیاوازی مەزهەبییەوە یەکتری بکوژن، چونکە دەشێت هەموو ئاینێك بە چەندین ڕێگاو بە چەندین ئاینزا تێی بگەین و پەیڕەوی بکەین.

هەر لە درێژەی وەڵامدانەوەکەیدا "پۆل ریکور" دەڵێت: (لەگەڵ هاتنی ڕۆشنگەریدا، چەمکی پلۆرالیزم هاتە ئاراو خۆی سەپاند، ئەمەش یەکەمجار بوو شتی وا لە مێژووی فیکردا ڕوبدات. بە ڕووە سیاسییەکەیدا پلورالیزم لە ڕێی دەوڵەتی عەلمانی مۆدێرنەوە لە واقیعدا کاری پێکراو ئەمەش وایکرد تەواوی ئایین و ئاینزاکان سروت و ڕێو ڕەسمی خۆیان بەجێ بهێنن، بەڵام بەو مەرجەی کەس بیروباوەڕی تایبەتی خۆی بەزەبری هێز و زۆر بەسەر کەسانی تردا نەسەپێنێ. بەمجۆرە دەوڵەت هەڵوێستی بێلایەنی لەسەرجەم ئایین و ئاینزاکان وەرگرت و بەیەك چاوی سەیری دەکردن.. ئەمە لە کاتێکدا دەوڵەتی فەرەنسی، بەر لە چاخی ڕۆشنگەری و بەرپابوونی شۆڕش لەو وڵاتەدا، لایەنگری تەواوی ئاینزای کاتۆلیکی بوو کە زۆربەی زۆری خەڵکی فەرەنسا پەیڕەوییان لێدەکرد. دەوڵەت لەو سەردەمەدا کەمینەی پرۆتستانتەکانی وەك هاوڵاتی پلە دوو سەیر دەکرد). "پۆل ریکۆر سەرەنجام لە قسەکانیدا دەگاتە ئەوەی بڵێت: (تەنها کۆمەڵگە دیموکراسی و لیبرالی و دەستوریەکانی ئەوروپا توانیان، بەسەر چەمکی دەمارگیریدا زاڵبن و ئازادی ئایینی دەستەبەر بکەن و مرۆڤ سەر پشك بێت لەوەی ئایین و ئاینزای خۆی بگۆڕێت).

لێرەدا پرسیارێك دێتە پێشێ، ئەویش ئەوەیە: (ئایا کۆمەڵگەکانی دیکەش دەتوانن هەمان شت بکەن؟). ئەڵبەتە ئەم پرسیارە بەر لە هەر میللەتێکی دی بەرۆکی کۆمەڵگە ئیسلامیەکان دەگرێتەوە و ڕووبەڕووی ئەوان دەکرێتەوە، بەڵام هاوکات دەکرێت ئەم پرسیارە لە کۆمەڵگە مەسیحیە ئەرسۆدەکسیەکانیش بکرێت لە سربیا و روسیا و یۆناندا، چونکە تا ئێستاش ئەم کۆمەڵگایانە وەکی ئەوروپای خۆرئاوا پرۆسەی ڕۆشنگەرییان دەست پێنەکردووە و دووچاری ئەو ململانێ دیالەکتیکیە نەبوونەتەوە لە نێوان ئەقڵی ئایینی و ئەقڵی فەلسەفیدا. بە واتایەکی دی قەیرانی حەقیقەتی ڕەها تا ئێستا لە جیهانی ئیسلامی و لە جیهانی ئەرسۆدەکسیدا ڕووینەداوە، بەڵام تەواوی شتەکان ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە وا ئێمەش لەو قۆناغە نزیك بووینەتەوە. ئەو هەراو زەنایەی جیهانی ئیسلامی لەمڕۆدا بەخۆیەوە دەبینێت، بەڵگەی ئەوەیە کە زەمین لەرزەی گەورە گەشتوتە بەردەرگاکانمان.

بەڵام "جاك لۆگۆڤ" لە دیدگایەکی مێژووییەوە باس لە مەسەلەی (هەڵنەکردن و دەمارگیری) دەکات، نەك لە دیدگایەکی فەلسەفییەوە، لەبەر ئەوەی بۆ خۆی بەر لە هەر شتێ مێژوونووسە. سەبارەت بە چەمکی هەڵکردن و دەمارگیری دەڵێت: (ئەم چەمکە تەنها لە سەدەی شازدەهەمدا لە خۆرئاوا هاتە ئارا و بۆ یەکەم جاریش لەگەڵ شوێنکەوتوانی ئاینزای پرۆتستانتیدا پەیڕەویان کرد، چونکە ئەمانە لە فەرەنسادا وەك گروهێکی گومڕاو سەر لێشێواو سەیر دەکران.. بڕیارنامەی لێکبوردن لە ساڵی 1562 بڵاوکرایەوەو لە ساڵی 1695داو لە سەردەمی شا هێنری چوارەمدا

جەختی لەسەر کرایەوە، لە پێناو ڕێگرتن لە خوێن ڕشتن و کۆتایهێنان بەو جەنگە ناوخۆییەی بڕستی لەبەر گەلی فەرەنسی بڕیبوو. بەڵام لویسی چواردەهەم لە سەدەی حەڤدەدا کارکردنی بەم بڕیارە ڕاگرت، چونکە لە هەوڵی ئەوەدا بوو پرۆتستانتیەکانی فەرەنسا پاکتاو بکات و ریشەکێشیان بکات. ئەمەش بووە مایەی ئەو کارەساتە جەرگ بڕەی تا ئێستاش فەرەنسیەکان بیریان ناچێتەوە، واتە دوای تێپەڕبوونی سێ سەدە بەسەر ئەو ڕوداوەدا، بەڵام هەر زیندووەو بیر ناچێتەوە، لەبەر ئەوەی برینێکی هێندە قوڵە کەوا بە ئاسانی خۆش نابێتەوە). لەمەوە "جاك لۆگۆڤ" دەگاتە ئەوەی بڵێت: (هەڵوێستی سروشتی و ئاسایی مرۆڤ دەمارگیرییە، نەك لێکبوردن. لێکبوردن شتێکە بە دەستی دێنین و دوای بەخەرجدانی هەوڵێکی زۆر و خوێندن و خۆڕۆشنبیرکردن، فێری دەبین.. شتی سروشتی ئەوەیە کە هاو ئایین و هاو مەزهەب و هاوتیرە و ڕەگەزی خۆم خۆش بوێت، لە بەرامبەریشدا ڕقم لە هەموو ئەوانە بێت کە لە دەرەوەی ئەمانەدان. کەواتە نابێت لاف بەسەر یەکتریدا لێبدەین و بڵێین ئێمە لێکبوردەین، بەڵام ئەوانی دی دەمارگیر و توندڕەون! هەروەها نابێت پەند و ئامۆژگاری ئەخلاقی دەربارەی لێکبوردن ببەخشینەوەو باس لە خەسڵەت و لایەنە باشەکانی بکەین و بڵێین ئیتر تەواو.. چونکە ئامۆژگاریکردن کێشە چارەسەر ناکات، ئەوەی چارەسەری کێشە دەکات ڕاشکاویی فیکری و پێکهێنانی دەوڵەتی مۆدێرن و چەسپاندنی چەمکی یەکسانییە لە نێوان سەرجەم هاوڵاتیاندا. ئەمە لێکبوردنی ڕاستەقینەیە، بەڵام پێویستە پێشوەخت دەست بکرێت بە لەبەریەکهەڵوەشاندنی ئایدیای توندڕەوی و دەمارگیری، بۆ ئەوەی ڕووی ڕاستەقینەی ئاشکرا بێت و ڕەوایەتی خۆی لەدەست بدات. فەیلەسوفانی ئەوروپاش لە قۆناغی ڕۆشنگەریدا ئەم کارەیان کرد).

لەلایەکی ترەوە "ڕینێیە ڕیمۆن" تەئکید لە خاڵێکی سەرەکی دەکاتەوە کە بەلای ئێمەوە گرنگە و باس لەوە دەکات: کە چۆن بۆ یەکەمجار کاتۆلیك مەزهەبەکان بیرۆکەی هەڵکردن و یەکسانیان لەگەڵ پرۆتستانت مەزهەبەکاندا قبوڵکرد؟ لە وەڵامدا دەڵێت: (ئایینە مەزنەکان یەقینی ئەوەیان هەیە کە حەقیقەتی ڕەها لای ئەوانە. لێرەوە ڕێگە بەوە نادات هیچ جیاوازییەك لە بواری بیروباوەڕ و ئاییندا هەبێت. لەبەرچی؟ لەبەرئەوەی قبوڵکردنی جیاوازی بەمانای ئەوە دێت کە دەستبەرداری حەقیقەتی ڕەها بووە. هەر ئەمەش بوو لە ڕابردوودا وای لە کلێسای کاتۆلیکی کردبوو کە چەمکی لێکبوردن و فرەبیر و باوەڕی پێقبوڵ نەکرێت.. چۆن دەبێت منێکی کاتۆلیکی کە لەسەر ڕاستە ڕێگای ئایینی مەسیحیم، خۆم بکەم بە هاوشانی پرۆتستانت مەزهەبێکی گومڕاو سەرلێشێواو؟ پەنا بەخوا! پاشان دوا بەدوای ڕۆشنگەری و شۆڕشی فەرەنسی کاتۆلیکەکان ڕق ئەستورتر بوون، ئەویش وەك پەرچەکردارێك لە بەرامبەر ئەو بزاوتە مێژووییەی دەیەوێت ئەوانی دی بکاتە هاوشانیان و وەك یەکیان لێبکات. لێرەدا پاپا کەوتە دژایەتیکردنی فەلسەفەی لیبرالیزم، واتە کەوتە دژایەتیکردنی فەلسەفەی سەردەمە نوێیەکان و لەم سەروبەندەشدا فتوای

ســەرکۆنەکردنی ئــەو پرۆژەیــەی داو وەکــی ئاقارێکی دژ بە ئایین دایە قەڵەم. کاتۆلیکەکان هــەر بەمەشــەوە نەوەســتان، بــەڵکو کەوتنــە تاوانبــارکردنی ســـەردەمی ڕێنیســـانس و ســـەردەمی ریفـــۆرمی ئـــایینی و شۆڕشـــی فەرەنســی، هاوکــات وێرانبــوون و تێکچــونی بارودۆخی وڵاتـی فەرەنسایان خستە ئەستۆی ئەم گۆڕانکارییانـە. بـەمجۆرە بـاڵی ڕاسـتڕەوی تونـدڕەو پەیـدابوو، بۆ بەگژاچونەوەی کـاروانی مێــژوو یــاخود بــۆ دژایــەتیکردنی بزاوتــی ســـەردەمی مــۆدێرن. بــەڵام لــەناکاوداو دوای بەرخودانێکی توند وتیژ و درێژخایەن، کڵێسای کاتۆلیکی خۆیدا بەدەست لۆژیکی مێژووەوەو ئازادی ئایینی و فرە مەزهەبی پەسەند کرد. ئەم پرۆســەیەش لــە دەوروبــەری نیــوەی دووەمــی سـەدەی بیسـتەمدا رویـدا. بـەمجۆرە کڵێسـای کـاتۆلیکی بۆیەکـەمجار لـە مێـژوودا، دانـی بـە بـونی پرۆتسـتانت مەزهەبەکانـدا نـاو قەناعـەتی بەوەشکرد کە ئەوانیش حەقیقەتی مەسیحیەتی لەگەڵـدا بەشـدەکەن. ئـیتر حەقیقـەتی ڕەهـای ئایینی مەسیحی، پاوان نەبوو بۆ تـەنها دەستەو تاقمێك. لێرەشـەوە قـەیرانی چـەمکی حەقیقـەت دێتـە گـۆڕێ و ئـەم قەیرانـەش لەگـەڵ سـەرەتای ســـەردەمە نوێیەکانـــدا دەســـت پێـــدەکات. قبـــــوڵکردنی پرۆتســـــتانتەکان لەلایــــەن کاتۆلیکەکانەوە، کارێکی هێندە سوك و ئاسان نـەبوو، لـە ڕاستیشـدا بەشێکیان واتـە ڕاسـتڕەوە دەمـارگیر و تونـدڕەوەکانیان، تـا ئێسـتاش ئـەو مەسەلەیەیان پـێ قبـوڵ نییـە و ناچنە ژێر باری ئەو کـارە.. بەڵام بزاوتـی سـەردەمە نوێیـەکان بـە ئاســـتێك بـــوو کـــە ڕێگـــەی ئـــەوەی بـــۆ نەهێشـــتبونەوە، تـــا لەســـــەر هەڵوێســـــتە نـەگۆڕەکانی خۆیـان بمێننـەوە. کاتۆلیکـەکان ناچـار بـوون بگـۆڕێن و گەشـە بـە خۆیـان بـدەن، چـونکە گـەر وایـان نەکردایـە تیـا دەچـوون و کۆتاییـان دەهـات. لەگـەڵ دەسـپێکی مۆدێرنـەدا خەڵکی فەرەنسا بەرەبەرە لێیان دەتەکینـەوەو لـە دەست بیروباوەڕە دۆگما و ئەقڵیەتە پواوەکانیان جاڕس دەبوون. تا کار گەیشتە ئەوەی زۆرینـەی خــەڵکی فەرەنسـا بوونـە لایـەنگری ئـایینێکی نــوێ، ئــەویش ئــایینی ئــەقڵ و مۆدێرنــە و فەلسـەفەی گـەردونی بـوو. ئـاینزای کـاتۆلیکی کاتێك هەستی بەو مەترسیانە کرد، ناچار بوو گەشـە بـە خـۆی بـدات و دەستبەرداری پێگـە و پلـەو پایـەکانی پێشـوی بێـت. ئـەم هەڵوێسـتە تازەیـەش شۆڕشـێکی تیۆلـۆژی لێکەوتـەوە، بـە تایبـــەت دوای بەســـتنی کـــۆڕی بـــەناوبانگی کڵێساکان بە نـاوی کـۆڕی دووەمـی ڤاتیکان لـە نێـــوان ســـاڵانی 1962–1965 دا. بـــەمجۆرە مەســـیحیەتی ئـــەوروپایی ڕێگایـــەکی تـــازەی گرتەبەر کە بتوانێت لەگەڵ سەردەمی مۆدێرنـەی زانســتی و تەکنۆلۆژیــدا هــەڵبکات).. دواجــار "رینێیە ریمۆن" دەگاتە ئەوەی بڵێت: (ئەمڕۆ کە کڵێسای کاتۆلیکی فرە ئایینی و فرە مەزهەبی و فرە بیروباوەڕی قبوڵ دەکات و تەنانـەت دیالۆگ لەگـەڵ بێباوەڕەکانیشـدا دەکـات و ڕێـز لـە بـیرو بۆچونەکانیشیان دەگرێت، ئەگەرچی باوەڕیشـی بـــەو بۆچـــونانە نـــەبێت. بـــە کورتیەکـــەی کاتۆلیکـەکان بـڕوای تـەواویان بـە هـەڵکردن و تـــۆلێرانس هەیـــە و ئـــەم هەڵوێستەشـــیان، هەڵوێســـتێکی تـــاکتیکی نییـــە، بـــەڵکو ڕاستگۆیانەیەو لەوپەڕی قەناعەتیانەوەیە).

هەر لە درێژەی قسەکانیدا "رینێیە ریمۆن" دەڵێت: (بـەڵام دەبێـت چاك بـزانین کـە کڵێسـای

کاتۆلیکی و لەسەر و هەموشیانەوە پاپای ڤاتیکان، دوای بەخەرجدانی ڕەنجێکی زۆر و پاش مشتومڕێکی درێژخایەن و دژوار، گەیشتنە ئەم هەڵوێستە ئەقلانی و پێشکەوتووە. چونکە دواجار لەوە حاڵی بوون کە مەسەلەی ئیمان و ئیمانداری پەیوەندی بەویژدانی تاکەکەس خۆیەوە هەیە و دەبێت مرۆڤ لەم پرۆسەیەدا ئازادبێت و هیچ زەبر و زۆرێك ناچاری نەکات بەو کارە هەستێت. ئیمانداری ئەگەر بەناچاری و زەبر و زۆر بوو چ سودێکی دەبێت؟ گەر هاتوو مرۆڤێکمان ناچار کرد پەیڕەو لەو ئایینە بکات کە ئێمە بڕوامان پێیەتی و بە زۆر ئیمانمان پێهێنا، ئاخۆ بڕوا هێنانێکی لەو جۆرە هیچ مانایەکی دەبێت؟). بەمجۆرە و بۆ یەکەمجار کڵێسای کاتۆلیکی وایلێهات، ڕێزی سەرجەم ئاینزاکانی دیکەی مەسیحیەت بگرێت و تەنانەت بە چاوی ڕێزیشەوە سەیری هەموو ئایینەکانی دیکەی وەك یەهودیەت و ئیسلام و ئەوانی دیکە بکات. لێرەوە بەدواوە دێینە سەر باسی مەسەلەی هەڵنەکردن و دەمارگیری، لە ڕوانگەی دوو بیریاری ئیسلامی وەك "محەمەد تالیبی و محەمەد ئەرکۆن"ەوە. لێرەشدا دەبینین کە چ جیاوازییەك لە نێوان ئێمە و ئەوروپیەکاندا هەیە. ئەوەی ئەوان بەر لە سەدەیەك دوچاری بووبوون، ئێمە لە ئێستادا ڕووبەڕووی دەبینەوە. واتە ئێمە لەسەر لێوارەکانی قەیرانی حەقیقەتی رەهاین، لە کاتێکدا ئەوان چارەسەریانکرد و تێیان پەڕاند.

"محەمەد تالیبی"** لە باسەکەیدا بە ناونیشانی (هەڵکردن و دەمارگیری لە کەلەپوری ئیسلامیدا) دەڵێت: (مرۆڤ بەشێوەیەکی خۆرسك بونەوەرێکی دەمارگیرەو لە ناوەڕۆکدا وەکی ئیبن خەلدون پێمان دەڵێت: ئاژەڵێکی شەڕانگێزە، یان وەکی فەیلەسوفی ئینگلیزی تۆماس هۆبس دەڵێت: مرۆڤ گورگە بۆ برای خۆی. کەواتە ئەو چیرۆکەی باس لە مرۆڤی سەرەتایی چاك و نەرمونیان دەکات و جان جاك رۆسۆش زۆر دڵخوازیەتی، جگە لە ئەفسانەیەك هیچی تر نییە.. بەڵام دواتر و لە ڕێگەی ژیری و ئەقڵەوە مرۆڤ دەگۆڕێت و دەبێتە بونەوەرێکی لێبوردە، چونکە ناچارە لە کۆمەڵگەدا بژی و ڕۆژانەش هەڵسوکەوت لەگەڵ ئەوانی دیدا بکات. کەواتە پێویستە کۆنترۆڵی مەیلە شەڕانگێزیەکانی خۆی بکات، لەبەرئەوەی ناتوانێت هەموو رۆژێك لە شەڕی بەردەوامدا بێت). ئەمە لە رووی ئەنسرۆپۆلۆژییەوە کە تەواوی مرۆڤایەتی دەگرێتەوە، ئیدی موسڵمان بن یان موسڵمان نەبن. هەرچی پەیوەندی بە موسڵمانانەوە هەبێت، "تالیبی" پێیوایە لە ئیسلامی کۆن و هاوچەرخدا دوو ئاقار هەن: ئاقاری زانایانی ئایینی و فەقێکانی دەسەڵات لە ڕابردوودا، لەگەڵ ئاقاری فێندەمێنتالستە توندڕەوەکان لە ئێستادا. هەردوو ئەم ئاقارەش دوژمنی ئازادی فیکرن، کەواتە وەکییەك دەمارگیر و توندڕەون. لەبەرئەوەی لە ڕووی مێژووییەوە توندڕەوەکان لە سەرزەمینی ئیسلامدا سەرکەوتووبوون، ئەمە وایکردووە لە خۆرئاوادا ئەو بۆچونە باڵادەست بێت کە دەڵێت: ئیسلام لە جەوهەردا ئاینێکی دەمارگیرو پەڕگیرە. ئەمەش ڕاست نییە و ئەو ئاقارە پەڕگیرە دژ بە ناوەڕۆکی دەقی قورئانە. چاکترین بەڵگەش بۆ ئەمە ئەو ئایەتەیە کە دەڵێت: لا اكراه في الدين ياخود فمن شاء فليؤمن

و مـن شـاء فليكفـر. بـەمجۆرە دەبيـنين كـە فـرە بيروبـاوەڕی لـە قورئانـدا باسـی هـاتووە و ئـايين ڕێگـەی پێداوە، هـەروەها ڕێگـەی بەوە داوە بڕوا بێـنين يـان نـەهێنين. بـەلاّم دەسـتـەی فـەقێكانی سوڵتانەكان مانای ڕاستەقينەی ئەم ئايەتانەيان شێواند و قورئانيان بە هەڵە لێكدايەوە، بەمەش ئيسـلاميان بـە ئاقـارێكی دۆگماتيسـتيدا بـرد و ئــازادی بيركردنـــەوەيان ســـنوردار كـــرد و دەمارگيری و توندڕەوييان لە بەرامبـەر خـەڵكانی سـەر بـە ئايينـەكانی ديكـەدا تـۆخكردەوە. بـە داخـەوە ئەوەشـی لـە مێـژوودا سـەركەوت ئـەم ئاقـارە بـوو. لەبەرئـەوە هەنوكـە نـاتوانين بـە ئاسانی شـەڕ بكـەين و بەرامبـەری بوەستينەوە، چـونكە ڕەگ و ڕيشـەيەكی قـوڵی لـە مێـژوودا هەيـە. بـەلاّم لـە بەرامبـەر ئەمەشـدا كەلـەپووری ئيسلامی ئاقاری كراوەو تۆلێرانسی تێدابووە، هەرچەندە ئاقارێكی بچوك و كەمينەش بووە).

"محەمـەد تـاڵيبی" قسـەكانی بـەوە كۆتـايی پێـدێنێت كـە بڵێـت: (ئـەو ئاقـارە تونـدڕەوەی ئـــەمڕۆ لـــە جيهـــانی ئيســـلاميدا زاڵـــە و لـــە هەڵكشانداية، دەيەوێت بمانگەڕێنێتەوە بۆ ئەو فێندەمێنتاليزمـە ڕاديكاليـە كۆنـەی، دەمـارگيری و توندوتيـژی لـە مێـژوی ئێمـەدا بەرهـەم هێنـا. واتـــە داوامـــان لێـــدەكات بگەڕێينـــەوە ســـەر بيروباوەڕی فەقێكانی سوڵتانەكان. بەلاّم ئاقاری نوێخواز و ليبرالی لە ئيسلامی هاوچەرخدا، داوا دەكـات بگەڕێينـەوە بـۆ قورئـان كـە لێكبـوردن و پێكـەوە ژيـانی ئاشـتيانەی لـە نێـوان سـەرجەم ئـايين و نەتـەوەو گەلانـدا دامەزرانـد، هـەروەها دانی نا بە پلوراليزمی ئايينی و بيروباوەڕدا. لـە جيهـــانی ئيســـلاميدا گـــەربێتو ئـــەم ئاقـــارە بالاّدەست بێت، ئەوا بە فيعلی فيكری ئيسلامی نوێبوونـەوە بـە خۆيـەوە دەبێنێـت و دەتوانێـت بەشـــداری لـــە چارەســـەركردنی ئـــەو قـــەيرانی بەهايـــەدا بكـــات كـــە شارســـتانيەتی هاوچـــەرخ بەدەستيەوە دەناڵێنێت).

هـەر سـەبارەت بـە ڕەخنـەگرتن لـە ئـەقڵی ئـاينی، "محەمـەد ئـەركۆن"يـش قسـەی خـۆی هەيـە و ئەڵبەتـە زۆر لـەوەش زيـاتر دەڕوات كـە "محەمـەد تـاڵيبی" باسـی دەكـات. بـە بـڕوای "ئـەركۆن" ئـەو هـەنگاوەی "تـاڵيبی" دەينێـت بـــەرەو كرانـــەوەو ئەقلاّنيـــەت، ســـەرەڕای گرنگيشی، بەلاّم بە تەنها هـەر ئـەوە بـەس نييـە. ڕاستە لە قورئاندا ئايەت گەلێك هـەن كەداكۆكی لـــە ئـــازادی بيروبـــاوەڕ دەكـــەن، بـــەلاّم لـــە بەرامبـەريشدا ئايـەت گـەلێكی ديكـەشمان هەيـە كە زمانێكی زبريان هەيە لە دژی خەڵكانی سەر بە ئايينەكانی ديكە، بە تايبەت ئەوانەی خاوەن كتـێبن. تەنانـەت هەنـدێ لـەو ئايەتانـە، ئـەهلی كيتـاب دەخاتـە ڕيـزی ئەوانـەی شـەريك بـۆ خـوا پەيدا دەكـەن و تـەكفيريان دەكـات. بۆيـە دەبێـت خوێندنەوەيـەكی هەلپەرستانە بەسـەر قورئانـدا پراكتيـــزە نەكـــەين، بـــەڵكو خوێندنەوەيـــەكی مێـــژوويی ڕاســـتەقينەی بـــۆ بكـــەين. ئـــەوكات دەگەينـــە ڕەگوڕيشـــەی كێشـــەكە و لـــەوەش تێدەگـەين كـە هـۆی چـی بـووە لەسـەردەمانی كۆندا، ئازادی ئايينی نەبووە. هـەروەها لـەوەش حـــاڵی دەبـــين كـــە بۆچـــی خوێندنـــەوەی دۆگماتيســـتی بەســـەر خوێندنـــەوەی كـــراوەو تولێرانسدا سـەركەوت.. شـايەنی باسـە چەمكی ئازادی ئـايينی شـتێكی تازە وەختە و تـەنها لـە ئـەوروپای دوای سـەردەمی ڕۆشـنگەريدا هاتـە ئـارا. لێـرەدا "محەمـەد ئـەركۆن" بـە هەريـەك لـە "پۆل ڕيكۆر" و "ڕينێيە ڕيمۆن" دەگات. كەواتە

سەپاندنی چەمکی ئازادی ئایینی بەسەر چاخە کۆنەکاندا وەکی ئەوەی "محەمەد تالیبی" دەیکات، بە هەڵەیەکی مێژوویی ئەژمار دەکرێت.

گومانی تێدا نییە کە قورئان زۆر کراوەترو گەردونی تر بووە لەو بیروباوەڕەی دواتر فەقێکان بەناوی ئیسلامەوە فۆرمەلەیانکرد و بوو بە ئایدیۆلۆژیایەك، هاوشانی پەلهاویشتنی ئیمپراتۆریای عەرەبی بوو لە سەردەمی فتوحاتدا یاخود لە قۆناغی دواتردا. بەلاّم هەنوکە خوێندنەوەی مێژوویی خۆی دەسەپێنێت، بۆ ئەوەی بتوانین چارەسەری کێشەی ئایەتە جەنگییەکانی لە قورئاندا پێبکەین و لەگەڵیشیدا چارەسەرێکی ریشەیش بۆ کێشەی دەمارگیری لە کەلەپووری ئیسلامیدا بدۆزینەوە.

لێرەدا "ئەرکۆن" پێیوایە دەبێت تەواوی سیستمە تیۆلۆژییەکانی وەك یەهودیەت و مەسیحیەت و ئیسلام، لێك شیتاڵ بکەین. هەریەك لەم سیستمە تیۆلۆژیانە یەکتری رەتدەکەنەوە و یەکدی تەکفیر دەکەن، ئەمەش بە بەهانەی ئەوەی هەریەکەیان خۆی بە راست دەزانێت و پێیوایە حەقیقەتی رەها لای ئەوە. ئەم قەناعەتە لە ماوەی سەدەکانی ناوەراستدا دروست بوو، پاشان دواتر و بەدرێژای چەندین سەدە لە هوشیاری دەستەجەمعیدا رەگی داکوتا. هەر سیستمێکی تیۆلۆژی لەو سێ سستمە، لاف ئەوە لێدەدات کە حەقیقەتی رەها بۆ خۆی پاوانە و ئەوانی تر ئەو مافەیان نییە. مادامەکیش ئەم بۆچونە بالاّدەستەو ملیۆنەها ئیمانداری تەقلیدیش باوەڕیان پێیەتی، ئەوا نە رزگارمان دەبێت و نە چارەسەری کێشەکەش دەکرێت. جەنگی مەزهەبی لە ژێر ناوی جیهاد و شەڕی پیرۆز و شەڕی خاچ پەرستیدا، تا بێت بەردەوام دەبێت و درێژە دەکێشێت.

وەکی لە سەرەتادا ئاماژەمان پێدا، تەنها مەسیحیەتی ئەوروپایی توانی خۆی لە کۆت و بەندی تیۆلۆژی کۆن قوتار بکات. ئەمەشی بە خواستی خۆی نەکرد، بەڵکو ناچار کرا، ئەویش بە هۆی ئەو هەڵکشانە ئەقلاّنییە زانستی و فەلسەفییەی لە سەدەی شانزەوە لە ئەوروپادا دەستی پێکرد. لەگەڵ ئەوەشدا کڵێسای کاتۆلیکی هەر بەرخوردی کرد و خۆی نەدابەدەست لۆژیکی سەردەمەوە، تەنها لە ساڵی 1962 دا نەبێت! لە دوای ئەم مێژووەوە دەستبەرداری ئەوە بوو کە چەمکی حەقیقەتی رەها بۆ خۆی مۆنۆپۆڵ بکات، ئەمەش بەڵگەی ئەوەیە کە ئەم مەسەلەیە چەند دژوارەو مەترسیەکانیشی لە چ ئاستێکدایە.

## پەراوێزەکان:

* *Paul Ricoeur, M. Arkoun, et al, LIntolerance, .Paris, Grasset, 1988*

**محەمەد تالیبی: مێژونوس و راگری پێشوی کۆلێژی ئادابە لە تونس، هەروەها پسپۆڕی بواری پەیوەندییەکانی نێوان ئەوروپا و جیهانی ئیسلامییە.

## سەرچاوە:

د. هاشم صالح: معضلة الأصولية الاسلامية – دار الطليعة، بيروت – الطبعة الاولى، 2006.

# تۆتالیتاریزم: ئایدیۆلۆجیایەكی لێكدراوو رژێمێكی فرەئەدگار
## نزیككارییەك بۆ تێزی "هانا ئارێنت" دەربارەی بنەماكانی تۆتالیتاریزم

د. شاهۆ سەعید

**سەرنج:**

ئەم نوسینە، لە بنەرەتدا، پێشەكی چاپی كوردی كتێبی "بنەماكانی تۆتالیتاریزم"ە، كە یەكێكە لە كتێبە بایەخدارەكانی خاتو (هانا ئارێنت) لەبواری فیكر و سۆسیۆلۆجیای سیاسیدا، لەلایەن برای وەرگێڕ (كاك حەمە رەشید)ەوە كراوە بە كوردی و بەم نزیكانە دەكەوێتە كتێبخانەكانی كوردستانەوە.

ئایا دەكرێ بەئاسانی تۆتالیتاریزم بناسین و لە چەند هێڵێكی گشتیدا سیما سەرەكیەكانی بزاوت و رژێمی خاوەن دەسەڵاتی تۆتالیتار پێناسە بكەین؟ ئایا دەتوانین ئەو رژێمە وەك دامەزراوەیەكی سادە نیشان بدەین كە بەپێی تاقە ئایدیۆلۆجیایەك و لەپێناو جێبەجێكردنی ئامانجێكی ستراتیجیی دوور خایەندا رەوایەتی (بوون و مانەوە) بەخۆی دەبەخشێ..؟ لە كتێبی "بنەماكانی تۆتالیتاریزم"دا كێشەی سەرەكی هانا ئارێنت لەگەڵ سادەكردنەوەیەكی لەمجۆرەدایە، كە بەشێوەیەك لە شێوەكان دەچێتەوە خزمەتی خودی تۆتالیتاریزم.

ناكرێ رژێمی تۆتالیتار بەسادەیی پێناسەبكرێ و هەروا بخرێتە نێو ئەو پۆلێنكردنە تەقلیدییەی فیكری سیاسییەوە كە رژێمەكان دابەشدەكا بەسەر: ستەمگەر، ئۆتۆكرات، دیكتاتۆری، دیموكراتی و پارلەمانی و.. هتد، چونكە رژێمی تۆتالیتار رژێمێكی ئاڵۆزو فرەئەدگارە، پشتئەستورە بە بەرهەمەكانی زانستی مۆدێرن، هونەری بیرۆكراتیەتی كارگێڕی، بەگەڕخستنی هۆكانی راگەیاندن، ورووژاندنی سۆزی میللی، ئاراستەكردنی ئامرازەكانی بانگەشەی ئایدیۆلۆجی و بەئەفسانەكردنی كێشە

سیاسـییەکان..، هـەروەك چـۆن بـەوردی كـار لەســــەر پــــاوانكردنی بــــواری ئــــابوریو پـەروەردەیی و ڕۆحیـەتی مێـژوویی و لـۆجیكی زانستیو فەلسەفیش دەكا.

تۆتالیتاریزم تەنها ماشێنێكی سەربازی نیە كـە لـە هـەوڵی یـەكڕەنكردنی هـەموو كەرتـە میللی و كۆمەڵایـەتی و دەوڵەتیەكاندا بێ، بەڵكو هەمیشە جێگۆڕكێ بە كەرتەكان دەكاو ڕێگەنادا غروری دەسەڵات، تەنانەت غروری ملكەچ بوون بـۆ دەسـەڵات لـە نـاخی هـیچ كەسـێكدا چەكەرە بكا. ڕژێمێكە تـەنها لەگەڵ دوژمنەكانیدا دڵڕەق نیـە، بـەڵكو لەگـەڵ پێڕەوانـی خۆشـیدا دڵـڕەقو تونـدڕفتارەو ڕۆحیـەتی هەسـتكردن بـەگوناهو تـاوان لەناخیانـدا دەچـێنێ. بـۆ نمونـە لـەنێوان دەزگـای سـوپاو پۆلیسـی نهێنیـدا هەمیشـە جێگۆڕكـێ بـە كارەكانیـان دەكـا، بەئەندازەیـەك ئەنـدامانی ڕەعیـەت نـازانن داخـۆ دەبـێ ببنـە ئەنـدامی گوێڕایـەڵی سـوپایەكی دیسـپلینكار، یـان ببنـە ئەندامی دەزگـای پۆلیسـی نهێنـی كـە پێویسـتە لــە یـەك كاتـدا چـاودێری بكـەنو چاودێریش بكرێن. واتـە لایـان ڕوون نیـە داخـۆ لـــەژێر فـــەرمانی فەرماندەیـــەكی ســـەربازیی بەرجەسـتەدان، یـان ملكەچـی دەسـەڵاتێكی نـەبینراون، كـە دەشـێ چـاوو گـوێی نهێنـی لـە هـەموو شـوێنێك هـەبێ و بچێتە ڕۆحـی هـاوڕێو كەســـە نزیــكو هاونهێنیەكانیشــەوە. لەســـەر ئاســـــتی پەیوەندیـــــەكانیش بـــــەدەرەوە، دڵنیـا نـین لـەوەی داخـۆ سـتراتیجی حـوكمی تۆتالیتـاری بـەچ ئاراسـتەیەكدا جووڵـەدەكا: بەئاراسـتەی زەبتـوڕەبتی نـاوەكی و داخسـتنی سـنورەكان لەگـەڵ دەرەوەدا، یـان بەئاراسـتەی فراوانكردنـــی دەســـەڵاتو پەلهاویشـــتن بـــۆ دنیای دەرەوە؟!

هانـا ئارانێـت پێیوایـە مێـژوی سیاسـی چەندین جۆر سیستێمی داپڵۆسێنەری بەخۆوە بینیوە، بەڵام هیچیان لە سیستێمی تۆتالیتاری نەچوون. چونكە هەرچەندە ڕژێمە دیكتاتۆرو ئیسـتبدادیەكان توندوتیـژیی زۆر ترسـناكیان پێڕەوكـــردووە لـــەپێناو مانـــەوەو پاراســـتنی ئاسایشـــی دەســـەڵاتداراندا، بـــەڵام ڕژێمـــی تۆتالیتـار توندوتیـژی پێڕەودەكـا وەك ئـامرازو ئامانجو ستراتیجی دوورخایەنیش، توندوتیژی دەكاتـــە یاســـایەكی حـــەتمی كـــە پاســـاوو حەتمیەتی زانستیو مێژویی پێدەبەخشێ. واتە تـەنها پـەنا نابـا بـۆ توندوتیـژی فیزیكـی، بـەڵكو پـــەنادەبا بـــۆ پاســـاوی ڕەمـــزیو ئەقڵیـــەتی زانسـتگەریو حەتمیـەتی مێـژوییش تـا هـەموو ڕۆحیەتێكی بەرەنگاری لەو كەسانە داماڵێ كە دەچـنە خانـەی نایارانـەوە، تـا بـە ویـژدانێكی ئاسـودەوە سـزایان بـداو تـەنها وەك دوژمنـی خۆی نیشانیان نەدا، بەڵكو وەك دوژمنی میژوو زانســـتیش وێنایـــان بكـــاو وەك خـــەڵكانێكی بێهـــوودە لێیـــان بڕوانـــێ كـــە بەگـــژ هەقیقـــەتی مێـــژوویی و زانســـتی ڕەهـــادا دەچـــنەوە. لەمبارەیـــەوە، ئارێنـــت ستایشـــێكی ئیـــنگڵس بەنمونـــە دێنێـــەوە كـــە مـــاركس-ی ناونـــاوە "داروینی مێژوو"[1]، بەو مانایەی هەروەك چۆن داروپـــن تیـــۆرەی گەشـــەكردنی بوونـــەوەری بـایۆلۆجیی وەك یاسـایەكی زانسـتی حـەتمی ئاشـــكراكرد، بەهـــەمان شـــێوە ماركســـیش گەشـــەكردنی ڕژێمـــی سیاســـیو ئـــابوریی كەشـفكرد وەك یاسایەكی مێـژوویی حـەتمی كـە

قابلی بەرەنگاربوونەوە نیە، بگرە هەر بەرەنگارییەکی ئەو یاسا مێژووییە بەر زەبری خودی مێژوو دەکەوێ‌و چارەنوسی هیچ نیە جگە لەناوچوون‌و دۆڕان. ئەڵبەتە لە سەردەمی یەکێتی سۆڤێتدا بۆلشەفیکەکان، بەتایبەتی ستالینیەکان، تەئویلێکی زۆر ترسناکیان بۆ ئەو دیدەی مارکس کرد کاتێ ڕەوایەتی زانستی‌و ئایدیۆلۆجی‌و ئەخلاقییان دەبەخشییە تاوانەکانیان بۆ قەتڵوعامی سەدان هەزار کەس، بەو پاساوەی ئەوانە کەسانێکن بەحەتمی دەبێ لەناوبچن چونکە بەگوێرەی حەتمیەتی مێژوویی‌و زانستی ئەوانە چینی ڕوو لە مەرگن. بەهەمان شێوە نازییەکان لە تیۆرەی ڕەگەزپەرستیدا سوودیان لە هەمان تێزی داروین وەرگرت، بەتایبەتی لەو خاڵەدا کە دەڵێ: مانەوە تەنها بۆ بوونەوەرە بایۆلۆجییە بەهێزەکانە، بەلاّم لای وان مانەوە تەنها بۆ ڕەگەزە جێرمەنییە بالاّکان بوو، کە دەبێ ڕەگەزەکانی تر یان ملکەچیان بن یان بە حەتمی‌و وبێدوودڵی قڕبکرێن‌و لەناو بچن.

بەدرێژایی مێژوو مرۆڤ خەباتی کردووە بۆ تێپەڕاندنی ئەفسانەی حەتمیەتی غەیبانی، بۆ رزگاربوون لە ئیستبدادی ئەو هێزانەی کە بەناوی قەدەرو فەرمانی ئیلاهییەوە خەڵکیان کوشتووەو سزای ترسناکیان سەپاندووە. تۆتالیتاریزم بە هەمان میکانیزم کاردەکا، بەلاّم بەپێی لۆجیکێکی سەربەرەوخوار کە حەتمیەتی غەیبانی دەگۆڕێ بە حەتمیەتی زانستی. واتە هەروەکچۆن تیرۆریستە خاوەن عەقیدە غەیبانیەکان بەویژدانی ئارامەوە قوربانیەکانیان لەناودەبەن‌و قەناعەت بەخۆیان دێنن گەر قوربانیەکان گوناهبار بن دەبێ بکوژرێن‌و گەر بێگوناهیش بن قەدەری ئیلاهی ئەوەی خواستووە کە بکوژرێن، تۆتالیتاریزمیش بە هەمان لۆجیك، بەلاّم بەلنگاوقووچی پاساو دەبەخشێ بە دڕندەیی. لەم سەروبەندەدا قوربانیەکان‌و جەللادەکانیش بێگوناهن، چونکە ئەوانەی لەناودەبرێن هیچ تاوانێکیان نەکردووە، ئەوانەیشی لەناویاندەبەن تەنها فەرمانێکی دادگای بالاّ جێبەجێدەکەن کە شەرعیەتی لە دادگای بالاّی مێژوو یان یاسای پەرەسەندنی زانستی‌و سروشتییەوە وەرگرتووە، هەموو بەرەنگارییەکی ئەم لۆجیکەش کەسی بەرەنگاریخواز دەخاتە خانەی "دوژمنانی بابەتی". واتە تۆتالیتاریزم لەگەڵ بازنەی ئاسنینی تیرۆردا فرەڕەنگی مرۆڤ لەناودەبا و تاکێك دادەتاشێ کە "بەشێوەیەك ڕەفتاردەکا وەك ئەوەی خۆی بەشداری لە ڕەوتی مێژوو یان سروشتدا بکا"[2].

هانا ئارێنت ئەم گواستنەوە ترسناکەی تۆتالیتاریزم لە حەتمیەتی غەیبانییەوە بۆ حەتمیەتی زانستی دەبەستێتەوە بە پەرەسەندنی زاراوەی ئایدیۆلۆجیاوە لە چاخی نوێدا، چونکە ئایدیۆلۆجیا زاراوایەکی لێکدراوە، لە وشەی (ئایدیۆ *Ideo*)و پاشگری (لۆجی *logy*) پێکدێ، هەرچی یەکەمیانە (ئایدیا) واتایەکی میتافیزیکی فەلسەفیی هەیە کە خەیاڵ‌و فیکری مرۆڤ راپێچ دەکا بەرەو ئەو شتانەی کە واقعی‌و بەرجەستە نین، بەلاّم (لۆجی) واتایەکی زانستی دەبەخشێ‌و زیاتر پەیوەستە بەو شتانەوە کە دەکرێ ئەزمون بکرێن‌و لەسەرزەمینی واقع تاقیبکرێنەوە[3]. ئەڵبەتە ئارێنت بایەخی فەلسەفە دەزانێ وەك دەزگایەکی پرسیارکردن‌و گەڕانی بەردەوام کە

دژی چەقبەستنی عەقائیدییە، بەلاّم ئەویش هاوڕای (ریمۆن ئارۆن)ە کە پێیوایە کاتێ فەلسەفە تەرجەمەدەکرێ بۆ ئایدیۆلۆجیا، ئیتر رەهەندە مرۆیی و گەردوونیەکانی لەدەستدەداو بەشێوەیەکی مەبەستگەر لەقالّب دەدرێ[4]. ئەو مارەکردنە ترسناکەی نێوان خەیالّی میتافیزیکی و حەتمیەتی زانستی لە سەردەمێکدا پەنای بۆ برا کە مرۆڤی مۆدێرن توانی ترسناکترین و شەیتانیترین خەیالّ تاقیبکاتەوە، لەکاتێکدا لە سەردەمی کۆندا یۆتۆپیای فەلسەفی تەنها بەرهەمی خەیالّێکی ئایدیالّ بوو کە لەلایەن حەکیمەکانەوە لە خەلّوەتگای میتافیزیکیدا، نەك لە تاقیگا راستەقینەکاندا، پەنای بۆ دەبرا. بۆ نمونە هەرچەندە بەڕای فەیلەسوفێکی وەك (کارل پۆپەر) کۆماری ئەفلاتۆن، وەك یۆتۆپیایەکی فەلسەفی، یەکێکە لە هەولّە تیۆرییە سەرەتاییەکان بۆ دامەزراندنی سیستێمی تۆتالیتار لە مێژووی فیکردا[5]، بەلاّم ئارێنت پێیوایە تۆتالیتاریزم لەسەر زەمینی واقع تەنها ئەو کاتە دامەزرا کە ئایدیالّیزمی فەلسەفی تێکەلّ بە لۆجیکی زانستی کرا، واتە خەیالّ وەك گریمانەیەکی ئایدیالّ لە تاقیگە راستەقینەکانی زانستی مۆدێرندا ئەزموونکرا، لەسەر ئاستی تیۆریش زاراوەی (ئایدیۆلۆجیا) لە چاخی نوێدا بایەخێکی گەورەی وەرگرت. هەربۆیە لە کتێبێکی تریدا دەربارەی (توندوتیژی) هانا ئارێنت باس لە مەترسی پێشکەوتنی تەکنەلۆجی دەکا لەسەردەمی نوێدا گەر ببێتە ئامرازێکی دەستی شەڕخوازەکان، ئەوانەی کە توندوتیژی تەنها لەپێناو توندوتیژیدا پێرەودەکەن، بەجۆرێك چیتر ناتوانین بلّێین ئەو پێشکەوتنە گەورەیەی کە پیشەسازی چەك و وێرانخوازی بەخۆوەی دەبینێ تەنها بۆ مەبەستێکی سیاسیی تەقلیدییە[6].

هەموو ئایدیۆلۆجیاکان لە هەناویاندا تۆخمی تۆتالیتاریان تێدایە، بەلاّم لە سەدەی بیستەمدا دوو ئایدیۆلۆجیا لە هەموو ئایدیۆلۆجیاکانی تر زیاتر توانیان حەتمیەتی زانستی و مێژوویی بکەن بەبەری ئایدیا ترسناکە پەتییەکانیاندا، ئەو دوو ئایدیۆلۆجیایەش راسیزم و بۆلشەفیزم بوون، کە پشتئەستوور بوون بە سێ بنەمای فیکریی سەرەکی:

<u>یەکەم:</u> ئایدیۆلۆجیا تەنها مامەلّە لەگەلّ واقعێکی هەستپێکراودا ناکا کە بوونی هەیە، بەلّکو دەشێ ئەگەرێکی خەیالّییش وەك واقعێکی حەتمی و مێژووکرد وێنابکا و لەسەر بنەمای ئەو ئەگەرە خەیالّییەش مامەلّە لەگەلّ دراوە واقعیەکاندا بکا. واتە "بەلّێنی راڤەکردنی هەموو روداوە مێژووییەکان دەدا..، بەلّێن دەدا رابردوو بەتەواوی راڤەبکا و تێگەیشتنی تەواوی بۆ هەنوکە هەبێ و بەشێوەیەکی دیاریکراویش پێشبینی داهاتو بکات"[7].

<u>دووەم:</u> عەقیدەی ئایدیۆلۆجی بۆ سەلماندنی ئایدیا پەتیەکان پێویستی بە بەلّگەهێنانەوەی واقعی نیە، چونکە بەرگی زانستی و حەتمیەتی مێژوویی دەکا بەبەری ئایدیاکانیدا کە مەرج نیە لە ئێستادا بسەلمێندرێن، بەلّکو ئەوە مێژووە دەیسەلمێنێ. ئایدیۆلۆجیست کەسێکە خۆی لەهەر پاساوێکی لۆجیکی دەدزێتەوە کە پێنج

هەســـــتەکە لـــــە واقیعـــــدا دەیســـــەلمێنن و مـــوژدەی واقعێکـــی "راســـتەقینەتر" دەدا کـــە هێشتا نەهاتووە[8].

**سێیەم:** عەقیـدەی ئایـدیۆلۆجی هەوڵـدەدا بەڵگەنەویستێکی پێشوەخت بۆ خۆی دابتاشێ و هەموو تێزە پاشوەختەکانیش لەسەر بنەمای ئەو بەڵگەنەویســـتە بنیـــات بنـــێ، واتـــە گەمەیـــەکی لۆجیکی یان دیالیکتیکی دەکاو دەڵێ: مادامەکی "پێشەکی" عەقیدەکە بەڵگەنەویستە، ئیتر هەموو ئـەو دەرەنجامـە تیۆریانـەی لـەو بەڵگەنەویسـتە دەکەونـــەوە، ئـــەوانیش بەڵگەنەویســـتن و هـــیچ مشتومڕێك هەڵناگرن. لێرەدا هانا ئارێنت نمونەی هیتلـەر دێنێـتەوە کـە پێیوابـوو ئایـدیۆلۆجیای نـــازیزم ئایدیۆلۆجیایەکـــە بـــە خەمســـاردییەکی لۆجیکییـــــەوە دەڕوانێتـــــە یاســـــای حـــــەتمی لەناوچوونی هەندێ ڕەگەز لە بەرژەوەندیی هەندێ ڕەگـەزی تـر..، هـەروەك چـۆن سـتالین شـانازی بـــەوەوە دەکـــرد کـــە دیـــالیکتیکی کۆمۆنیســـتی دیالیکتیکێکی بێبەزەییـە چونکە بەڵگەنەویستەو قـــابلی ڕەتکردنـــــەوە نیـــــە. ئەمـــــە دروشمـــــی ئایـــدیۆلۆجی هەریـــەك لـــەو دوو پیـــاوە بـــوو کـــە هەرچـەندە لـە مێـژووی فیکـردا هـیچ پێگەیـەکیان نیـــــە، بـــــەڵام دەبـــــێ لـــــەریزی گـــــەرنگترین "ئایدیۆلۆجیست"ەکان ناوزەد بکرێن[9].

ڕژێمی تۆتالیتار تەنها بەوەوە ناوەستێ کە ئایدیۆلۆجیایەکی تایبەت بەدەسەڵاتی سیاسی دابڕێـژێت، بـەڵکو ئایـدیۆلۆجیای خـۆی بەسـەر یەکبەیـــەکی ڕەعیەتـــدا دەســـەپێنێ و بوارێـــك ناهێڵێتەوە بۆ کشانەوە. واتە ڕژێمی تۆتالیتار لە بابەتی ڕژێمە دیکتاتۆرە تەقلیدیەکان نیە کە ئاسایشی هاوڵاتیانیان دەستەبەر بکا بەرامبەر بێدەنگبوونیان و کشانەوەیان لە کاری سیاسی. لە سایەی ئەو ڕژێمەدا دەبێ هەموان سیاسەت بکـەن و هـەموویان بانگەشـە بـۆ ئایـدیۆلۆجیای دەسـەڵات بکـەن بـەو جـۆرەی کـە بۆیـان دیـاری دەکـرێ نـەك بـەو جـۆرەی هەڵیدەبـژێرن. لێـرەوە تۆتالیتـــاریزم بـــە وێرانکردنـــی بـــواری گشـــتی دەسـپێدەکا، ئـەو قۆناغـەی کـە تیایـدا خـەڵکی ناچـار دەبـن لـە سیاسـەت بکشـێنەوە و بچـنە خـەڵوەتگای تایبـەت و بـواری تایبـەتی ژیـانی کۆمەڵایەتییـــەوە، بـــەڵام لـــە قۆنـــاغی دووەمـــدا دەســـتدەکا بـــە لـــەوناوبردنی بـــواری تایبـــەتی و ناچارکردنی مرۆڤەکان بۆ گەڕانەوەیان بۆ ژیانی گشتی، بەڵام لە ڕاستیدا ئەوە گەڕانەوە نیە بۆ بـــواری گشـــتی (سیاســـی و مـــەدەنی) بـــەڵکو جۆرێکە لە گەڕانەوە بۆ ژیانی مێگەلی کە تیایدا مـرۆڤ بەشـداری لـە گـەورەترین و بـەرفراوانترین کاری بەکۆمەڵدا دەکا، بەڵام لە ناخی خۆیدا لە کوشندەترین تەنهاییدا دەژی. چونکە تـەنهایی ڕۆمـانتیکی دەرفـەتێك بـۆ دیـالۆگی خـود لەگـەڵ خۆیـدا دەسـتەبەردەکا، بـەڵام ئـەو تەنهاییـەی تۆتالیتـاریزم بـۆ مرۆڤـەکانی دەهێنێتـە ئـاراوە بوارێـك بـۆ دیـالۆگی مـرۆڤ لەگـەڵ خۆیشـیدا ناهێڵێتـەوە. واتـە مـرۆڤ دەبێتـە بوونـەوەرێك لـەو تەنهاییـە ڕادەکـا کـە گیرۆدەیـەتی و پـەنادەبا بـۆ ئـەرکی دەسـتەجەمعی، بـەڵام لـەناو مێگەلیشـدا هەسـت بـە تەنهاییـەکی کوشـندەتر دەکـا کاتـێ کەسـێ شك نابا وتوێـژی لەگـەڵ بکـا. تـەنهایی، تـەنها کاتێـك پەسـەندە و مرۆڤ دەتوانـێ بەرگـەی بگـرێ کـە قۆنـاغێکی کۆمەڵایـەتی بـەدوادا بێـت، قۆناغی ئیعتراف و شەفاف بوونی خـود لەئاسـت خودەکانی تردا، بەڵام کاتێ ڕاکردن لـە تـەنهایی

بــەوە کۆتــایی دێ کــە مــرۆڤ خــۆی لــەناو ئاپۆڕەیەکی خەڵکی تـەنهاتر لـەخۆی ببینێتـەوە، ئـیتر هەسـتدەکا لـە وێرانەیەکـەوە پـەنادەبا بـۆ وێرانەیەکی تر، کە ئەوەش ترسناکترین دۆخـی وجـودیی مرۆڤـە کـە ڕژێمـە تۆتالیتارەکـان زۆر بەوردی کاری لەسەر دەکەن.

لـە بەشـی یەکـەمی کتێبەکەیـدا، کـە لـەژێر ناونیشـانی "کۆمەڵگـەی بێ‌چـین"دایـە، هانـا ئارێنــت ئامــاژە بــەم ســتراتیجەی دەســەڵاتی گشتگیر دەدا، کـە کۆشـش دەکا هـەموو ئینتما کۆمەڵایەتیــەکان لەناوبــەرێ کــە دینامیــەت دەبەخشــنە کۆمــەڵگاو ڕۆحیــەتی جیــاوازیو بــەرەنگاریی تێـدا دەخـولقێنن. ئـەو پرۆسـەیە بەهێنانەپێشـــەوەی خەڵکـــە بێ‌ئینتمـــا و پـــەراوێزخراوەکانو بەخشـــینی پلەوپایـــەو دەسەڵات پێیان دەستپێدەکا، ئەو خەڵکانەی کە ئارێنت ناویانـدەنێ "هەرچیو پەرچی" ڕقێکـی خۆڕسکیان لە هـەموو چینەکانی کۆمەڵگە هەیـەو کاریگـەرترین چـەکی دەسـتی ڕژێمـی تۆتالیتـارن، چونکە خاوەنی هیچ بەرژەوەندییەك نین کە بترسن لەدەسـتی بـدەن. لێـرەوە بەرژەوەنـدی ڕژێمــی تۆتالیتــار لەگــەڵ هێنانەپێشــەوەی خەڵکــە بــێ بەرژەوەندیەکاندایـە، کـە بەهـەموو شـتێك ڕازیـنو هـیچ بەرژەوەندیـەکیان نیـە لەگـەڵ بەرژەوەنـدی دەسـەڵاتدا ناکۆك بێو مـەرجی پێشـوەختیان نیـە بۆ ملدانو جێبەجێکردنی هەموو ئەو فەرمانانـەی پێیان دەسپێردرێ. ئایدیۆلۆجیای نازیزم لەسـەر ئاسـتی کۆمەڵایـەتیش تـوانی فریـوێکی گـەورە بخاتــە بــەردەم ئــەو خەڵکــە پــەراوێزخراوەی کــە بـــەهۆی قەیرانـــە ئـــابوریو کۆمەڵایەتیـــە سەختەکانەوە هەستیان دەکرد سەر بەهیچ چینێك نـینو بەچـاوێکی نـزم تەماشـادەکرێن، بـەڵام نازیـەکان ئـەو قەناعەتـەیان لـەلا چاندن کـە ئـەوان سەر بە گەورەترینو پیرۆزترین کـەرتی مرۆڤایـەتین کـە نەتـەوەی جێرمەنییـە. یـان هـەروەك ئارێنـت دەڵــێ: ئــەو خەڵکــە لــە ســیاقێکی مێــژوویی و کۆمەڵایـەتی هێنـدە نالـەبارو پەرتـدا دروسـتببوون کە هەرگیز توانای خۆڕێکخستنیان نـەبوو، "تـەنها هەســتێکی ناسیۆنالیســتی تونــدڕەو پێکــەوەی دەلکاندن، بۆیە شتێکی سروشتی بوو لە یەکـەمین ئـــەزموونی نائومێـــدی تازەیانـــدا ئارەزوویـــەکی ناسیۆنالیستی توندڕەویان هەبێ"[10].

ئیــدی ئــەو نمونەیــەی ئەنــدامی حزبــی تۆتالیتــار، کــە کەرامــەتو ژیــانو مانــەوەی دەبەستڕێتەوە بە حزبەوە دەبێتە نمونـەی باڵای هــەموو ئەنــدامانی حــزب. پێویســتە هــەموو ئەنـدامان ئـەو هەسـتەیان لا دروسـت ببـێ کـە ئـەوان هـیچ نـین بـەبێ حـزبو لـەدەرەوەی حـزب شـوێنێك نیـە لـەم جیهانـەدا ئـەوان لـەخۆبگرێ. واتە بێ‌قیمەت کردنی مرۆڤـو بەتاڵکردنەوەی لە هەموو متمانەو بڕوایەك بەخۆی ئەو ستراتیجەیە کــە حــزبو ڕژێمــی تۆتالیتــار زۆر بــەوردیو بـەگوێرەی بەرنامەیـەکی داڕێـژراو کـاری لەسـەر دەکا، تا وردە.. وردە حزب یەکسـان بکاتـەوە بە کۆمەڵگەو لەوێشەوە حـزب یەکسـان بکاتـەوە بە دەوڵـەتو نەتـەوەو جیهـانو شـوێنێکی ئـەمین لـەدەرەوەی حـزب نەهێڵێتـەوە کـە تیایـدا مـرۆڤ هەســت بــە ئاســایشو ئــارامی جەســتەییو دەروونــی بکــا[11]. لــە کــاتێکی ئاوهــادا، کــە غـەریزەی ژیـانو مانـەوە دەچێتە پـێش هـەموو غـەریزەکانی تـرەوە، حزبـی تۆتالیتـار پێویستی بـەوە نامێنــێ بەرنامــەی کــاری حزبــی بخاتــە

بەردەم ئەندامان و جەماوەرەکەی تا قایلیان بکا بە نیازو پلانەکانی، چونکە قایلبوون خواستی مرۆڤە ئازادەکانە، نەك مرۆڤگەلێك کە تەنها خەمیان ئەوەیە دڵسۆزیی خۆیان بۆ حزب بسەلمێنن. لەم نێوەندەدا سەرکردەی تۆتالیتار هێندەی پەنا بۆ فەرمان و کاری مەیدانی دەبا هێندە پەنا ناباتە بەر رازیکردنی شوێنکەوتوانی و هەرگیز دەرفەتی وتوێژو قایلکردنی فیکری ناهێڵێتەوە، چونکە لە کاتی تێرامان و وتووێژدا مرۆڤەکان دەبنەوە بەخۆیان و توانای نەیارییان تێدا دروستدەبێ، بەڵام لەکاتی فەرماندەرکردندا مرۆڤەکان دەبنەوە بەشێکی زۆر بچووك لە ماشێنێکی بەکۆمەڵدا، کە مرۆڤ بەتەنها و لە دەرەوەی ئەو ماشێنە هیچ بەهایەکی نییەو بوونەوەرێکی بێقیمەتە. هەربۆیە بۆلشەفیەکان بەرنامەی سیاسیی خۆیان لە چەند هێڵێکی گشتیدا کورتدەکردەوە کە پێویستی بە لەسەر وەستان و پرسیارکردن نەبوو. هەرچی مۆسۆلێنی بوو دەیوت بەرنامەی حزبی شتێك نیە جگە لە پارچە کاغەزێکی بێسوودو جارسکەرو بەرنامەی حزبی فاشیست تەنها سازدانی جەماوەری و کارو هەڵوێستی عەمەلییە. لەسەر هەمان ریتم هیتلەر لەو باوەڕەدا بوو کە "خودی فیکر تەنها بەپێی دەرکردن و جێبەجێکردنی فەرمانەکان بوونی هەیە"[12]. لێرەوە ئەو فریوەی کە دەخرایە بەردەم هەرچی و پەرچیەکان فریوی دەسەڵات نەبوو، بەڵکو فریوی خزمەتکردنی دەسەڵاتێك بوو کە ستراتیجیەتی کەمبایەخکردنی فیکریی پێڕەودەکرد، تا مرۆڤەکان چەندە بوودەڵەو خوێنرێژو نەزانیش بن خۆیان وەك کەسانی گەورە بێتە بەرچاو کە خزمەتی ئایدیۆلۆجیایەکی مەزن و سەرکردەیەکی مێژوویی دەکەن لە دەوڵەتێکدا کە جیاوازییەکانی نێوان نوخبەو عەوامی خەڵك هەڵدەگرێ، چونکە هەرەمی دەسەڵاتی تۆتالیتار بەشێوەیەك دادەڕێژرێ کە غرورێکی ساختە دەبەخشێ بە هەموان. هەرچی سەرکردەیە وەك کەسێکی گەورەو بلیمەت وێنادەکرێ چونکە سەرکردایەتی کەسانێکی گەورەو نەتەوەیەکی گەورە دەکا، هەرچی ئەو خەڵکانەشە کە ملکەچی تەواوی فەرمانەکانی سەرکردەن سەر بەو نەتەوە گەورەیەن. بۆ سەلماندنی ئەم غرورە ساختەیە گۆبلز دەیووت: "مەزنترین خۆشبەختی کە مرۆڤی هاوچەرخ هەستی پێبکا ئەوەیە کە خۆی بلیمەت بێ یان خزمەتکاری بلیمەتێك بێت"[13].

تۆتالیتاریزم تەنها ئیش لەسەر پاوانکردنی دامودەزگا بەرجەستەکانی دەوڵەت ناکا لە (ئێستا)دا، بەڵکو هەوڵدەدا یاسا سروشتیەکانی (کات)یش دەسکاری بکاو یادەوەرییەکی نوێ بۆ جەماوەر دابتاشێ کە پاساوی ئایدیۆلۆجیاکەی بدا. لەو پێناوەدا تەنها بەڵگەنامەو راستییە مێژووییەکان لەناو نابا، بەڵکو ئەو نوسەرو خوێنەرانەش لەناودەبا کە باس لە مێژوییەکی ناکۆك بەو مێژووە دروستکراوە دەکەن. پاشان ئایدیۆلۆجیای تۆتالیتاری لە پاوانکردنی (ئێستاو رابردو)ەوە دەگوازێتەوە بۆ پاوانکردنی (ئایندە)و بانگەشە بۆ ئەوە دەکا کە لە پاشەڕۆژدا هەموو پێشبینیەکانی حزب بەحەتمی دێنەدی و هەموو

نەیاریکردنێکی رژێم لە ئێستادا واتە لەناوچوونی حەتمی لە ئایندەدا. بۆ هیچ کەسێکیش نیە ئەم فاڵگرتنەوەیەی رژێمی تۆتالیتار وەك ریکلامێکی سیاسی تەماشا بکا، بەڵکو دەبێ وەك حەقیقەتێکی مێژوویی (لە رابردوودا) و وەك حەتمیەتێکی زانستیش (لە ئایندەدا) تەماشا بکرێ. بۆ نمونە نازیەکان بانگەشەیان بۆ تیۆرەی رەگەزپەرستی دەکرد وەك هەقیقەتێکی رەها کە رەوایەتی لە رۆحی مێژوویی ئەڵمانییەوە وەرگرتووەو زانستی بایۆلۆجیاش وەك راستییەکی زانستی پشتراستی دەکاتەوە. هەرچی بۆلشەفیەکان بوو بەمەبەستی بانگەشەکردن بۆ ئایدیۆلۆجیای خۆیان پەنایان دەبردە بەر دەزگا ئەکادیمیو زانستیەکانیانو "تەنانەت زاناکانیان ناچاردەکرد رۆڵی فاڵچی وازی بکەن"[14].

بەمجۆرە ئایدیۆلۆجیای تۆتالیتاری لە عەلمانیەتی زانستییەوە دەپەڕێتەوە بۆ غەیبانیەتی زانستیو بەزۆری زۆردارەکی زانست دەکاتە ئامرازێك بۆ ساغکردنەوەی ئەو تێزە ترسناکانەی کە تەنها لە خەیاڵی وێرانخوازی سەرکردە تۆتالیتارەکاندا هەیە[15].

واتە هەروەك چۆن سەرکردە ئیماندارە کۆنەکانی مێژوو بەناوی قەدەری ئیلاهییەوە قەتڵوعامی نەیارەکانی خۆیان دەکرد، بەهەمان شێوە سەرکردە تۆتالیتارەکان بەناوی قەدەری زانستییەوە غەریزەی کوشتنو وێرانخوازیی خۆیان بەتاڵدەکەنەوە، بگرە بەشێوەیەکی ترسناکتر چونکە ئەمان لە سەردەمێکدا ئەو کارە دەکەن کە چەکی کوشندەترو دامودەزگای پروپاگەندەی پێشکەوتوتریان لەبەردەستدایە، کە لە توانایدایە هەر خەیاڵێك، چەندە سایکۆپاتیو ترسناکیش بێ، بکاتە هەقیقەتێك لە سەرزەمینی واقع. بەڵام سەرباری ئەم لێکچوونە، جیاوازییەکی بنەڕەتی لەنێوان عەقیدەی ئیمانداری ئاینیو ئایدیۆلۆجیای ئیمانداری تۆتالیتاریدا هەیە، بەتایبەتی لەو خاڵەدا کە عەقیدە لای یەکەمیان رەهەندێکی مێژوویی قووڵی هەیەو رۆدەچێتە نائاگایی دەستەجەمعی ئیماندارانەوە، بەڵام ئایدیۆلۆجیای تۆتالیتاری زادەی ئامرازەکانی پروپاگەندەی مۆدێرنەو مانەوەی بەندە بە مانەوەی شکۆو هەیبەتی رژێمی تۆتالیتارەوە، هەر ئەوەندەی ئەو رژێمەش دارما ئیتر ئەو عەقیدە رەهایەش دادەرمێو لایەنگرانی وەك ئەوەی گرەوێکی دۆڕاویان کردبێ بەهێمنی پاشەکشێ دەکەن. ئەڵبەتە بەزۆر پێکەوەلکاندنی ماتریالیزمی زانستی (دیالیکتیکی لای بۆلشەفیەکانو جینناسی لای نازیەکان) لەگەڵ پێشبینیکردنی ئایدیالیزمی غەیبانی یان میتافیزیکی...، گەمەیەکی ترسناکەو کاتێ پێکەوە کۆدەکرێنەوە کارلێکێکی کوشندەیان لێدەکەوێتەوە. بەڵام سەرەنجام گەمەکە وەك کۆمیدیا کۆتایی پێدێ، چونکە حوکمەکانی زانست هەمیشە رێژەیینو لە سیاقێکەوە بۆ سیاقێکی تر گۆڕانیان بەسەر دێ، لە کاتێکدا عەقیدەی ئیمانداری غەیبانی عەقیدەیەکی رەهایەو نەك پشت بەزانست نابەستێ بەڵکو لەسەرو زانستەوە خۆی دەبینێتەوە.

حزبی تۆتالیتار لەسەر ئاستی رێکخستنیش هەوڵدەدا کارلێك بسازێنێ لەنێوان کەسانێکدا کە تەنها لەسەر ئاستی تیۆریو وەك ئایدیایەکی پەتی بڕوایان بە عەقیدەی حزب هەیە لەگەڵ ئەو کەسانەدا کە ئەو ئایدیا پەتییە

وەك حەتمیەتێكی مێژویی یان زانستی لەسەر زەمینی واقع جێبەجێدەكەن، واتە دروستكردنی پلەبەندی لەنێوان لایەنگران و ئەندامانی حزبدا دروستدەكا بەوەی كە لایەنگران تەنها لەسەر ئاستی تیۆری بانگەشە بۆ حزب دەكەن یان بڕوا بە پڕوپاگەندەكانی دەكەن، بەڵام ئەندامان كەمینەیەك پێكدێنن لەو كەسانەی كە لەسەر زەمینی واقع ئەو پڕوپاگەندانە جێبەجێدەكەن و قسە تەرجەمە دەكەن بۆ واقعێكی بەرجەستە. هانا ئارێنت قسەیەكی هیتلەر بەنمونە دێنێتەوە كە بەچاوێكی سووكەوە تەماشای لایەنگرانی خۆی كردووە، تەنانەت خوێندەوارە نازیەكانیش، ئەوانەی تەنها بەقسە نەك بەكردەوە نازی بوون. واتە حزبی تۆتالیتار تەنها لەنێوان شوێنكەوتوانی حزب و نەیارانی حزبدا پلەبەندی و جیاوازی دروست ناكا، بەڵكو لەنێو خودی حزبیشدا پلەبەندی دروستدەكا و هەمیشە هەستێك لای پێڕەوانی خۆی دەچێنێ بەوەی كە هێشتا ماویانە ببنە دڵسۆزی تەواو و هێشتا لە بازنەی گومان و لەژێر چاودێریدان و هێشتا نەیانتوانیوە وەلا و دڵسۆزیی خۆیان بەتەواوەتی بسەلمێنن. بۆ نمونە نازیەكان پلەبەندییەكی زۆر ئاڵۆزیان لەنێوان دەزگای ڕێكخستندا دارشتبوو بۆ تۆخكردنەوەی ئەو هەستە لای نازیەكان، لەشێوەی چەند بازنەیەكدا كە گەورەترینیان بازنەی لایەنگران بوون و چەقی بازنەكەش سەركردەی حزب بوو، لەنێوان لایەنگران و سەركردەشدا چەندین بازنەی تر هەبوون كە هەمیشە لەژێر چاودێریی یەكتردا بوون. لایەنگران ئەو كەسانە بوون كە بڕوایان بە ئایدیۆلۆجیای نازی هەبوو بەڵام بەهۆی سەرقاڵیانەوە بە كار و پیشە و ژیانی تایبەتی خۆیانەوە شەرەفی ئەندامبوونیان لە حزبدا پێنەدەبڕا. ئەندامان ئەو كەسانە بوون كە لەكاتی بەریەككەوتنی ژیانی تایبەتی و بەرژەوەندیی حزبدا قوربانیان بە بەرژەوەندیی تایبەت و ژیانی كەسە نزیكەكانی خۆیان دەدا لەپێناو حزبدا، بەو شێوەیەش شەرەفی ئەندامبوونیان پێدەبڕا. بەڵام وەرگرتنی ئەندامێتی بەس نەبوو بۆ ئەوەی ببنە نازییەكی دڵسۆز، چونكە لەنێو ریزی ئەندامانیشدا چەند دەزگایەكی نهێنی هەبوون، وەك دەزگای هەڵمەت (*S.A*) كە لە ئەندامان توندڕەوتر بوون، لەنێو ئەندامانی ئەو دەزگایەشدا ئەندامانی دەزگای پاراستن (*S.S*) هەڵدەبژێردران كە چەند قاتێ توندڕەوترو دڕندەتر بوون. بەڵام هەرگیز نابێ هەستێكی ئەوتۆ لای ئەندامانی ئەو دەزگایانە دروست ببێ كە ئەوان لەهەمووان دڵسۆزترن بۆ حزب. بۆ ئەو مەبەستە (هیملەر)ی سەرۆكە دەزگای پاراستنی حزبی نازی چەند دەزگایەكی نهێنیی توندڕەوتری دروستكرد وەك: (دەزگای هەواڵگری ئایدیۆلۆجیای حزب، نوسینگەی تایبەت بە مەسەلەی ڕەگەز و یەكەی پاسەوانیی ئۆردوگا زۆر ملێكان)[16]...، كە لە یەك كاتدا ئەركی پاراستنی حزب لە دوژمنی دەرەكی و ئەركی چاودێریكردنی ئەندامانی خودی حزبیشیان پێسپێردرا بوو، بەڵام هەر ئەو دەزگایانەش لەلایەن یەكترییەوە چاودێری دەكران تا هیچ ئەندامێك لەوە دڵنیا نەبێ كە تەنها چاودێری دەكا، بەڵكو دەبوو بزانێ بەردەوام چاودێریش دەكرێ. بەمجۆرە دەسەڵات نێوەندێكی

ئاشـکرای نـەبوو، هەمیشـە لـە شـوێنێکەوە دەگوازرایەوە بۆ شوێنێکی تر، دەبوو تارمایی دەسەڵات لەهەموو شوێنێك ئامادەیی هەبێ، لە کەرتـەکانی دەوڵـەت و کۆمـەڵگەوە تـا دامودەزگاکانی خودی حزب و لەوێشەوە بۆ دەروون و سایکۆلۆجیای یەك بەیەکی تاکەکان، بە ئەندازەیەك دەسەڵات دەبووە سێبەری هەموو کەسێك و بۆ هەر شوێنێك بڕۆشتایە ئەو بەدواوەی بوو، ئەگەر کەسیش چاودێری نەکردایە دەبوو خۆی چاودێری خۆی بکا و لەخۆی بپێچێتەوە.

هانا ئارێنت سەرنجمان بۆ ئەوە رادەکێشێ کە هەڵەیە گەر وابزانین رژێمی تۆتالیتار رژێمێکی دیکتاتۆری میلیتاری (سەربازی)یە، چونکە لەناو دەزگای سوپادا پلەبەندییەك هەیە کە لەرێگەیەوە رێز لە بیرۆکراتیەتی پیشەیی و پلەبەندیی سەربازی دەگیردرێ و پێگەیەکی ئاشکرا بە هەر یەکێك لە سەربازان دەدرێ. لەمبارەیەوە هۆکاری ئیعدامکردنی (رۆهم) فەرماندەی یەکەکانی ($S.A$) لەلایەن هیتلەرەوە ناگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە رۆهم نازییەکی نادڵسۆز بوو، بەڵکو دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە ئەو دەیویست هەموو دەزگا نهێنییە تێکڕژاوەکانی رژێمەکەی رێکبخا و بیانخاتە ژێر فەرماندەیی دیکتاتۆرییەتی سەربازیی مەرکەزییەوە، واتە نێوەندێکی ئاشکرا ببەخشێ بە دەسەڵات کە ناکۆك بوو لەگەڵ ستراتیجیەتی بەنهێنیکردنی نێوەندی دەسەڵات بەو شێوەیەی کە هیتلەرو هیملەر نەخشەیان بۆ کێشابوو. لێرەوە دەکرێ بڵێین یەکێك لە جیاوازییە سەرەکیەکانی نێوان رژێمی دیکتاتۆری و رژێمی تۆتالیتاری لەم خاڵەدا دەردەکەوێ، کە یەکەمیان زیاتر پشت بە دەزگای سەربازی دەبەستێ، بەڵام دووەمیان بەپلەی یەکەم پشتئەستورە بە دەزگا هەواڵگرییە نهێنیەکان. جیاوازییەکی تر لەنێوان ئەو دوو رژێمەدا لە کەسایەتی سەرکردەکانیاندا دەردەکەوێ، هەرچی سەرکردەی دیکتاتۆرە هەوڵدەدا مەرکەزیەتێکی یاسایی بۆ خۆی دروست بکا و بەپێی هەرەمێکی دەسەڵاتی بێرۆکراتی فەرمانڕەوایی بکا، بەڵام سەرکردەی تۆتالیتار بەگوێرەی فرەمەرکەزیەتێکی جیوەیی کاردەکا و هەمیشە گۆڕان لە دەموچاوی کەسانی دەوروپشتی خۆیدا ئەنجام دەدا. هەرچەندە سەرکردەی تۆتالیتار لەو کەسانە خۆش نابێ کە رەخنە لە دارودەستەکەی دەگرن چونکە رەخنەگرتن لەوان بە ئیهانەکردنی خۆی لەقەڵەمدەدا، بەڵام لە کاتی شکست و قەیرانەکاندا دەبێ دارودەستەکەی باج بدەن و پاکتاوبکرێن، چونکە دڵسۆزیی ئەوان بەوە تاقیدەبێتەوە کە ببنە قۆچی قوربانیی هەڵەکانی سەرۆك. لەم پێناوەدا رژێمی تۆتالیتار بەوردی کار لەسەر سایکۆلۆجیای جەماوەر دەکا و دۆخێکی سایکۆپاتیی دەستەجەمعی ئەوتۆ بڵاودەکاتەوە کە دەبێ هەمیشە جەماوەر چاوەڕێی فەرمانی سەرکردە بێ تا حوکم لەسەر ئەوە بدا کێ ناپاك و خائینە و کێ شۆڕشگێڕو دڵسۆزە، ئیدی زۆر ئاساییە شۆڕشگێڕێك لە ماوەی شەووڕۆژێکدا ببێتە خائین و حوکمی لەسێدارەدانی بەسەردا بدرێ، هەموو خەڵکیش زۆر بە ئاسایی ئەو حوکمە وەردەگرن و وەك بڕیارێکی حەکیمانە لێی دەڕوانن. بەهەمان

شێوە سەرکردەی تۆتالیتار زۆر بەئاسانی درۆ دەکاو گەمە بە دروشمەکانی خۆی دەکاو جێگۆڕکێ لەنێوان بەرەی دوژمنانو بەرەی دۆستاندا دەکا، نابێ هیچ پرسیارێکیش لای ئەو جەماوەرە دروست ببێ بەڵکو بەپێچەوانەوە دەبێ تەئویلی گونجاو بۆ درۆکان بدۆزنەوەو ستایشی بادانەوەکانی سەرۆك بکەن "بەوەی زیرەکییەکی تاکتیکیی لەڕادەبەدەری هەیە"[17].

رژێمی تۆتالیتار کاتێ دێتە سەر حوکم هەمیشە پەیمانی سەقامگیرکردنی دۆخی وڵات دەدا بەجەماوەرەکەی، بەڵام هەرگیز ئەو پەیمانەی خۆی جێبەجێناکاو وڵات لە دۆخێکی ناجێگیرو نائاسایی بەردەوامدا دەهێڵێتەوە، واتە هەرگیز ڕێگەنادا هەستکردن بەئارامیو کۆتاییهاتنی باری نائاسایی لە ناخی خەڵکیدا بچەسپێ. لەو پێناوەدا رژێم پێویستی بە شەڕی بەردەوامو دوژمنی بەردەوامو سازدانی سیناریۆی بەردەوام هەیە سەبارەت بەوەی کە وڵاتو شۆڕش لەبەردەم مەترسیدان. شۆڕش لەدیدی ئایدیۆلۆجیای تۆتالیتاریدا قۆناغێکی پێشوەختو راگوزەر نیە کە بەدامەزراندنی رژێم کۆتایی پێبێ، بەڵکو دۆخێکی هەمیشەییە کە دەبێ وڵات رەنگی پێوە بگرێ. واتە هەروەکچۆن لەسەر ئاستی تیۆریی ئایدیۆلۆجیای تۆتالیتاریزم لەسەر بنەمای کۆکردنەوەی تێزە ناکۆكو دژبەیەکەکان دادەمەزرێ، لەسەر ئاستی پراکتیکیش رژێمێکی لێکدراوە، کە دوو میکانیزمی کاری ناکۆك بەیەك پێکەوە کۆدەکاتەوە: یەکێکیان میکانیزمی بەڕێوەبردنی وڵاتە کە پێویستی بە سەقامگیرکردنی دامودەزگاکانی وڵات هەیە، ئەوی تریان میکانیزمی شۆڕشە کە پێویستی بە هەڵوەشاندنەوەی بەردەوامی دامودەزگا جێگیرەکانە. بەمجۆرە رژێمی تۆتالیتار رژێمێکی بێئەدگارو بێسیمایە، هەر ئەو بێئەدگارییەش دەبێتە ستراتیجێك بۆ تێرکردنی بەردەوامی غەریزەی پاوانخوازی لەسەر ئاستی ناوخۆو فراوانخوازی لەسەر ئاستی دەرەکی. بۆ نمونە سەرباری دوژمنایەتی سەرسەختی ستالین لەگەڵ (ترۆتسکی)دا بەڵام سوودی لە دروشمەکەی وەردەگرت سەبارەت بە "شۆڕشی بەردەوام"، بەو مانایەی کە شۆڕشی کۆمۆنیستی هەرگیز کۆتایی نایەتو تا ململانێی چینایەتی لە جیهاندا مابێ دەبێ هەموو سۆڤێتیەکان لە دۆخی شۆڕشی بەردەوامدا بنو هەرگیز پشتێنی پشوی لێنەکەنەوە. هیتلەریش دوای ئەوەی دەسەڵاتی گرتە دەست بەرنامەی نازیزمی گۆڕی بۆ بەرنامەیەکی جیهانیو ئەوەی دووپاتدەکردەوە کە بزوتنەوەکەی هەمیشە ئەرکی تازەی لەپێشەو زۆر لەوە گەورەترە لە جوغزی ئەڵمانیادا قەتیس ببێ، دروشمەکەی ئەویش بریتی بوو لە "هەنگاونانی جێگیرو نەگۆڕی بەردەوام بەرەو ئامانجی نوێ"[18]. سیمای بێئەدگاری تۆتالیتاریزم لەو تێکەڵبوونە سەیرەی نێوان حزبو دەوڵەتو رێکخراوە جەماوەرییەکانیشدا دەردەکەوێ، کە ئەندامانی هیچ یەکێك لە دامەزراوە تێکەڵو پێکەڵەکانی سەر بەدەوڵەتو حزبو سەندیکاکان نازانن داخۆ ئینتمای سەرەکییان بۆ چ دامەزراوێکەو مەرجەعی دەسەڵات لە کامیانەوە دەستپێدەکا. هەرچەندە بەگوێرەی دەستوری یەکێتی سۆڤێت

شـورا بالاكـانی دەوڵـەت بـەرزترین دەسـەلاتی دەوڵـــەتیان پێکـــدەهێنا بـــەلام دەســـەلاتی راســـتەقینەی دەوڵـــەت بەدەســـت لیژنـــەی مەرکەزیی بۆلشەفیکەکانەوە بوو، لەناو لیژنەی مەرکەزیشدا چاوەڕێی راسپاردەکانی مەکتـەبی سیاسـی بـوون، لـەناو مەکتـەبی سیاسیشـدا هەموو ئەندامان چاوەڕێی فەرمانـەکانی ستالین بـوون. سـەندیکاکانیش لـەبری ئـەوەی ببنـە زمانحـاڵی ئەنـدامانی خۆیـان، بەپێچـەوانەوە دەبـوو بـەردەوام سـیخوڕی بکـەن بەسـەر هەڵســوکەوتی ئەنــدامانی خۆیــانو هەنــدێ جاریش دەسەلاتیان پێدەبەخشرا دەستوەردەنە هەندێ کاروبار کـە لـە دەرەوەی ئـەرکی خۆیـان بـوو. بـەمجۆرە مـرۆڤ لـە تـۆڕێکی ئـاڵۆزی هەمەلایـەنی دامودەزگاییـدا هـەموو ئاراميیـەکی دەروونی لەدەستدەداو حاڵی نابێ داخۆ لـەناو دامودەزگاکانـدا کامـەیان راسـتەقینەو کامـەیان سێبەرە، کامـەیان ئاشـکراو کامـەیان نهێنییـە، کامەیان خاوەن دەسەلاتی راسـتەقینەو کامـەیان خـاوەن دەسـەلاتێکی رووکەشـە. لـە ئـەڵمانیای نـــازیش هـــەمان ســـتراتیجی تێکـــەڵکردنی بـەردەوامی دەزگاکـان پێڕەودەکـرا تـا کـەس هەســت نــەکا گەیشــتۆتە ئاســتێکی بــالای دەســـــەلات، لـــــەناو هـــــەموو دامــــەزراوە حکومیەکانیشدا دەسەلاتێکی حزبی لەسێبەردا هـەبوو کـە لـە دەسـەلاتی بەڕێوەبـەرو وەزیـرو خاوەن هۆبە کارگێڕیەکان بالاتر بوو، بەلام لـەناو هەمان ئەو دەسەلاتە سێبەرەدا دەسەلاتی نهێنی تر هەبوو تا هیچ کـەس هەست نـەکا خـاوەن دوا دەسـەلاتو دوابڕیـارە، بەهـەمان شـێوە لـەنێو سەندیکاکانیشدا دەسـەلات بەشێوەیەکی ئـاڵۆز پێڕەودەکـرا، بـۆ نمونـە لـەپاڵ رێکخـراوی خوێنـــدکارانو ســـەندیکای مامۆســـتایانو پارێزەرانـــــدا رێکخـــــراوی ئاڵتـــــەرناتیڤ دروستدەکرا، تا ئەندامان هەستبکەن هەمیشە رکابـەریان هەیـەو گـەر بەدڵسـۆزی کـار نەکـەنو راپـۆرتی بـەردەوام بەرزنەکەنـەوە ئـەوە لەبـەردەم خەتەری لابردنو سزادانی توندان. هانا ئارێنت لەمبارەیـــەوە قســـەیەکی ســـتیڤن رۆبێـــرتس بەنمونە دێنێتەوە کە لە کتێبێکدا بەناونیشانی "ئـەو خـانوەی هیتلـەر دروسـتی کـرد" دەڵـێ: "ئەگەر پسپۆڕێك لـە رایخی سێیەمدا هەوڵبدات حـزبو دەوڵـەت لەیـەك جیابکاتـەوە، ئـەو کـارە بەرەو شێتی دەیبات"(19).

ئەو پشێوییە سایکۆلۆجییە بەردەوامەی کە دەبـێ خـەڵکی لـە دەوڵـەتی تۆتالیتـاری تێیـدا بـژین، تـەنها لـەپێناو ئـازاردانی دەروونیـدا نیـە، بـەڵکو لـەپێناو پیـادەکردنی چەشـنێکی نـوێی فەرمانڕەواییشـــدایە کـــە مانـــەوەی بەنـــدە بەبلاوکردنـەوەی بـاری نائاسـاییەوە لـە ولاتـدا. دەسەلاتدارە تۆتالیتارەکان هەمیشە کار لەسـەر هەڵوەشـاندنەوەی هاوڕێیـەتی دەکـەن لـەنێوان خەڵکیدا بەتایبەتی هاوڕێیەتی نێوان ئەندامانی حـزبو سـوپاو دامودەزگـا سـەرکوتکەرەکان، چونکە باری نائاسایی ولاتو شۆڕش هەمیشە ئـەوە دەخـوازێ کـە هاوڕێیـەتیو پەیوەندییـە شەخسیەکان دوابخرێ بۆ کاتێکی نادیار، دەبێ هاوڕێیـــەتیو دڵســـۆزی تـــەنها لەگـــەڵ رژێـمو بزوتنـەوەدا بـێ، لـەپێناو سـەلماندنی ئـــەو دڵسۆزییەشـــدا بەشـــێوەیەکی عەمـــەلی دەبــێ هــاوڕێ ســیخوڕی بەســەر نــزیکترین هاوڕێی خۆیەوە بکا.

لـــەناو دەزگـــا تێکرژاوەکـــانی ڕژێمـــی تۆتالیتاردا تەنها یەك دەزگا ڕۆڵێکی مەرکەزیی وازیـدەکا کـە دەزگـای پۆلیسـی نهێنییـە، بـەڵام مەرکەزیـەتی ئـەم ڕۆڵـە هـیچ هەڕەشـەیەك لەسـەر دەســەڵات دروســت ناکــا، چــونکە زۆربــەی ئەندامـــەکانی یـــەکتری ناناســـن تـــا بتـــوانن پەیوەنـدیی تونـدوتۆڵ لەگـەڵ یەکدیدا ببەستن و وەك ئاڵتـەرناتیڤێکی دەسـەڵاتی بـاڵا، لـەکاتی قەیران و کودەتادا، خۆیان نیشان بدەن. دەزگـای پۆلیســی نهێنــی بەبــەراورد لەگــەڵ دەزگــای سـوپادا دەزگایـەکی بیرۆکراتـی نیـە و ڕێـز لـە پلەبەنـــدیی وەزیفـــی ناگرێـــت و بنیـــادێکی ئاشـکرای نیـە تـا توانـای خۆڕێکخسـتنی هـەبێ بەدەر لەو چەشنە ڕۆڵەی کە دەسەڵاتی باڵا بۆی دیاریـدەکا. ئـەم دەزگایـە وەك دەزگـای پۆلیسـی ئاشـکرا کـاری ئـەوە نیـە بـەگوێرەی یاسـا و ڕێنماییە پێشوەختەکان لە کەسە تۆمەتبارەکان بپێچــــێتەوە، بــــەڵکو بــــەپێی ڕێنماییــــە پاشوەختەکان کار دەکا، بۆ نمونـە گـەر فـەرمانی پێبـدرێ تۆمـەت بـۆ کەسـێك دابتاشـێ کـە هـیچ تـاوانێکی نیـە، ئـەوە زۆر گوێڕایەڵانـە ئـەو فەرمانـە جێبەجێدەکا و لیستی ئەو تۆمەتانە دروستدەکا کە ئـەو کەسـە ڕوبـەڕووی تونـدترین سـزادەکاتەوە. بـۆ نمونـە لـە یـەکێتی سـۆڤێت بـەر لـە دەسـتپێکردنی هەڵمەتـەکانی لـەناوبردنی نـەیارانی سـتالین و ئـەو خەڵکانەی خرابوونە ڕیزی (چینە ڕوو لـە مەرگـەکان) تـەنها کادرەکـانی دەزگـای *Gepeou* دەیـانزانی ئـەو هەڵمەتانـە جێبەجێـدەکرێن، چـونکە تـەنها ئـەوان ســـەرقاڵی لێپێچـــینەوەی نهێنـــی و داتاشـــینی بەڵگەنامــە بــوون بەمەبەســتی ئەنجامــدانی ئــەو قەســابخانە گەورانــەی کــە ڕوویانــدا، بەخــەیاڵی

زۆربـــەی قوربانیەکانیشـــدا نـــەدەهات کـــە لـــە داهاتوویـــەکی نزیکـــدا بەتۆمـــەتی تاوانگـــەلێك سزادەدرێن کە هەرگیز ئەنجامیان نەدابوو. بەهـەمان شـێوە لـە ئـەڵمانیای نـازی دەزگاکـانی هـەواڵگری نهێنـــی، بـــە چـــەند ســـاڵێك بـــەر لـــە هەڵمەتـــە بەرفراوانـــەکانی پاکتـــاوکردنی جولەکـــەکان، دەیانزانیٚ ئەو هەڵمەتانە هەر دەبێ ئەنجام بدرێن، بۆیـــە زۆر لێبڕاوانـــە کاریـــان بـــۆ پاســـاودانی پێشـوەختی دەکـرد. واتـە پۆلیسـی نهێنـی بـەدوای تاوانـدا ناگـەڕێ بـەڵکو کـار بـۆ ئـەوە دەکـا چـۆن دەتوانـێ گومـان لەسـەر هـەر کەسـێك دروست بکا و چـۆن دەتوانـێ گومـان بکاتـە ڕاسـتی و مـرۆڤ لـە کەسـێکی بێوەیـەوە بکاتـە تاوانبـارێکی ترسـناك. ئەگەر لـەو پێناوەدا خەڵکی بێگوناهیش تێدا بچن ئاســاییە، چــونکە لــەوەدا تاوانیــان هەیــە کــە نـەیانتوانیوە دڵسـۆزی خۆیـان بەشـێوەیەکی ئـەوتۆ بۆ ڕژێم بسەلمێنن کە گومانیان نەچێتە سـەر. لـەم نێوەنـــدەدا گومـــان دەچێتەســـەر هـــەموو ئـــەو هونەرمەنــــد و ڕۆشــــنبیرانەی کــــە توانــــای بیرکردنـەوەیان هەیـە، چـونکە بیرکردنـەوە بەهـەر ئاراسـتەیەکدا بـێ، چـەپ بـێ یـان ڕاسـت، تەنانـەت ئەگــەر لەگــەڵ ڕژێمیشــدا نــاکۆك نــەبێ، مرۆڤــی سەربەخۆ دروستدەکا کە ڕەنگە بەئاسانی تێکەڵی حەشـــامەتی جـــەماوەری نـــەبێ و نەچـــێتە ژێـــر کاریگــەریی پروپاگەنــدەی ڕژێــم. لــە پێناســەی پۆلیســی نهێنیــدا ئــەو جــۆرە کەســانە هەمیشــە گومانیـان لەسـەرە، چـونکە "مرۆڤـی گومـانلێکراو بــەپێی ئــەوە پێناســـەیە.. کەســـێکە توانـــای بیرکردنەوەی هەیە"[20].

جگـە لـە پۆلیسـی نهێنـی، ڕژێمـی تۆتالیتـار توێژێکی بـەرفراوان لـە موچـەخۆران دروستدەکا

کــە بەرژەوەنــدیو مانــەوەیان دەبەســتێتەوە بەخۆیـــەوە، ئـــەو توێـــژەش بەرگرییـــەکی سەرســـەختو کوێرانـــە لـــە رژێـــم دەکـــا و دژایەتیـەکی سەرســەختی نـەیارانی رژێمـیش دەکـا. مـەرج نیـە ئـەو موچـەخۆرانە لـەڕووی ئایدیۆلۆجییەوە ئینتمایان بۆ رژێم هەبێ، بەڵکو زیـــاتر بەرژەوەنـــدییان لەگـــەڵ رژێمـــدا یەکدەگرێتـەوەو هەسـتدەکەن بـژێویو ژیـانی ئـەوان بەنـدە بـەبڕینو وێرانکردنـی بـژێویو ژیانی خەڵکانێکی ترەوە. ستالین لەدوای هەموو هەڵمـەتێکی پاکتـاوکردنی دوژمنـانی شـۆڕش هەڵمـەتێکی دامەزرانـدنی ئەنـدامانی حزبـی دەسـتپێدەکرد، هـەروەك چـۆن هیتلـەر کـارێکی وای دەکـرد کاتـێ خـەڵکانێکی زۆر لـە ئـەڵمانیا چـاوەڕێی هەڵمـەتی زیـاتری پاکتـاوکردنی جولەکەکان بوون تـا بەرکـەوتی خۆیـان لە ماڵو موڵـكو کاروپیشـەی قوربانیـەکان بەرکـەوێ، "سەرەنجام ئەم پرۆسەیەش تاکێکی سەرشۆڕو ریسوای ئەوتۆ بەرهەمدێنێ کە تەنها بۆ ئەوەی پارێزگاری لە کارەکەی بکا زۆر دڕندانە بـەرگری لـە رژێم دەکا"(21). ئیدی هـەموو کەسایەتیەکی یاسایی لە مرۆڤ دادەماڵدرێو دەبێ یان جەللاد بـێ یـان قوربـانی، چـونکە یاسـا لـە ژێـر بـاڵی رژێمـی تۆتالیتـاردا دەرفـەتێك ناهێڵێتـەوە بـۆ پاشـگەزبوونەوە یـان کشـانەوە، یاسـا چـەترێك نیـە کـە مافـە پێشـوەختەکانی مـرۆڤ دەسـتەبەر بکـا، بـەڵکو بەخشیشـێکە کـە دەشـێ لـە هـەر چـــرکەیەکدا لێـــی وەربگیردرێتـــەوە، کـــە ترسناکترینیان وەرگرتنەوەی مافی ژیانە. بەڵام کارەســاتی راســتەقینە لەوەدایــە جیــاوازیی راستەقینە نیـە لـەنێوان مرۆڤێکدا کە مافەکەی لـــێ زەوتـــدەکرێو مرۆڤێـــك کـــە مافەکـــەی پێدەبەخشرێ، چونکە بەخشینێکە بەند نیە بە کەرامـەتی مرۆڤـەوە، بـەڵکو بەنـدە بەویسـتو مەزاجی دەسەڵاتدارانەوە.

هــەروەك چــۆن رژێمــی تۆتالیتــار بوارێــك ناهێڵێتـەوە بـۆ ژیـانی تایبـەتی مـرۆڤ، بەهـەمان شـێوە بـوارێکیش ناهێڵێتـەوە بـۆ کشـانەوە لـەو بڕیـارەی کـە مـرۆڤ یـان دەبـێ بکـوژ بـێ یـان کـوژراو، یـان جـەللاد بـێ یـان قوربـانی. لـە چوارچێوەی دەوڵەتدا دەبێ مرۆڤ یان لە ریـزی شۆڕشو دەسـەڵاتدا بێو بەجۆرێك لـەجۆرەکان بەشـداری لـە قەتڵوعامـدا بکـاو پاسـاوی بـۆ بێنێتـەوە، یـان دەبـێ لـە ریـزی دوژمنـان بـێو بەمـەرگ سـزا بـدرێ یـان لـە چاوەڕوانی مەرگدا بـێ. هەنـدێ جـار هـەمان رەفتـار لـەناو یـەك خێزانیشدا پێڕەودەکرا کاتێ باوك ناچاردەکرا لـەنێوان کوڕەکـانی خۆیـدا یـەکێکیان هەڵبـژێرێ بۆ مەرگ، واتە هەرچەندە رژێم دەیتوانی خۆی ئـەو بڕیـارە لـەجیاتی باوکەکـە بـداو خـۆی شوناسی قوربانیەکە هەڵبژێرێ، بەڵام دەیویست خـــوێنی قوربانیـــەکان ببەشـــێتەوە بەســـەر هەموانـداو کۆپییـەکی وێنـەی خـۆی لـە هـەموو شـوێنێك ئامـادەیی هـەبێ. ئـیتر لـە دۆخێکـی سـایکۆپاتی ئاوهـادا سـنوری جیاوازییـەکانی نێـوان بکـوژو کوژراوەکـان زۆر کاڵدەبێتـەوە، چـونکە ئـەوەی کـە دەبـوو (بکـوژ) بـێ هـەموو توانایـەکی بـەرەنگاریی لەدەستدەداو بەوپـەڕی کۆیلایەتیـــەوە، وەك جەســـتەیەکی بـــێئیرادە قوربانیـــەکانی دەکوشـــت، بگـــرە خـــودی قوربانیـــەکانیش ئـــیرادەی بەرەنگاربوونـــەوەی مـەرگیان لەدەستدەداو زۆر بەئاسـانی تەسلیمی

بکوژەکانیـــان دەبـــوون، وەك ئـــەوەی بڕیـــاری کوشتنیان بڕیارێکی تـەواو بێ و پێویست نـەکا خۆیـــان راپســـکێنن، یـــان لـــە دوا پەلەقاژێـــدا هەوڵبدەن لە مەرگ هەڵبێن. لەم قۆناغەدا "مرۆڤ جگـە لـە بوکەڵەیـەك بـە روخسـاری مرۆڤانـەوە شـتێکی دی نامێنێتـەوەو هـەموویان چەشـنی سەگەکەی پاڤلۆڤ رەفتاردەکەن"[22]. چونکە دوا ئامـانجی رژێمـی تۆتالیتـار ئەوەیـە کـە مـرۆڤ بەتاڵبکاتـەوە لـە هـەر شوناسـێکی مرۆڤبـوون و ناچـاری بکـا خـۆی بـۆ خـۆی رۆڵـی پـۆلیس و جـەللادی خـۆی ببینـێ. ئەڵبەتـە ئـەو مەرامـەی رژێمی تۆتالیتاریش تەنها ئەو کاتە دێتەدی کە مرۆڤ لە بونەوەرێکی خاوەن پێناسەی یاسایی و ئەخلاقییـــەوە ببێتـــە بوونـــەوەرێکی خـــاوەن ئامادەیی بۆ جێبەجێکردنی هەر فەرمانێك و بۆ وەرگرتنـــی هـــەر ماهیـــەتێك کـــە کەســـێکی تـــر پێیدەبەخشێ.

هانـــا ئارانێـــت لـــە ئاماژەیـــەکی گرنگـــدا دەرکەوتنی تۆتالیتاریزم لەسەر هەردوو ئاستی کۆمەڵایـەتی و فیکری دەبەستێتەوە بەو تەنگژە ئەخلاقییـەوە کـە مرۆڤـی چاخی دیکتاتۆریـەتی ئەقڵ و زانست، واتە مرۆڤی پاش چاخی ئیمانی مەســیحی تێیکـــەوت. لەســـەدەی بیســـتەمدا مرۆڤـی ئـەورووپی بـڕوای بـەوە نـەما سـزایەکی یـەزدانی هـەبێ بـۆ ئەوانـەی کـە گوناهبـارن، هەربۆیـە هەوڵیـدا خـۆی ئـەو کـارە بکـا و خـۆی ببێتـە جێنشـینی یـەزدان، بـەڵام بـۆی دەرکـەوت ئـەو لـە خوایەتیەکەیدا تـەنها توانـای سـزادانی هەیـە و توانـای پاداشـت و هێنانـەدیی مـوژدەی بەهەشـتی نیـە. واتـە مرۆڤـی هاوچـەرخ ترسـی ئـەوەی لەدەست دا کـە یـەزدان بـەدۆزەخ سـزای بدا، بـەڵام لەهـەمان کاتدا ئومێدی بـەوەش نـەما کە بە بەهەشت پاداشت بکرێ. یان وەك ئارێنت دەڵێ: خراپترین شتی لەدەست دا کە "ترس" بوو..، باشترین شتیشی لەدەست دا کە "هیواو ئومێد بوو"[23].

لە کۆتاییدا دەکرێ بڵێین هەرچەندە خاتو ئارێنت لـە بەشی هـەرە زۆری لێکۆڵینەوەکەیدا رژێمـی بۆلشـەفیکی سـۆڤێتی و نازیزیسـتی ئەڵمانی وەك دوو نمونەی زەقی تۆتالیتاریزمی خۆرئـاوایی بـاس دەکا کـە ئەڵبەتـە حـاڵی حـاز بەسـەر چـوون و چـوونەتە مێـژووەوە، بـەڵام تۆتالیتـاریزم وەك ئایدیۆلۆجیایـەکی لێکـدراو و رژێمێکی بێئەدگار هەمیشە مەترسییەکە لەسەر پێیە، کە دەبێ لەسـەر هـەردوو ئاستی فیکری-تیۆریی و هۆشیاری سیاسی بەرەنگاری بکرێ و پـەی بـە خەتـەری زیندووبوونـەوەی بـبرێ[24].

گـــرنگترین بەرەنگاربوونـــەوەی تۆتالیتـــاریزم لەسەر ئاستی فیکری بریتیـە لـە لێکۆڵینـەوە و ناسـینی زیـاتری تۆتالیتـاریزم، بەتایبـەتی لـە دەرەوەی جیهانی خۆرئاوا کە تا ئێستا نمونەی چـەندین رژێمـی تۆتالیتـار زینـدووەو ئەگـەری ئەوەش لەئارادایە کە رژێمگەلێکی تریش بەرەو پێڕەوکردنـــی سیســـتێمی تۆتالیتـــاری هـەنگاوبنێن. بـەبێ ناسـینی تۆتالیتـاریزم لـەو لۆجیکـە ترسـناکەی سیاسـەت و فـەرمانڕەوای دەسـەڵاتگەر تێناگـەین کـە لەهـەوڵی بـەردەوامی سـاناکردنەوەی کێشـە سیاسیەکاندایە و جیهان بەسەر دوو بەرەی دۆستان و دوژمناندا دابەش دەکـا، یـان ئـەو لۆجیکـەی کـە لەسـەر دوانـەی مـوژدە و تـرس دامـەزراوە و هەمیشـە بـە دۆزەخ هەڕەشە لە نەیارانی دەکا و موژدەی بەهەشتیش

دەدا بـە پێڕەوانـی خـۆی. بـەڵام لەسـەر زەمینـی واقـع پێڕەوانیشـی جگـە لـە پاسـەوانی دۆزەخ و بەندیخانـەکان و جێبـەجێکردنی هەڵمەتـەکانی کوشـتن و قـەتڵوعام هـیچ ئیمتیـازێکی تریـان پێنابڕێ.

## پەراوێزەکان:

(1) بنـەماکانی تۆتالیتـاریزم، بەشـی چـوارەم، ل 386.

(2) بنـەماکانی تۆتالیتـاریزم، بەشـی چـوارەم، ل 393.

(3) لەمبارەیـەوە بڕوانـە: بنـەماکانی تۆتالیتـاریزم، بەشی چوارەم، ل397.

(4) دەربـارەی (بەئایـدیۆلۆجیاکردنی فەلسـەفە) ریمـۆن ئارۆن نمونەیەك دێنێتەوەو دەڵێ: کاتێ دەقە فەلسەفیەکانی مارکس و ئینگڵس دەربارەی پەیوەندیی یەکتەواوکەری نێوان هونـەر و ژینگـەی کۆمەڵایـەتی تەرجەمـەدەکرێن بـۆ زمـانێکی ئایـدیۆلۆجیی پـەتی ئیتر ئاراسـتەیەکی تۆتالیتـار وەردەگرن. لەکاتێکدا ئـەو دوو فەیلەسوفە لـە دەقەکانیانـدا باسیان لـەوە نـەکردووە کـە ئایـا دەبـێ مۆزیـك و نیگارکێشـی لـە دەوڵـەتی سۆسیالیسـتیدا چۆن بێ و چۆن نـەبێ. بڕوانـە: ریمـون أرون، دموکراسـی و خودکـامگی: جامعـه شناسـی و جامعـه شناسـی صـنعتی، ت: محمـد مشـایخی. چـ1، 1377، تهـران: شـرکت سهامی انتشار، ص221.

(5) لـە کتێبـی "کۆمەڵگـەی کـراوەو دوژمنـەکانی"دا کـارل پۆپـەر پێیوایـە بەرنامـەی ئـەفلاتۆن لـە "کۆمـار"دا بەرنامەیـەکی گشـتگیرو تۆتالیتـارە، بەتایبـەتی لـەو شـوێنەدا کـە ڕەعیـەتی کۆمـار بەسـەر چـەند چینێکی جێگیردا دابەشـدەکاو هاوشوناسـی دەسـازێنی لـەنێوان دەوڵـەت و نوخبـەی دەسـەڵاتداراندا، پاشـان شـەرعیەت دەبەخشێ بە چینی دەسەڵاتدار تا چاودێری بەردەوامی مەحکومـەکان بکـا. لەوبارەیـەوە پۆپـەر پشتدەبەستێ بـە تێـزی چـەند لێکۆڵیارێـك، کـە یـەکێك لەوانـە تێزێکـی بەراوردکارییـە کـە *C. E. M. Joad* ئامـادەی کـردووەو تیایدا لێکچوون لـەنێوان بەرنامـەی ئـەفلاتۆن و بەرنامـەی فاشیزمدا دەدۆزێتەوە، سەرەنجام ئاماژە دەدا بـەوەی کـە هەڵمـەتی ئـەفلاتۆن دژی خـەونی ئـازادبوونی مـرۆڤ لـە جـەبرە جـێگیرو ئایدیاڵـەکان یەکێکـە لـە سـەرەتاییترین هەڵمـەتی مێـژووی فیکـری مرۆڤایـەتی دژی ئەندێشـەی لیـبراڵ و ئازادیخوازانـە. بڕوانـە: کـارل بـوبر، جامعـه بـاز ودشمنـان ان، ت: عـزت فولادونـد. چـ2، 1377. تهـران: شرکت سهامی انتشارات خوارزمی، ص255–257.

(6) بڕوانـە: حنـة أرنـدت، في العنـف، ت: ابـراهیم العریس. ط1، بیروت: دار الساقي، 1992، ص5.

(7) بنـەماکانی تۆتالیتـاریزم، بەشـی چـوارەم، ل 401.

(8) بنـەماکانی تۆتالیتـاریزم، بەشـی چـوارەم، ل 401.

(9) بڕوانە: بنەماکانی تۆتالیتاریزم، بەشی چوارەم، ل 404.

(10) بنەماکانی تۆتالیتاریزم، بەشی یەکەم، ل 81.

(11) فـرانتس نۆیمـان لەمبارەیـەوە ئامـاژە دەدا بـەوەی کـە تۆتالیتـاریزم هێزێکـە بـۆ یەکسـانکردنەوەی کۆمەڵگـە بەدەسـەڵاتی سیاسـی، چـونکە پـاش ئـەوەی هێزی تۆتالیتار دەسەڵات دەگرێتەدەست ئیتر دەوڵـەت و نوخبەی دەسەڵاتدارو کۆمەڵگە لەیەکدی جیاناکرێنەوەو سـەرلەبەری کۆمەڵگـە بـە خەسـڵەتەکانی دەسـەڵاتی سیاسی موتوربەدەکرێ. بڕوانە: فرانتس نویمان، ازادی وقـدرت وقـانون، ت: عـزت الله فولادونـد. چـ1، ترهـان: شرکت سهامی انتشارات خوارزمی، 1373، ص342.

(12) بنەماکانی تۆتالیتاریزم، بەشی یەکەم، ل 94 .

(13) بڕوانە: بنەماکانی تۆتالیتاریزم، بەشی یەکەم، ل 105.

(14) بنەماکانی تۆتالیتاریزم، بەشی دووەم، ل 141.

(15) لێرەدا هانا ئارێنت دوو قسەی هیتلەرو ستالین بەنمونە وەردەگرێ کە کتومت لەیەك دەچەن، بەڵام بەدوو گوتاری ئایدیۆلۆجی جیاواز. هیتلەر دەڵێ: "تا زانیاریمان لەسەر یاساکانی سروشت و ژیان زیاتر بێت و پێڕەوی لێبکەین، زیاتر گوێڕایەڵی ویستە بەتوانا باڵاکان دەبین، تا زانیاری زیاتریش لەسەر ویستە بەتوانا باڵاکانیش پەیدا بکەین سەرکەوتنەکانمان مەزنتر دەبن".

ستالینیش بە نەغمەیەکی هاوشێوە دەڵێ: "تا تێگەیشتنمان لەسەر یاساکانی مێژوو، ململانێی چینایەتی و پشکنینیان زیاتر بێت، زیاتر دەتوانین خۆمان لەگەڵ مادیەتی دیالیکتیکیدا بگونجێنین، تا زانیاریشمان لەسەر مادیەتی دیالیکتیك زیاتر بێ سەرکەوتنەکانمان مەزنتر دەبن". بڕوانە: بەشی دووەم، ل 142.

(16) بنەماکانی تۆتالیتاریزم، بەشی دووەم، ل 175.

(17) بنەماکانی تۆتالیتاریزم، بەشی دووەم، ل 195.

(18) بنەماکانی تۆتالیتاریزم، بەشی سێیەم، ل 238.

(19) ستیڤن رۆبێرتس، "ئەو خانوەی هیتلەر دروستی کرد"، لە هانا ئارێنتەوە، ل350.

(20) بنەماکانی تۆتالیتاریزم، بەشی سێیەم، ل 290.

(21) بنەماکانی تۆتالیتاریزم، بەشی سێیەم، ل 293.

(22) بنەماکانی تۆتالیتاریزم، بەشی سێیەم، ل 335.

(23) بنەماکانی تۆتالیتاریزم، بەشی سێیەم، ل 320.

(24) لە کتێبێکیدا بەناونیشانی "راسیزمو کۆمەڵگا" جۆن سۆڵماس و لێس باك ئاماژە بۆ خەتەری زیندوبوونەوەی تەوژمی رەگەزپەرستی دەکەن لە دنیای نوێدا، تەنانەت لە کۆمەڵگە ئەوروپیە مۆدێرنەکانیشدا. بەشێك لە هۆکارەکانی ئەو دیاردەیەش دەگەڕێننەوە بۆ کۆچی بەلێشاوی رەگەزە نائەوروپییەکان بۆ ئەو وڵاتانە، کە وای کردووە دژایەتیکردنی کۆچ و پاراستنی شوناسی ئیتنی نەتەوە ئەوروپییەکان بچێتە بەرنامەی سیاسیی زۆربەی حزبەکانەوە. بڕوانە:

*John Solomos & Les Back, Racism and Society. London: conjunction with the British sociological association, 1996, p.85.*

# دیالۆگی کلتورەکان لەبری دیالۆگی شارستانیەتەکان

## چاوپێکەوتنێك لەگەڵ د. عبدالکریم سروش

**لە ئینگلیزییەوە: د. هادی محمد**

کاتێك سەرۆك محەمەد خاتەمی پێشنیاری بیرۆکەی دیالۆگی شارستانیەتەکانی کرد، ئەوە جۆرێك لە پەرچەکردار بوو لە بەرامبەر بیرۆکەی پێکدادانی شارستانیەتەکان. پێکدادانی شارستانیەتەکان *clash of civilizations* یەکەم جار لەلایەن بێرنارد لویس *Bernard lewis* پرۆفیسۆر لە زانکۆی پریستۆن ناوی هێنراوەو تەنها وەکو بیرۆکەیەك پێشنیاری کردووەو لە ڕاستیدا بە ووردی شیکردنەوەی بۆ نەکردووە. دواتر، سامویێل هنتنگتۆن پرۆفیسۆر لە زانکۆی هارڤەرد بەدواداچوونی بۆ کردووەو ڕەهەندی سیاسی و تەنانەت سەربازیشی پێبەخشیوە. مەقالەیەکی لەسەر بابەتەکە نووسی و پاشانیش لە چوارچێوەی کتێبێکدا درێژەی تیۆریاکەی خستەڕوو. بەڵام پێکدادانی شارستانیەتەکان سەرنجێکی زۆری لە ولایەتە یەکگرتووەکان و زۆربەی وڵاتە ئەوروپییەکان بەلای خۆیدا ڕاکێشا. پاشانیش بەڕێز محەمەد خاتەمی تیۆرییەکەی خۆی پێشنیار کرد وەکو پەرچەکردارێك و شێوازێکی دژوەستانەوەی ئەو تیۆرییەی هنتنگتۆن و وشەی پێکدادانی *clash* گۆڕی بە ووشەی دیالۆگ *Dialogue*. ڕۆژئاواییەکان بیرۆکەی پێکدادانی شارستانییەتەکانیان بە جدی وەرگرت و ژمارەیەك لە وەزارەتەکانی دەرەوە کاری جدییان لەسەر کرد. تەنانەت لە یادمە چەند ساڵێك لەمەوپێش وەزارەتی دەرەوەی ئەڵمانیا سمینارێکی گەورەی ڕێکخست بۆ گفتوگۆکردن و لێکۆڵینەوەی ئەو تیۆریە بەڵام ئەم سمینارە جێگەی خۆی نەگرت! ئەوان دەیانەویست بزانن پێکدادانێکی لەو جۆرە چەندە جێگەی مەترسییە بۆ ئەوەی بتوان لەسەر ئەو بنەمایە سیاسەتی دەرەوەی خۆیان هەڵسەنگێنن و ڕێکیخەنەوە.

ئەم لێدوانانەی سەرەوە بەشێکن لە سەرنجەکانی د. عبدالکریم سروش لە

چـاوپێکەتنێکدا لەگـەڵ بەشـی دیالۆگی شارستانییەتەکانی ئاژانسی هەواڵی قوتابیانی ئێرانـی، لـە چـاوپێکەوتنەکەدا کـە لـە بـارەی بیرۆکەی "دیالۆگی شارستانییەتەکانەوە" بوو، سروش پێشنیاری ئەوەی کرد لەبری "دیالۆگی شارسـتانییەتەکان"، "دیالۆگی کلتورەکـان" بـەکاربهێنرێت شـتێکی کردەیـی تـر و گشتگیرترە.

*ڕۆژئـاوا ئەوەنـدەی تیۆریـەی پێکـدادانی شارستانییەتەکانی بـە جدی گرتـووە، ئەوەنـدە تیۆریەی دیالۆگی شارستانیەتەکانی بـە جدی نەگرتووە..

د. سروش ووتـی: "وا دەردەکەوێت رۆژئـاوا ئەوەنـدەی تیۆریـەی پێکـدادانی شارسـتانییەتەکانی بـە جـدی وەرگرتـووە، ئەوەندە تیۆریـەی دیالۆگی شارستانییەتەکانی بە جدی وەرنەگرتووە و پرسی پێکدادان هێشتا بەلایانـەوە زۆر گرنگـە بـە تایبـەتی پـاش ڕووداوەکـانی 11 سـێپتەمبەر، لـەو کاتـەدا بابەتەکـە زیـاتر جـدی بـوو و سـەرنجێکی زیاتریشـی بـەلای خۆیـدا ڕاکێشا، تەنانـەت لـە زەیـنی خەڵکـە گشـتییەکەی رۆژئـاوادا جێگـەی خۆی گرت. گوایا پێکدادانێکی خوێناوی زووتر یـاخود درەنگـتر لـە نێـوان شارسـتانییەتەکاندا ڕوودەدات بەتایبـەتی هـەردوو شارسـتانییەتی ئیسلام و رۆژئاوا"..

*باشـتروایە قسـە لـەبارەی دیالۆگی کلتورەکانەوە بکەین:

د. سروش ووتـی: "خۆم بیرم لەم مەسەلەیە کردۆتـەوە کـە بۆچـی دەبێـت ئێمـە قسـە لـە دیالۆگی شارسـتانییەتەکان بکـەین نـەوەك لـە دیالۆگی کلتورەکان؟

زاراوەکـانی شارسـتانییەت *civilization* و کلتور *culture* لە سەردەمی نوێدا مانای تایبەت بـە خۆیـان هەیـە. ئەوانـەی زاراوەی "شارسـتانییەت"یـان داهێنـا، هـەر ئـەوانیش زاراوەی "کلتـور"یـان بـەکارهێنا. هـیچ کـام لـەم زاراوانە لەلایەن بیریاران و فەیلەسوفانی ئێمەوە دانـەهێنراون. لـە ئـەوروپا، بەتایبـەت، مێژوونوسـەکان زاراوەکـانی "کلتـور" و "شارسـتانییەت"یـان داهێنـا بـۆ دەربـڕین و ڕونکردنەوەی ژمارەیەك پەرەسەندن و دیاردەی مێژوویی، دوای ئەوە ئەم زاراوانە بەشێوەیەکی بەرفراوان بـەکارهاتن. ئێمە بەشێوەیەکی ڕاست و دروسـت ئـەم زاراوانـەمان وەرگێڕاوەتـە سـەر هاوتا فارسییەکانیان بـەڵام پێویستە لـە یادمان بێـت کـە ئـەم دوو زاراوەیـە لـەلای ئێمـەو لـە ترادسـیۆنی ئێمـەدا تەمـەنێکی درێـژیان نییـە، لەبەرئەوە پێویستە ئێمە بە هەمان مانا بـەکاریان بهێنین کە ئێستا لە شوێنی لەدایکبونی خۆیاندا بەکاردەهێنرێن واتە رۆژئاوا.

ئـەو خاڵـە سـەرەکییەی کـە مـن دەمـەوێت ئامـاژەی پـێ بکـەم ئەوەیـە کـە باشـتر دەبـوو و باشتریش دەبێت ئەگەر قسە لـەبارەی دیالۆگی کلتورەکانـەوە بکـەین چونکە شارسـتانییەتەکان لـە بنەڕەتـدا قوناغگـەلێکی وەسـتاوی کلتـورن. کلتورێـك پێـی دەوترێـت کلتـور کـە لـە گەشەسـەندندا بێـت و جـوڵاوو لەبەرڕۆیشـتووبێت وەکـو ڕووبـار و هـەروەها بەپیت و بەرهەمدار بێت.

شپینگەر *spengler* کاتێك گفتوگۆی بابەتی شارستانییەتەکانی کرد زۆر جەختی لەسەر ئەم خاڵە کردۆتەوە. کاتێك کلتورێك دروست بووەو نزیك دەبێتەوە لە قۆناغەکانی کۆتایی خۆیی، ئەو کاتە دەبێتە دۆخێکی وەستاوو دادەمەزرێت و جێگیر دەبێت، ئەو کاتە پێی دەوترێت شارستانییەت. هەر لە خودی پێناسەی شارستانییەتەکانەوە، ئاشکرایە کە شارستانییەتەکان بەیەکدادەدەن چونکە شارستانییەتەکان شوناسن *Identities* و بێگومانیش شووناسەکانیش دیوی ناکۆکییان لەگەڵ یەکدیدا زۆرە و شیاوی جەنگ کردن و پێکدادانن. هەریەکەیان دەیەوێت زاڵ بێت بەسەر ئەوانی تردا، لە کاتێکدا کلتورەکان بەو شێوەیە نین.

*پێویستە قسە لە دیالۆگی کلتورەکان بکەین لە بری دیالۆگی شارستانییەتەکان

د. سروش ووتی: "شارستانییەتەکان وەکو پاشاکان وەهان و بە گوتەی شاعیری گەورەمان سەعدی: دوو پاشا بەیەکەوە لە یەك نیشتماندا هەڵناکەن، هەریەکەیان هەوڵدەدات ئەوی دیکەیان بکاتە دەرەوەو ببێتە تاکە بەرپرسی هەموو شتێك. لە کاتێکدا کلتورەکان وەکو کەسانی ئاسایی وەهان و دەتوانن هاوڕێ بن و ئازیز و خۆشەویستی یەکدی بن. تەنانەت ئەگەر جار جارێکیش وەکو دوژمن ڕەفتار بکەن، دوژمنایەتییەکەیان شتێکی تێپەڕە. پێموایە بە پلەی یەکەم باشتر وایە زاراوەی "کلتورەکان" بەکاربهێنین لە بری زاراوەی "شارستانییەتەکان"، پاشانیش دەتوانین قسە لە دیالۆگی ئایینەکانیش بکەین چونکە ئاینەکان بەشێکن لە کلتور و لەبەر ڕۆیشتوویی و گۆڕانی بەردەوامیان پێخۆشە و لەگەڵیدا دێنەوە، دەشتوانن بەردەوام بگۆڕێن و گەشە بکەن..

*دیالۆگی کلتورەکان هەمیشە لەبەرڕۆیشتووە.

دیالۆگی کلتورەکان هەمیشە لەبەرڕۆیشتوو بووە و ئەمڕۆش لەبەر ڕۆیشتووەو لەگەشەسەندندایە. بێگومان ئەم دیالۆگە دەکرێت پوختەتر و هاوڕێیانەتر و ڕێنیشاندەرتر بێت و ئەوە ڕەچاو بکرێت کە کلتورەکان لە ڕاستیدا دەتوانن یارمەتی یەکدی بدەن و دانوستان و هەڵسوکەوتی مرۆڤانەتریان لەگەڵ یەکدیدا هەبێت، لێرەوە دەتوانن داهاتوویەکی باشتر بڕەخسێنن.

*گرنگترین کارێك بۆ مرۆڤایەتی جێهێڵرابێت، دیالۆگکردنە

د. سروش ووتی: پێگەی کلتورەکان لەم دیالۆگەدا لەلایەن هەژاری و دەوڵەمەندییانەوە دیاری دەکرێت: "ئەو کلتورەی دەوڵەمەندترە، زیاتری هەیە بۆ ووتن، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا، کلتورەکان دەتوانن بەیەکەوە دابنیشن و دیالۆگ بکەن. ئەو کەسانەی ئەم دیالۆگە لە نێوان کلتورەکاندا سازدەکەن کەسانێکن کە خۆیان کلتور پەروەر و ئەهلی کلتور و هەڵگری کلتورن. ئەم کەسانەش دەشێت فەیلەسوفەکان و مێژوونووسەکان و هونەرمەندەکان و روحانییەکان و ... بگرێتەوە، دیالۆگی نێوان

ڕوحانییـــەکان دایـــالۆگێکی کاریگـــەری نێـــوان ئایینەکانــە. بــاوەڕم وایـــە گـــرنگترین کارێـــك بـــۆ مرۆڤایــەتی بــەجێهێڵرابێت، دیالۆگکردنــە، هـــیچ شـــتێك هێنـــدەی ئـــەم کـــارە بـــالآتر و بەرهەمدارتر نییە.

هەروەها ووتی "ئەو پێشگریمانەیەی کە لە پشت بیرۆکەی دایالۆگی کلتورەکانەوەیە ئەوەیە کـە پلـەی بـالآتر و زاڵـتر بـۆ کلتورەکانـە نـەك تەکنـــەلۆژیا و ســـەروەت و ســـامانو هێـــزی سەربازی. "هێزی سەربازی بوونی هەیە و کەس ئینکـاری ئەمــە ناکـات، وولآتانێـك هــەن لــە ڕوانگەی سەروەت و سامانی ماددییەوە لە ئێمە بەهێزترن و کـەس گومـانی لەمـە نییـە. بـەلآم وا کەوتۆتەوە کە ئەمانە دەرکەوتـەی جوانی کلتـور یـاخود شارستانییەت نین و دوا قسە بۆ ئەمان نییـــە. ئەگـــەر ئێمـــە لـــە بـــارەی گەردونایـــەتی (جیهـانی بـوونی) مافـەکانی مرۆڤـەوە لـەمرۆدا قســـە بکـــەین، پێویســـتە لـــەبیرمان بێـــت کـــە مافـەکانی مـرۆڤ بەهـەر جۆرێـك بێـت بەرهـەمی ئیدارەی بۆش و ڕیگان نەبوون، مافەکانی مرۆڤ بـــە درێـــژایی چـــەندان ســـەدە لەلایـــەن فەیلەســـووفانەوە کاریـــان بـــۆ کـــراوەو بەرهـــەم هـاتوون و ئـەمڕۆش ئـەم بالآییـە گەردونییـەیان بەدەست هێنـاوەو گەیشتۆتە ئاستێك کـە بۆتـە زمـانێکی نێودەوڵـەتی و هـەمووومان بـەم زمانـە قسە لەگـەڵ یەکدا دەکـەین. ئەمەشتێکە هەموو کلتورەکـــان و شارســـتانییەتەکان خوازیـــاری ئـەوەن. هـەمان ئـەم قسانە دەتوانرێـت لـەبارەی زۆر شتی دیکەوە بووترێت و دەتـوانن ببینن لە ڕاستیدا هزر و کلتور بڕیار لـەم شتانە دەدەن و قسەی یەکەم بۆ ئەوانە..

★پێویسـتە بـە کلتـور لەگـەڵ تەکنـەلۆژیای بەکاربەرو زیادەڕەوو سنوور بەزێندا بجەنگین

د. سـرووش ووتـی: "تێبینـی بکـەن، مـارکس فەیلەسوف و کۆمەڵناس بوو، هـەروەکو زۆربـەی هاوفکرەکانی بەو شێوەیە بوون. دەتوانن ببینن چـۆن ئـەوان ئـەو واقعـەیان لـە ڕۆژئـاوا گـۆڕی و بەربـەرەکانیکارێکی گـەورەیان بـۆ کـەپیتالیزم دروســـت کــــرد. بێگومـــان کەموکورتیـــە ناوخۆییـەکانی وایـان لێکـرد هـەرەس بهێنێـت، هەرچـــەندە ئـــەم هەرســـهێنانە گشـــتگیر و سەرتاسـەری نـەبوو. ئـەوەی دەمهـەوێت بیڵـێم ئەوەیە کە لە ڕاستیدا ئەوە کلتورەکانن دەبێت گفتوگۆ پێکـەوە بکـەن و بچنە دایالۆگـەوە. هـەر لـەم ڕێگەیـەوە زۆربـەی شتە شاراوەکان ئاشکرا دەبـــن: ئـــەو شـــتانەی پـــەردەی تەکنـــەلۆژیا دایپۆشـیون. چـەندان پـەردەو دەمامـك ئێسـتا دروسـت بـوون کـە زۆر شـتی جـوان و سـامانی ڕاســـــتەقینەیان شـــــاردۆتەوەو ڕێگـــــای خۆبـەیانکردنیان لێگرتـوون. ئەوانـە شـتگەلێکن پێویســتە ئاشـکرا بکـرێن و بهێنرێنــە ئاسـتی بیـــنین بـــۆ ڕێگـــرتن لـــە زیادەڕەوییـــەکانی تەکنەلۆژیا و هاوشێوەکانی.."

د. سـرووش ووتـی: ئـەو دەسـت و مێشـکەی تەکنــەلۆژیا دروســت دەکــات و بــەکاردەهێنێت پێویســتە لــە ژێــر کــۆنترۆڵی کلتـــوردا بێـــت، هــەروەها ووتیشـــی "ئەگـــەر ئێـــوە ئـــەم جـــۆری کۆنترۆڵــە بگـــۆڕن و بەشـــتێکی دیکـــە شـــوێنی بگرنـەوە، دەرەنجـامێکی تـەواو باشـتر بەدەسـت دەهێـنن. نـاتوانن بـە تەکنـەلۆژیا جـەنگ لەگـەڵ تەکنەلۆژیادا بکەن چونکە ئەم کارە دەبێتە هـۆی گەشــەکردنێکی زۆر مەترســیداری تەکنـــەلۆژیا

خۆی. پێویستە بە کلتور لەگەڵ تەکنەلۆژیای بەکاربەر و زیادەڕەوو توندوتیژدا بجەنگن، ئەوکاتە دەتوانن تەکنەلۆژیا لە شوێنی ڕاستەقینەی خۆیدا دابنێن. لەبەرئەوە پێم وایە ئێستا باشترین کاتە بۆ دەستپێکردنی کارێکی لەو شێوەیە، لە ڕاستیدا کەمێك درەنگە...

⋆پێویستە لە جیهانی ئیسلامدا دیالۆگی ناو – کلتوری دەست پێ بکەین.

د. سروش ووتی: "بۆ ئەوەی بیرۆکەی دیالۆگی کلتورەکان مانا پەیدا بکات و بە دوور بێت لەوەی کە تەنها دروشمێك بێت ئەوا دەبێت دیالۆگی ناو – کلتوری *Intra-cultural* لە جیهانی ئیسلام خۆیدا دەست پێ بکەین."

"پەنجە دەخەمە سەر کەم و کورتی و نەخۆشییەك کە ئەمڕۆ ئێمە پێوەی دەناڵێنین. جیهانی ئیسلام پارچە و بەشی جیاوازی زۆرە، واتە ئیسلامی ئێرانی، ئیسلامی تورکی، ئیسلامی ئندۆنیسی، ئیسلامی عەرەب.. هتد. بەداخەوە ئەم پارچە جیاوازانە تەواوبێئاگان لەیەکدی. کاتێك دەچم بۆ تورکیا، دەبینم ئەوان زانیاری کەمیان هەیە لەبارەی پەرەسەندنەکانی ئێران و کلتوری ئێرانی ئیسلامی و ئیسلامی ئێران.

کاتێك دێمەوە ئێران دەبینم ئێمەی ئێرانی زانیاری باشمان نییە لەبارەی گەشەکردنەکانی کلتوری تورکییەوە. هەروەها بۆ ئندۆنیسیا و جیهانی عەرەبیش.. هتد. ئەم ڕاستییە تاڵە شایانی سەرنجدانە. ئێمە لە ڕابردوودا کتێبگەلێکی زۆرمان لە عەرەبییەوە وەردەگێڕایە سەر زمانی فارسی. ئێستا کاری وەرگێڕانمان زۆرر کەم بۆتەوە. دابڕان و لێکترازانێکی کلتوری ڕوویداوە لە نێوان ئێمە و جیهانی عەرەب و ئندۆنیسیا و هندستان و تورکیا و.. هتد.

⋆پێویستە ئاڵوگۆڕ و سەردانی زۆر لە نێوان پارچە جیاوازەکانی ئیسلامدا بێتە کایەوە:

د. سروش ووتی: "قسە لە دیالۆگی کلتورەکان دەکەم و پێشم وایە زۆر کارێکی پێویستە، بەڵام پێویستە بووترێت پێش ئەوەی دیالۆگ دەست پێ بکەین بۆ نموونە لەگەڵ مەسیحیەتدا *Christianity* یاخود ڕۆژئاوادا *west*، پێویستە ئەم دیالۆگە بخەینە ناو کلتوری خۆمانەوە. پێویستە ئاڵوگۆڕ و سەردانی زۆر لە نێوان پارچە جیاوازەکانی ئیسلامدا بێتە کایەوە. بیرمەند پێویستە بتوانێت بە ئازادی لە نێوان ئەم پارچانەدا گەشت بکات. ژمارەیەکی ئێجگار زۆر سمینار پێویستە لە نێوان پارچە جیاوازەکانی ئیسلامدا ساز بکرێت. سەردانی مەراکیشم کرد، لەوێ قسەم بۆ هەندێ پرۆفیسۆر کرد، بۆم دەرکەوت مەعریفەیان لەبارەی شیعە و شیعەگەرییەوە زۆر سادە و کاڵ و کرچە! جێی سەرسوڕمانە چونکە ئەمانە بەشەکانی جیهانی ئیسلامن.

پرۆفیسۆرێك پێویستە زۆر هەستیارتر بێت لە بەرامبەر مەسەلەگەلێکی لەم جۆرە وەك لە خەڵکی ئاسایی. بەڵام لێکترازان و شەق بوونە زەمانەوانییەکان کە ڕەگ و ڕیشەی سیاسی هەیە وای لێکردووین بەشێوەیەکی سەرتاسەریانە بێ ئاگابین لە یەکدی.

★یەکیەتی بەرهەمی بەریەککەوتن و دیالۆگی کلتورییە.

د. سروش ووتی ئەگەر بمانهەوێت یەکیەتییەک *Unity* بەدەست بهێنین، ئەوا لە رێگەی بەریەککەوتن و دیالۆگی کلتورییەوە دروست دەبێت. "سیاسەتمەداران پێویستە کەمترین و لاوازترین رۆڵیان هەبێت لەم کارەدا. کاتێک ئەم مەسەلەیە دەپێچرێتە سیاسەتەوە، هەزار و یەک مەسەلەی دیکە دەچێتە کایەکەوەو مەسەلە بنەڕەتییەکە دەشێوێت و هەموو شتێک لە شوێنی خۆی دەترازێت.

د. سروش جەغدی کرد، یەکەم، پێشنیاری کرد کە ئێمە قسە لە دیالۆگی کلتورەکان دەکەین و دووەمیش دیالۆگی کلتورەکان لە ناو ئێمەی موسڵماندا گەشە پێبدەین و بەردەوامی پێببەخشین. ووتیشی "دیالۆگ لە نێوان ئێمە و مەسیحیەتدا لای من پەسەندە و بێگومانیش ئەم دیالۆگە بەردەوام هەبووەو لەبەرڕۆیشتوو بووە. لە ئێرانیش، خۆم و ژمارەیەک هاورێم دەستمان بەم ئەرکە کردووە. بەڵام جار جارە سیاسەت پێی تێخستووەو بێ نرخی کردووە وەکو پێشتریش ئاماژەم پێدا. هەروەها پێشنیاریش دەکەم کە پێویستە دیالۆگ لە نێوان موسڵمانان و جولەکەکانیشدا هەبێت چونکە وا رێکەوتووە کە یەهودیەت هۆگری زۆر زیاتری هەیە بۆ ئیسلام و نزیکترە لە ئیسلامەوە، هەروەکو دەشزانن، زۆربەی مێژوونووسە رۆژئاواییەکان و تیۆریستە *Thearist* ئاینییەکان زۆر جار ئەوە دەکەنە خاڵێک کە ئیسلام جۆرێک لە ریفۆرمی یەهودیەت بووە. من وەکو موسڵمانێک ئەم خاڵە زەق ناکەمەوە، بەڵام نابێت لەبیرمان بچێت کە لە راستیدا زۆربەی رووەکانی یەهودیەت لە ئیسلامیشدا جێبەجێ دەبن. جولەکەکانیش هەروەکو موسڵمانەکان زەینێکی فقهخوازیان هەیە. بەڵام مەسیحییەکان ئەم زەینەیان نییە. ئێمە وەکو موسڵمانان و سەر نیشینانی کلتوری ئیسلامی، دەترسین کاتێک دەبینین چارەنووسی مەسیحیەت لە جیهانی سێکولار و شارستانییەتی سێکولاردا بەم دۆخەی ئەمڕۆی گەیشتووە. هەوڵدەدەین سود لە ئەزموونی مەسیحیەت وەربگرین چ دیوە ئیجابییەکەی، چ دیوە سلبییەکەی – بۆئەوەی سەرلەنوێ ئەزموونی کەم و کورتیەکانی ئەوان نەکەینەوەو نەکەوینە سەر ئەو رێچکەیەی ئەوان گرتیان و روویان کەوتە سەر شارستانیەتی مۆدێرن، لەبەرئەوە ئێمە بریارێک دەدەین کە لە بەرژەوەندی خۆمان و بەرژەوەندی دینداریەکەمان بێت.."

★دیالۆگی شارستانییەتەکان وەکو دیالۆگی سوپاکانە.

د. سروش ووتی: "ئەگەر بشێت لێکچواندنێک بکەم، ئەوا دەڵێم قسە کردن لە دیالۆگی شارستانییەتەکان وەکو قسە کردن وایە لە دیالۆگی سوپاکان.

سوپاکان *Armies* بۆ ئەوە دروست بوون جەنگ لەگەڵ یەکدیدا بکەن. ئێمە ناتوانین دیالۆگێک بەرقەرارکەین لەنێوان سوپاکاندا، بەڵام دەتوانین قسە لە دیالۆگکردن بکەین لە نێوان زانکۆکاندا. پێویستە سەرنج بدەینە

شوێن و پێگەی دایالۆگ! نامەوێت گەمە بە وشەکان بکەم بەلاّم پێم وایە کاتێك قسە لە دایالۆگی کلتورەکان دەکەین، ماناکە زۆر ڕۆشنتر و پوختتر و ڕوونترە وەك لەوەی قسە لە دایالۆگی شارستانییەتەکان بکەین".

*شوناسەکان هەمیشە سەر بەیەکدادەدەن تاوەکو یەکێکیان دەشکێت:

د. سروش ووتی: "شارستانییەتەکان توێکلّی ڕەقن و ڕووی کلتورەکانیان داپۆشیوە. ئامادەن بۆ جەنگ و دەرپەڕاندنی شارستانییەتەکانی دیکە و زالّ بوون و بالاّیی بەسەر ئەوانی دیکەدا. ئەمەش لەبەرئەوەی شارستانییەتەکان شوناسن و شوناسەکانیش هەمیشە سەر بەیەکدادەدەن تاوەکو یەکێکیان لە کۆتاییدا شکست دێنێت و مەیدانەکە جێدەهێلّێت. جیهانی ڕۆژئاواو شارستانییەتی ڕۆژئاوا بە درێژایی 150 سالّی ڕابردوو بەشێوەیەکی بنەڕەتی بەرهەمهێنەری تیۆریاکانی جەنگ بووە: هەر لە مارکسەوە کە قسەی لە جەنگی چینایەتی کردووەو بە مەکینەی مێژووی وەسف کردووە تاوەکو دەگاتە ساموئیل هنتنگلتۆن کە ئەمڕۆ قسە لە جەنگی شارستانییەتەکان دەکات. هەرکاتێکیش پرسی نەتەوایەتی و ناسیۆنالیزم هاتبێتە پێش، ئەوە هەمیشە پرسی جەنگ بووە..

*دەتوانین کلتورێك پەروەردەکەین بە بەکارهێنانی دایالۆگی کلتورەکان وەکو دروشم.

د. سروش ووتی: "ئەگەر کارێکی زۆر باش ئەنجام بدەین، ئەوا دەرچوونە لە بازنەی جەنگ *war* و دەرنەکەوتنە وەکو جەنگاوەر لەسەر مەیدانی جیهان بەلّکو هەولّدەدەین وەکو هەلّگرانی کلتور و کلتورپەروەر دەرکەوین. بەلاّم بۆ ئەنجامدانی ئەم کارە، پێویستە دروشم و ئالاّیەکی گونجاو هەلّبژێرین، دروشمی گونجاویش بریتییە لە دایالۆگی کلتورەکان نەك دایالۆگی شارستانییەتەکان. لێرەوە دەتوانین ڕێگەیەکی ڕاستتر و ڕۆشنتر بگرین و داهاتوویەکی عەقلاّنیتر بڕەخسێنین".

*موسلّمانان قسەی زیاتریان هەبووە بۆ جیهان.

د. سروش – جەغدی کردەوە کە موسلّمانان پێویستە دایالۆگ دەست پێبکەن و ووتی: "ئەگەر دابنیشن و چاوەڕێ بکەن تاوەکو کاتی دایالۆگ دەگات، لەوانەیە هەرگیز نەگات و زۆر درەنگ گەشە بکات. موسلّمانان قسەی زیاتریان هەبووە بە جیهانی بلّێن. ئێستاش ئەگەر تەکانێك بدەنە بەرخۆیان، زۆر قسەیان هەیە بیلّێن و پێشکەشی بکەن. لە ڕاستیدا زمانی مەعنەویەت دەتوانێت ببێتە زمانی دووەم. لە ڕۆژئاوا، دەبینین زۆرێك لە ڕووناکبیران ڕەخنەی زالّێتی زمانی مافەکان دەکەن، هەرچەندە ئەم زمانە بەتەواوی نەبۆتە زمانێکی گەردونی. ئەوان سنورەکانی زمانی مافەکان دەپشکنن و باوەڕیان وایە کلتور و شارستانیەتی نوێ، کە زمانی مافەکان وەکو زمانی سەرەکی خۆی بەکاردەهێنێت، بە داخەوە کەموکورتی هەیە و پێویستە ڕێگە چارەی سێهەم لەودیو مافەکان و ئەرکەکانەوە بدۆزینەوەو لە ڕێگەیەوە قسە بۆ

یەکدی بکەین. باس و دانوستان لەبارەی فەزیلەت و مەعنەویەتەوە *Spirituality* ئێستا زۆر زیندووە، ئەم باسەش دەتوانرێت لەلایەن جیهانی ئیسلام و موسڵمانانەوە بەکاربهێنرێت.."

★روناکبیرە موسڵمانەکان پێویستە بچنە دیالۆگی نێودەوڵەتییەوە.

د. سروش وتی: "روناکبیرە موسڵمانەکان پێویستە بە باشترین شێوە سوود لەو پاشخانە مەعریفییە وەربگرن کە لەم بوارەدا هەیانەو بچنە دیالۆگی نێودەوڵەتییەوە. لە بارودۆخی هەنووکەدا، ئەگەر بمانهەوێت کاری کلتوری باش ئەنجام بدەین، دەتوانین جێگیرەوەی (بدیل) ئیجابیتر و باشتر لە بەرامبەر مافەکاندا بدۆزینەوە کە هەڵگری دیوە باشەکانی مافەکان بێت بەلام سنورەکانی ئەوی نەبێت. پێویستیشە ئەمە بگۆڕینە سەر زمانێکی جیهانی. دەتوانین پرۆژەی لەم جۆرە پێشکەش بکەین. بێگومان، دەتوانین هەنگاو بنێین و دیالۆگی باشتر دەست پێ بکەین و رێکی بخەین و دەرگایەکی نوێ بکەینەوە. لێرەدا دووپاتی دەکەمەوە پێویستە نەهێڵین دەستی سیاسەتمەداران بگاتە ئەم مەیدانە، ئەگینا ئەم کاروانە هەتا قیامەت بە شەلی دەمێنێتەوە.

★جەنگی بیرۆکەکان دەست پێکردنی دیالۆگە

د. سروش ئەوەشی ووت: "ئێران زۆر کاری هەیە ئەنجامی بدا لەم مەیدانەدا. پێویستە پرۆژەگەلێکی زۆر نامەعقول و ناپێویست نەخەینە ڕوو. پێویستە دیالۆگ لەناوخۆماندا سازبدەین. هەوڵە توندوتیژەکان پێویستە شوێنیان بە دیالۆگ بگیرێتەوە. بە گوتەی کارڵ پۆپەر *karl popper*: ئێمەی مرۆڤ ئاژەڵ نین، ئاژەلان یەکدی دەکوژن بەلام ئێمە تیۆرییەی یەکدی دەکوژین. پێویستە بیرۆکەکانمان پێشکەش بکەین بۆ ئەوەی بتوانن بچنە ناو مەیدانی جەنگەوە و ئەمەش سەرەتای دەستپێکردنی دیالۆگە.

دوای ئەوە، دەتوانین بگەڕێینەوە بۆ جیهانی ئیسلام و مەسیحیەت و یەهودیەت."

**سەرچاوە**

www.drsoroush.com

# پەیدابوونی مۆدێرنەی سیاسی لە وڵاتە یەکگرتووەکان و فەڕەنسا

مۆریس بارییە
لە فارسیەوە: ڕێبین هەردی

هەرچەندە مۆدێرنەی سیاسی بە بەفەرمی ناسینی هەندێك مافی تاکەکەسی لە ئینگلتەرا روویداو هەرچەندە پێشگریمانەی بیریارانی وەك سپینۆزا و لۆك و مۆنتیسکیۆ هەموو ئەوانەی مومکین کردبوو، بەڵام مۆدێرنەی سیاسی لەکۆتایی سەدەی هەژدەهەمدا لەهەردوو وڵاتی یەکگرتووەکان و فەرەنسادا دەرکەوت. بەڵام لەبەرئەوەی هەردوو ئەم وڵاتە لەناو یەك هەلومەرجی یەکساندا نەبوون، مۆدێرنەی سیاسی بەیەك شێوە لەناویاندا بوونی پەیدا نەکرد و سەرەڕای ئەمەش بەهۆی روبەروبونەوەی کۆمەڵێك گرفتی زۆر – دیارە زۆرتر لە فەرەنسا تا لە وڵاتە یەکگرتووەکان_ هەنگاو بە هەنگاو و تەنانەت بە دودڵیەوە رویدا. جگە لەمەش باڵادەستی نمونەی دەوڵەتشاری یۆنانییش، هەندێکجار ئەم گرفتانەی زیاتر دەکرد. بەڵام دواجار دەوڵەتی مۆدێرن پاش زاڵبوون بەسەر ڕێگرەکاندا لە پرۆسەیەکدا کە دوو شێوەی جیاوازی بەخۆیەوە گرت، بەشێوەیەکی هەمیشەیی و کەمتازۆر هاوکات، لەم دوو وڵاتەدا رویدا.

1- وڵاتە یەکگرتووکان و مۆدێرنەی سیاسی:

مۆدێرنەی سیاسی لە ئەمەریکادا دەرئەنجامی قۆناغێك ئامادەکاری و تەدارەکی درێژخایەن، بەڵام چارەنوسساز بوو. زۆربەی کۆچبەرانی ئینگلیزی لە سەرەتای سەدەی حەڤدەوە بەشێوەیەکی فەرمی هەندێك ماف کە بە گرنگیان دەزانی، وەك ئازادی بیروڕا و دینیان بە فەرمی ناسی. چونکە یەکەم کۆچبەران بەهۆی دینەوە، کۆچیان بۆ ئەمەریکا کردبوو. کۆچبەرانی روباری ئایلەند، مەریلەند، نیوجرسی، نیۆیۆرك، کارۆلینای باکوری،

پەنسـلیڤینیا و ماساچۆسـت (لـەنێوان سـاڵی 1647 و 1693دا) و پاشـان کۆچـبەرانی جۆرجیا (لـە سـاڵی 1733دا) ئـەم ئەرکـەیان جێبەجێکرد. ماوەیەکی درەنگتر لە نێوان ساڵی 1776 و 1783دا چـەند هـەرێمێکی ئەمـەریکا ڕاگەیانـدنی مافـەکانیان قبـوڵکرد کـە لـە دەستورەکەیاندا دانرا و ئازادیە بنەڕەتیەکانیان سەلماند: لەم هەرێمانە ڤێرجینیا، پەنسیلڤینیا، دولاوار، مەریلەنـد، کارۆلۆنیـای بـاکوری، ڤۆرمۆنـت، ماساچۆسـت و نیوهەمپشـایر. ڕاگەیاندنی ڤیرجینیا یەکەم ڕاگەیاندن بوو کە لە ژۆینـی سـاڵی 1776دا (واتـە سـاڵێك بـەر لـە ڕاگەیانـدنی سـەربەخۆیی ئەمـەریکا) دەرچـوو. ئـەم ڕاگەیاندنـە بەتایبـەتی جـەخت لـەوە دەکـات "هـەموو مرۆڤـەکان بـەهۆی سروشـتی مرۆیـی خۆیانـەوە، بـە شـێوەیەکی یەکسان ئـازاد و سـەربەخۆن و خـاوەن هەنـدێك مـافی" وەك مـافی ژیـان: ئـازادی، موڵکایـەتی و خۆشـبەختی و ئاسایشـن(مـادەی 1) ڕاگەیاندنەکە هەروەها ئازادی ڕاگەیاندن (مادەی 12) و ئـازادی دیـن (مـادەی 16) دەسـەلمێنێت. ڕاگەیانـدنی ماساچۆسـت لەسـاڵی 1780دا بـە ڕوونـی دەڵێـت هـەر تاکێـك بۆئـەوەی بتوانێـت (بـەهرە لـە ژیـان و ئـازادی و موڵکایـەتی وەربگرێت)، دەبێت خـاوەن مافی پاراستن بێت لەلایـەن کۆمـەڵگاوە(مادەی 10، مـادەی 12 لـە ڕاسـتیدا پـەرەگرافی 39ی بڵاوکـراوەی مـەزنی ئینگلیـز دەڵێتـەوە). ڕاگەیاندنی پەنسیلڤانیا لە سـاڵی 1776دا ئـازادی دەربـڕین ئاخـاوتن و نوسـین (مـادەی 12)و ڕاگەیانـدنی نیـو هەمپشـایەر لـە سـاڵی 1783دا ئازادی بیروڕا و ویـژدان و مەزهـەب و نەریتـە دینیـەکان ڕادەگەیەنێت.

بـەم شـێوەیە وڵاتـە یـەکگرتووەکان لـە ڕاگەیانـدنی سـەربەخۆیی لـە ژۆییـەی سـاڵی 1776دا "هەنـدیك مـاف کـە قـابیلی سـپاردن نیـە"ی ڕاگەیاند کـە نـاوکی مۆدێرنـەی سیاسـی لەخۆیدا هەڵگرتبوو. باسەکە لە بنەڕەتدا لەسـەر مافـە بنەڕەتیـەکانی تاکـەکان بـوو کـە لـۆك و مۆنتیسیکۆ پێشتر داوایان کردبوو، واتە مافی "ژیان، ئازادی و گەڕان بەدوای خۆشبەختیدا". دەبـێ ئـازادی لێـرەدا بەمانایـەکی فـراوان تێبگەین، واتە سەرەڕای ئاسایش (کە بە ڕوونی لـە یـەکێك لـە مادەکـانی دواییـدا هـاتووە)، ڕەهەنـدەکی تـری ئـازادیش لـەخۆ بگرێـت، بەتایبـەتی ئـازادی ویـژدان و بـاوەڕی دینـی کـە لەناوەڕاسـتی سـەدەی حەڤدەهەمـەوە ڕاگەیەنرابوو. دەبێ سەرنج لەو خاڵە بدەین کە مـافی "گـەڕان بـەدوای خۆشـبەختیدا" وەك مـافێکی نـوێ، پێویسـتی بـە بەدەسـتهێنان و خاوەندارێتی پارە و داراییە. ئەڵبەتە هەرچەندە بەدەستهێنان و خاوەندارێتی دارایی مافێکی وا مومکین دەکات، بەڵام ئەم مافە کورت نابێتەوە بـۆ ئـەم کارانـە. بەهـەرحاڵ ئـەم تێڕوانینـە بەشـێوەیەکی سروشـتی دەبێتـە هـۆی یەکسـانکردنی خۆشبەختی لەگـەڵ موڵکایـەتی سامان و دارایی مادیدا.

دەوری حکومـەت هـەمان "زامنکردنـی ئـەم مافانەیە و هەرکاتێك لە ئەنجامدانی ئەرکەکانیدا کـەموکوڕی کـرد، خـەڵکی دەتـوانن بیگـۆڕن و "حکومـەتێکی تـازە" لـەبری دابنـێن کـە

"ئاسایش و خۆشبەختیان بۆ دابین بکات". بەشێوەیەکی گشتی گەر حکومەتێك بیەوێت مرۆڤەکان دیلی "دیسپۆتیزمێکی ڕەها بکات"، "ماف و ئەرکی خەڵکیە کە حکومەتێکی لەمشێوەیە، بهێننە خواریٚ". بەمشێوەیە سەربەخۆی و باڵاتربوونی ئەم مافە بنەڕەتیانە بەسەر دەوڵەت و دەسەڵاتدا سەلمێنرا و هەرئەمەش ڕێگەی بۆ جیابونەوەی بواری سیاسی لە بواری تایبەتی کردەوە.

دیارە نابێت ئەوە فەرامۆشبکرێت مەبەست لە باسکردنی ئەم مافانە، لە بنەڕەتدا بریتی بوو لە ئاراستەکردنی جیابونەوەی کۆچبەرە ئەمەریکیەکان لە ئینگلتەرای مەزن و گۆڕینیان بۆ "وڵاتە ئازاد و سەربەخۆکان". بە دەربڕینێکی دی بۆ دابینکردنی مافەکانی تاکەکەس، خەڵکێکی ئازاد و دەوڵەتێکی ئازاد پێویست بوو، بۆ دابینکردنی ئازادی شەخسیش، دەبوو ئازادی گشتی بەدیبهاتایە. لەئەنجامدا وا دەردەکەوت کە باسکردنی مافەکانی تاکەکەس، پتر بەرەو دەوڵەتی پێشمۆدێرن ئاراستە وەردەگرێت کە ئامانجی سەرەکی واتە ئازادی گشتی، بە سەربەخۆبوون لە ئینگلتەرای مەزن، بوونی پەیدا دەکرد تا گەیشتن بە مۆدێرنەی سیاسی.

لەو سەردەمەدا کە هەموان سەرقاڵی ڕێکخستنی یەکەیەکی سیاسیی تازە و ئامادەکردنی دەستورەکەی بوون، سەرنجەکان بەرەو نمونەی دەوڵەتشاری دێرین و وردتر بەرەو نمونەی کۆماری ڕۆم، ڕاکێشرا. جێگەی سەرنجە کە هەر سێ نوسەری وتارەکانی کتێبی فدرالیست (ئەلکسەندەر هەملتون، جان جی و جیمز مدیسۆن) لەکاتی تەفسیری دەستوری ئەمەریکادا- کە خۆیان ئامادەیان کردبوو- نوسینەکانی خۆیان بە ناوی خوازراوی "پۆپلیۆس"وە ئیمزا دەکرد کە بیرهێنەرەوەی پۆپلیۆس ڤالریۆس پۆپلیکولایە کە یەکێکە لە دامەزرێنەرانی کۆماری ڕۆم. بەمشێوەیە ئەمانە خواستی خۆیان، واتە دامەزراندنی (ڕژێمی) کۆماری لە وڵاتە یەکگرتووەکاندا و لەسەر بناغەی حکومەتێکی خەڵکسالار لە هەر ویلایەتێکدا پیشاندا. دیارە ئەوان بە ئاشکرا خۆیان لە دەوڵەتشاری دێرینەوە بەدورگرت، چونکە پەنجەیان خستە سەر جیاوازیان لەگەڵ ئەو کۆمارە دیموکراسیەی کە بە مانای دێرین نەبوو.

لەراستیدا حکومەت لە دەوڵەتشاری دێریندا بەو مانایە بە دیموکراتی دەژمێرا کە خەڵك ڕاستەوخۆ حکومەتیان دەکرد. بەڵام لە کۆماری ئەمەریکادا نوێنەرانی خەڵك بەمکارە هەڵدەسان. لێرەوە نوێنەرایەتی کۆماری ئەمەریکای لەدەوڵەتشاری دێرین جیادەکردەوە و دەیخستە ناومۆدێرنەی سیاسیەوە. جیمز مدیسۆن لە وتارێك لە فیدرالیستدا (ساڵی 1786) ئەم خاڵەی باسکردووە. لەدیدی جیمزدا نابێت کۆمار و دیموکراسی تێکەڵ بکەین. جیمز بەمشێوەیە پەنجە دەخاتە سەر جیاوازی ئەم دوو حکومەتە: "لە دیموکراسیدا خەڵکی لەدەوری یەك کۆدەبنەوە و خۆیان حکومەت دەکەن، لە کاتێکدا لەکۆماردا خەڵکی لەدەوری یەك کۆدەبنەوە و لەرێگەی نوێنەران و کارگوزارانی خۆیانەوە، حکومەت دەکەن"5".

پاشان درێژەی پێدەدات کە هەرچەند ئەوروپا بنەمای نوێنەرایەتی دۆزیەوە، بەڵام ئاشنایی لەگەڵ حکومەتێکدا کە بەتەواوی لەسەر بناغەی ئەم بنەمایە دامەزرابێت، نیە. بە پێچەوانەوە "ئەمەریکا دەتوانێ شانازی بەخۆیەوە بکات کە ئەم دۆزینەوەیەی کردە، بناغەی ئەو کۆمارانەی کە بەسەر سەرزەمینێکی فراواندا بڵاوبونەتەوە".

وتارێکی دی فیدرالیست ئەو خاڵە بەبیردەهێنێتەوە کە جیاوازی کۆماری ئەمەریکا لەگەڵ کۆمارەکانی دیدا، دەگەڕێتەوە بۆ بنەمای نوێنەرایەتی کە لەبنەڕەتدا بە خەسڵەتی سەرەکی دەژمێرێت. دیارە لە وتارەکەدا راگەیەنراوە کە رژێمە کۆماریەکانی پێشموۆدێرن لەم بنەمایە تەواو بێئاگا نەبوون و نمونە لە حکومەتگەلێك دەهێنێتەوە کە تیایدا هەندێك بەرپرسیاری جێبەجێکاری یان تەنانەت یاسارێژی دەکەوتە ئەستۆی ماژێستراکانی هەڵبژێراو لە پلەی نوێنەرانی خەڵکدا. بەتایبەتی دەکرێت بۆ نمونە لە ئەسینا ناوی(ئارخۆنتەکان و ئەنجومەن) و لەسپارت ناوی (ئەفسۆرەکان) لە کارتاژ ناوی (سەنا)، لە رۆم ناوی (تریبۆنەکان) و لە کریت ناوی (کۆسمەکان) بهێنرێت. لێرەوە دەکرێت بگوترێت (رژێمە) کۆماریەکانی پێشموۆدێرن، کەمتازۆر ئاشنای نوێنەرایەتی بوون. بەڵام (رژێمی) کۆماری ئەمەریکا بەتەواوی لەسەر بناغەی نوێنەرایەتی دامەزراوە و خەڵکی بەتەواوی لە کاروباری حکومەت دەخاتە لاوە: جیاوازی راستەقینەی نێوان حکومەتەکانی پێشموۆدێرن و حکومەتی ئەمەریکا ئەوە نیە کە لەو حکومەتانەدا نوێنەرانی خەڵك بەتەواوی لەبەڕێوەبردنی کاروبارەکاندا خراونەتە لاوە، بەڵکو بریتیە لەوەی کە لەم حکومەتەدا خەڵکی لەرووی توانای گشتیانەوە، لە هەموو جۆرە بەشداریەك تیایدا، خراونەتە لاوە. بەمشێوەیە ئەم وتارە لە فیدرالیستدا دەیەوێت هەم کۆماری ئەمەریکا لە (رژێمە) کۆماریەکانی پێشموۆدێرن کە هەندێك شێوەی نوێنەرایەتیان دەناسی، نزیکبکاتەوە و هەم جیاوازی لەگەڵیاندا بەرجەستەبکات. چونکە حکومەت لەم (رژێمە) کۆماریەدا بەتەواوی و بەشێوەیەکی پاوانکراو لەسەر بناغەی نوێنەرایەتی دامەزراوە. لێرەوە سەرەڕای ئامادەبوونی نمونەی دەوڵەتشاری دێرین، بەهۆی گرنگی بنەمای نوێنەرایەتیەوە، ئەم نمونەیە بەشێوەیەکی هەستپێکراو گۆڕانی بەسەرداهات. بەمشێوەیە ئەم بنەمایە بەهۆی رەهەندی سڕینەوەی، ئەو توانایەی بە کۆماری ئەمەریکا بەخشی کە بە دورکەوتنەوە لە دەوڵەتشاری دێرین، پێبنێتە ناو مۆدێرنەی سیاسیەوە.

بەڵام بەتەنها نوێنەرایەتی بەس نیە بۆ دەستگەیشتن بە مۆدێرنەی سیاسی، بەڵکو جیابونەوەی بواری گشتی و بواری تایبەتیش وەك جیابونەوەی دەوڵەت و کۆمەڵگا، پێویستە. ئەمەش پێویستی بە بەفەرمی ناسینی مافە تاکەکەسیەکانە. گەرچی ئەم خاڵە لەبارەی وڵاتە یەکگرتوەکاندا ئاشکرابوو، لەگەڵ ئەمەشدا ئەم مەسەلەیە هەندێك دودڵی دروستکرد کە داوجار چارەسەر کرا.

وەك پێشتر بینیمان لەکاتی سەربەخۆی ئەمەریکادا، مافە فەردیە بنەڕەتیەکان بە روونی

راگەیەنران. جگە لەمەش دەستورەکانی ویلایەتە یەکگرتوەکان، کۆمەڵێك راگەیاندنی مافی لەخۆیدا هەڵگرتبوو کە ئازادیە بنەڕەتیەکانی ئەژمار دەکرد. بەڵام سەیر ئەوەیە لەبارەی دەستوری فیدراڵیەوە وانەبوو، نەیارانیش هەرئەم کەموکوڕیان وەك بەڵگەیەك دژی، بەکاردەهێنا. دەکرێت نەبوونی راگەیاندنێکی لەمچەشنە بگەڕێنینەوە بۆ دوو هۆی سەرەکی: لەلایەك مافە بنەڕەتیەکان پێشتر لە راگەیاندنی سەربەخۆیدا هاتبوو، لێرەوە پێویستی بەوە نەبوو راگەیاندنێکی تازەی بۆ ئامادە بکرێت. لەلایەکی دیکەوە دەستوری فیدراڵیش هەندێك مافی راگەیاند و لێرەوە راگەیاندنێکی تایبەتی، بە بێهودە دەردەکەوت. هملتون لە وتارێکی کتێبی فیدرالیستدا ئەم بەڵگاندنە دەهێنێتەوە چەند نمونەیەك لەو مافانە دەهێنێتەوە کە دەستور بە فەرمی ناسیوێتی: بەتایبەت سنورەکانی سزادان لە حاڵەتی " تۆمەتبارکردنی نوێنەراندا"، بەهرەمەندبوون لە ئیمتیازی "هابە ئاس کۆرپۆس" (زامنکردنی ئازادی فەردی)، قەدەغەبوونی ناوی ئەرستۆکراتیانە و وازهێنان لە داوەریکردن لەبارەی هەموو تاوانەکانەوە بۆ ئەنجومەنی ***Impeachment***.

هەمیڵتۆن درێژەی پێدەدات کە یەکەم راگەیاندنەکانی مافەکان، وەك بڵاوکراوەی مەزنو داخوازینامەی مافەکانی ساڵی 1628 و راگەیاندنی مافەکانی ساڵی 1689، لەراستیدا بە رێکەوتنامەگەلێك لەنێوان پاشاکان و فەرمانبەرانیاندا و سنورداربوونی ئیمتیازەکانیان دەژمێررا. بە پێچەوانەوە ئەمجۆرە راگەیاندنانە کاتێك باسی دەستور دەکرێت کە بناغەیان لەسەر دەسەڵاتی خەڵك دامەزراندووە و حکومەت بە نوێنەرانی خەڵك دەسپێرن (وەك ویلایەتە یەکگرتووەکان)، بێهودە دەردەکەون. لێرەوە ئەژمارکردنی بەش بە بەشی مافە تایبەتیەکان، لەشان و شەوکەتی دەستوری ئەمەریکادا نیە و بگرە رەنگە زیانیشی هەبێت. لەمڕووەوە وتنی ئەوەی ئازادی چاپەمەنی سنوردار ناکرێت بێهودەیە، چونکە هیچ دەسەڵاتێك بوونی نیە کە بتوانێت سنورێك بۆ ئەم ئازادیە دابنێت، و نابێت بەهانە بۆ دروستبوونی دەسەڵاتێکی لەمچەشنە، بە دەستەوە بدرێت. همیڵتۆن تا ئەو جێگەیە دەڕواتە پێشیٚ کە دەڵێت دەستوری ئەمەریکا خۆی راگەیاندنی مافەکانە، چونکە هەم "مافە سیاسیەکان هاوڵاتیانی" لە زەمینەی حکومەتدا بەروونی دەربڕیووە و هەم مافەکانی تایبەت "بە بەرژەوەندی شەخسی و تایبەتی". لەبەرئەمە راگەیاندنی مافە تایبەتیەکان پێناچێت پێویست بێت.

بە دەربڕینێکی دی لەم وتارانەدا ئەوەی جێگەی دودڵیە، نەك راگەیاندن و سەلماندنی مافەکانی تاك (کە بە روونی وبە فەرمی ناسراوە)، بەڵکو پێویستی ئەژمارکردنی ئەم مافانەیە لە راگەیاندنێکی تایبەتدا (کە ناچارانە نیە). بە دەربڕینێکی دی لە دیدی نوسەرانی دەستوری ئەمەریکاوە تەنانەت لە نەبوونی وەها راگەیاندنێکدا، جێگەیەك بۆ گومانکردن لە بە فەرمیناسینی مافە تاکەکەسیەکان نیە. ئەم راستیە لەو باوەڕەوە سەرچاوە دەگرێت کە لە ویلایەتە یەکگرتووەکاندا خەڵکی حکومەت

بەرپا دەکەن و کۆمەڵگا دەوڵەت دروستدەکات، نەك بە پێچەوانەوە. لەبەرئەمە همیڵتۆن سەرەتای دەستور بە جەختکردن لەسەر وشە گرنگەکانی دەهێنێتەوە: "ئێمە خەڵکی ویلایەتە یەکگرتووەکان بۆ ئەوەی باشیەکانی ئازادی بۆ خۆمان و نەوەکانمان زامن بکرێت، ئەم دەستورە بۆ ویلایەتە یەکگرتووەکان رێکدەخەین و بەرپادەکەین". بە بڕوای همیڵتۆن ئەم فۆرمە "باشترین جۆری ناساندنی مافەکانی خەڵکیە" بە بەراوردکردن بە هەموو راگەیاندنی مافەکانی دیدا. لەراستیدا تازەگەری ویلایەتە یەکگرتووەکان لەسەر ئەو راستیە دامەزراوە کە خەڵکی دەستور بەرپادەکەن و لەپێشبوونی خۆیان بەسەر دەوڵەتدا، دەپارێزن. لەئەنجامدا کۆمەڵگا نەك تەنها لە دەوڵەت جیایە، بەڵکو لەپێش دەوڵەتەوەیە و دەوڵەت بونیاد دەنێت. لەبەرئەمە ویلایەتە یەکگرتووەکان هەر لەسەرەتاوە پێینایە ناو مۆدێرنەی سیاسیەوە و لێرەوە دەکرێت بگوترێت مۆدێرنەی سیاسی لەگەڵ ئەم وڵاتەدا پێکەوە لەدایکبوون.

لەراستیدا گەرچی دەستوری ئەمەریکا راگەیاندنی مافەکانی لەخۆ گرتبوو، بەڵام لەساڵی 1791وە بە دە بەند کە دەکرێت بە جۆرێك لە بڵاوکراوەی مافەکان بزانرێت، تەواوکرا و بەمشێوەیە ئەم جێگە خاڵیە پڕبۆوە. یەکەم بەند ئازادی دین و دەربڕین (ئاخاوتن و نوسین) مافی کۆبونەوە و داواکردنی روژنامەنوسی، راگەیاند. مافگەلێکی دی بە تایبەتی هەڵگرتنی چەك، ئاسایشی کەسەکان و داراییەکان، مافی موڵکایەتی، زەمانەتی یاسایی لەحاڵەتی تۆمەتبارکردن و بەدواداچوونی تاواندا و تا دوایی، بە فەرمی ناسراوون. ئەم بەندانە جەخت لە مافە تاکەکسیە بنەڕەتیەکان، بوونی بوارێکی تایبەتی جیاواز لە بواری گشتیو دور لە باڵادەستی دەسەڵاتی سیاسی دەکات و بەمشێوەیە جیاوازی نێوان دەوڵەت و کۆمەڵگا پیشاندەدات و لێرەوە دەکرێت بە نیشانەیەکی ئاشکرای مۆدێرنەی سیاسی بزانرێت.

مۆدێرنەی سیاسی بەتایبەتی بە جیابونەوەی دەوڵەت و دین دەرکەوت کە لە دەستوری ئەمەریکیدا بە ئاشکرا بە دوو شێوە راگەیەنراوە: لەلایەکەوە دەوڵەت لە هەموو دینێك سەربەخۆیە و هەروەها بۆ پۆستەکان یان بەرپرسیاری دەوڵەتی و گشتی "هیچ بڕوابونێك بە دینێکی تایبەتی" پێویست نیە(مادەی6). لەلایەکی دیەوە دەوڵەت ناتوانێت دەست لە مەسەلە دینیەکانەوە بدات، چونکە یەکەم بەندی زیادەکراو، ئەوە دەسەلمێنێت کە کۆنگرە ناتوانێت بۆ بەرپابوونی دینێك یان قەدەغەکردنی روودانی، یاسا دابنێت. لەئەنجامدا ویلایەتە یەکگرتووەکان وەك یەکەم دەوڵەتی جیابۆوە لە دین و تەواو سکولار دەرکەوت و لێرەوە دەکرێت بگوترێت یەکەم دەوڵەتی بەڕاستی مۆدێرنە.

بەمشێوەیە مۆدێرنەی سیاسی یەکجار و بەشێوەیەکی خێرا و ئاسان و بڕاوە (ئەگەرچی بەشێوەیەکی ناکامڵ) لە ویلایەتە یەکگرتووەکاندا بەدیهات. وتمان ناکامڵ چونکە تەنها پەیوەندی بە کۆچبەرە سپی پێستەکانەوە هەبوو و کۆیلە رەشپێست و سورپێستەکانی

نەدەگرتەوە. بەڵێ پاش رزگاری کۆیلە رەشپێستەکان کە پاش جەنگی ناوخۆ (جەنگەکانی جیابونەوە) و بەپێی چواردەهەمین بەندی تەواوکەر (ساڵی 1868) بەدیهات و هەروەها بە بەفەرمی ناسینی مافی سورپێستەکان لەکۆتایی سەدەی نۆزدەدا، مۆدێرنەی سیاسی بەئەنجامگەیشت. فەرەنسا وەك ویلایەتە یەکگرتوەکان لە کۆتایی سەدەی هەژدەدا و دیارە بە شێوەیەکی جیاواز بە مۆدێرنەی سیاسی گەیشت.

## 2- فەرەنسا و مۆدێرنەی سیاسی

لە فەرەنسادا مۆدێرنەی سیاسی وەك دەستکەوتێکی شۆڕشی مەزنی ئەم وڵاتە، لە ساڵی 1789دا دەستی پێکرد و لە رەوتی سەدەی نۆزدەدا درێژەی پێدرا. مۆدێرنەی سیاسی سەرەتا بە دابڕانێکی توند لە رژێمی پێشوو، بەرپابوو و پاشان لە رێگەی پرۆسەیەکی کەمتازۆر درێژخایەنەوە، رەگی داکوتا. ئاشکرایە پەیدابوونی خاو و گرفتئامێزی مۆدێرنەی سیاسی لە فەرەنسادا، لەگەڵ بەدیهاتنی خێرا و ئاسانیدا لە ئەمەریکا، جیاوازبوو. جیاوازی ئەم دوو حاڵەتە دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی مۆدێرنەی سیاسی لە ویلایەتە یەکگرتووەکان بەیەکجار لەکاتی دروستبونی دەوڵەتدا دەرکەوت، لەکاتێکدا لە فەرەنسەدا لەخەباتکردن دژی رژێمی پێشوودا لەدایکبوو. لە حاڵەتی یەکەمدا مۆدێرنەی سیاسی بە شێوازێکی ئاشتیخوازانە و لە حاڵەتی دوهەمدا لەرێگەی خەباتێکی شۆڕشگێڕانەوە، بەدەستهات. وەك تۆکڤیل دەڵێت "ئیمتیازی گەورەی ئەمەریکیەکان ئەوەیە بێ ئازارچەشتنی شۆڕشە دیموکراتیەکان، بە دیموکراسی گەیشتن و جگە لەمەش لەبری ئەوەی ببن بە بونەوەرانێکی یەکسان، بە یەکسانی لەدایکبوون". بەڵێ لەکاتێکدا ویلایەتە یەکگرتووەکان هەر لەسەرەتاوە بە مۆدێرنەی سیاسی گەیشت، فەرەنسا لەرێگەی پرۆسەیەکی شۆڕشگێڕانە و روبەڕوبونەوەی گرفتی جۆراوجۆرەوە، پێی گەیشت.

### ئەلف) لەدایکبوونی مۆدێرنەی سیاسی

شۆڕشی فەرەنسا مۆدێرنەی سیاسی بە جیابونەوەی دەوڵەت و کۆمەڵگا بەدیهێنا. لە رژێمی پێش شۆڕشدا نە کۆمەڵگای مەدەنی و مافە فەردیەکان هەبوون و نە باسی دەوڵەتی مۆدێرن لەئارادا بوو. لەم رژێمەدا دەوڵەت لەگەڵ دەوڵەتشاری دێریندا کە لە هاوڵاتیان پێکهاتبوو، جیاواز بوو و بونیادەکانیشی لە کۆمەڵگای فیودالیەوە، بە میرات بۆ مابۆوە. بەمشێوەیە دەوڵەت نەك لە هاوڵاتیان، بەڵکو لە کۆمەڵێك گروپی رێکنەخراو بەناوی چینەکانەوە، پێکهاتبوو کە لە ژێر فەرمانی شادا بوون. دەوڵەتی فەرەنسا سێ چین واتە ئەرستۆکرات، رۆحانیەکان و خەڵکی رەشورووتی لەخۆ دەگرت کە لە ئەنجومەنی چینەکاندا، نوێنەریان هەبوو. کۆبونەوەکانیان لە مانگی مەی ساڵی 1789دا بە باشی دەریدەخات کە دەوڵەت لە کۆمەڵێك لەم چینانە دروستبوو بوو.

لەراستیدا شۆڕش ئەم دەوڵەتەی لەناوبرد،

بۆئەوەی دەوڵەتێکی مۆدێرن بونیاد بنێت. چۆن؟ بە لەناوبردنی چینەکان و دروستکردنی هاولآتیان. لەسەرەتای شۆڕشدا چینەکانیان بەمشێوەیە لەناوبرد: سەرەتا بریاریاندا کە دەنگدان تاکەکەسی بێت، نەك لەسەر بناغەی چینەکان، پاشان ئیمتیازاتی بیرۆکرات و رۆحانیەکانیان سڕیەوە. لەوە بەدواوە ئەنجومەنی چینایەتی کە بە نوێنەری چینەکان دەژمێرا، گۆڕا بۆ ئەنجومەنی نەتەوەیی کە نوێنەرایەتی هەموو نەتەوەی دەکرد. بەڵێ دەوڵەت چیدی نەك کۆمەڵێك چین، بەڵکو پێکەوەبونستانی هاولآتیان بوو و بەمشێوەیەش بوو بە دەوڵەتێکی مۆدێرن.

لابردنی چینەکان دەرئەنجامی گرنگی هەبوو. ئەوە بەبیربێنینەوە کە ئەم چینانە کارکردنێکی دولایەنەیان هەبوو: لەلایەکەوە دەوری سیاسیان هەبوو، چونکە لەژێر فەرمانی شادا دەوڵەتیان پێکدەهێنا. لەلایەکی دیکەوە بۆ تاکەکان چوارچێوەیەکی رێکخراوی پێویستیان بۆ ژیان و چالاکیان پێکدەهێنا. لەراستیدا تاکەکان نەك بەشێوەیەکی راستەوخۆ، بەڵکو تەنها لە رێگەی چینەکانەوە دەیانتوانی بەشداری لە ژیانی سیاسیدا بکەن. کاتێك چینەکان لەناوچوون، ئەم دو کارکردنە بەردەوام لە جێگەی خۆیان مانەوە، بەلاّم بە شێوەیەکی دی زامنکران: لەلایەکەوە تاکەکان پاش لابردنی چینەکان توانیان بە بێئەوەی پێویستیان بە نێوەندێك هەبێت، بە شێوەیەکی راستەوخۆ بەشداری لە ژیانی سیاسیدا بکەن و بەمشێوەیە بوون بە هاولآتی و لێرە بەدواوە دەوڵەت نەك چینەکان ، بەڵکو ئەم هاولآتیانە

دروستیاندەکرد. لەلایەکی دیەوە تاکەکان مەحروم لەو رێکخراوانەی چینەکان بۆیان دابیندەکردن، هەنوکە دەبوو ژیان و چالاکی تایبەتی خۆیان بەدەستی خۆیان رێکبخەن و کارێکی لەمچەشنەشیان لە چوارچێوەی کۆمەڵگایەکدا ئەنجامدەدا کە لە دەوڵەت جیابوو.

چینەکان کە هەم روو لە دەوڵەت بوون و هەم روو لە تاکەکان، یەکێتیەکیان دروستکردبوو کە بەمشێوەیە تێکشکێنرا و لە ئەنجامدا دوو بونەوەری جیاواز دەرکەوتن: لەلایەکەوە دەوڵەتێکی سیاسی پێکهاتوو لە هاولآتیان و لەلایەکی دیەوە کۆمەڵگای مەدەنی کە لە تاکەکان پێکهاتووە. ئەم پرۆسەی جیابونەوەیە لە بواری مافەکاندا بە پەیدابوونی دوو شێوەی ماف دەرکەوت: سەرەتا مافەکانی هاولآتیان، واتە ئەو مافانەی وەك ئەندامی دەوڵەت پەیوەندی بە هاولآتیەوە هەیە و پێویستە بۆ بەشداریکردنی لە ژیانی سیاسیدا و دەکرێ ناوی مافەکانی هاولآتی یا سیاسی لێبنێین. دوهەم مافەکانی تاك وەك تاك، واتە مافەکانی کە تاك وەك ئەندامی کۆمەڵگای مەدەنی هەیەتی و بۆ ژیان و چالاکی تایبەتی خۆی پێویستە. ئەم مافە بە مافی تاکەکەسی یا مەدەنی دەژمێرێت و بەگشتی بە مافەکانی مرۆڤ ناو دەبرێت. بەمشێوەیە دەبێ گواستنەوە لە دەوڵەتی پێشمۆدێرنەوە کە لەسەر بناغەی چینەکان دامەزراوە بۆ دەوڵەتێکی مۆدێرن کە لە هاولآتیان پێکهاتووە و جیایە لە کۆمەڵگای مەدەنی، بە شۆڕشێك بزانرێت، شۆڕشێك کە لەسەر بناغەی جیابونەوەی دەوڵەت و

کۆمەڵگای مەدەنی و بەخشینی سەربەخۆی بە هەریەکێکیان، دامەزراوە. لێرەوە دەکرێ بگوترێت شۆڕشی ساڵی 1789 ڕێگەی مۆدێرنەی سیاسی کردەوە و بەدیهێنا.

بەمپێیە دەکرێت سی یەس بە تیورە داڕێژەری شۆڕش بزانرێت، تەنانەت پێش ئەوەی روشبدات. سی یەس تەنها بە ڕەخنەکردنی چوارچێوە نێوەندیەکان، واتە پلەکانەوە نەوەستا، لەو پێشنیارانەدا کە لەبارەی خەڵکی ڕەشوروتەوە نوسی (و لە ساڵی 1789دا بڵاوبۆوە) پێشنیاری دامالینی چینەکان و بەتایبەتی چینی بیرۆکراتەکانی کرد کە بە نامۆی لە کۆمەڵگا دادەنان. لەراستیدا سی یەس سێ بەرژەوەندی لەیەك جیادەکاتەوە: یەکەم بەرژەوەندیەکانی کۆمەڵگا، پاشان بەرژەوەندی گروپەکان و پلەکان، و دواجار بەرژەوەندیەکانی تاکەکان. سی یەس دەستەی دوهەم بۆ کۆمەڵگا بە مەترسی دەزانێت و لە ئەنجامدا گروپ و چینەکان ڕەد دەکاتەوە. لەمبارەیەوە دەڵێت: نابێت"باڵادەستی بەرژەوەندی گشتی بەسەر بەرژەوەندی تایبەتیدا، زامنبکرێت". بەمشێوەیە پاش لەناوچوونی چین و گروپەکان، ئەوەی دەمێنێتەوە کۆمەڵگا و تاکەکانە، بەرژەوەندی گشتی و بەرژەوەندی تاکەکەسیە. ئەم جیاکاریە ڕێنمای سی یەسیان کرد بۆ ئەوەی لەنێوان هاوڵاتی وەك ئەندامی کۆمەڵگا و تاکەکەس وەك تاکەکەسدا، جیاوازی بکات. سی یەس بە قایلبوون بە "مافی سیاسی" و "ئازادی سیاسی" بۆ هاوڵاتی و "مافە مەدەنیەکان" و "ئازادی مەدەنی" بۆ تاکەکان، یەکەم کەسە ئەم جیاکاریە دەکات و بە روونی پێکەوەبونستانی سیاسی لە بواری تایبەتی جیا دەکاتەوە.

هاوڵاتیان بەپێی ئەندامبونیان لە کۆمەڵگادا لە رووی مافەکانەوە یەکسانن: پلەی هاوڵاتی بە "موڵکایەتیەکی یاسایی" دەژمێرێت کە بۆ "هەموان یەکسانە". بە پێچەوانەوە تاکەکان خۆبەخۆ بەشێوەیەکی واقعی لەگەڵ یەکدا یەکسان نین و "موڵکایەتی واقعیان" کەمتر یان زۆرترە. واتە دەشێت سامان یان خەسڵەتی کەمتر یان زۆرتریان هەبێت. سی یەس پێیوایە یەکسانی هاوڵاتیان لەگەڵ نایەکسانی تاکەکاندا بەتەواوی گونجاوە و پێویستی بە جیاوازی نێوان هاوڵاتیان و تاکەکان و هەروەها جیابونەوەی کۆمەڵگای سیاسی لە کۆمەڵگای مەدەنیە:

"ئەو خەسڵەتانەی دەبنە هۆی جیاوازی هاوڵاتیان لەگەڵ یەکدیدا، دەکەوێتە سەرو خەسڵەتی هاوڵاتیبونەوە. نایەکسانی لە موڵکایەتی و پیشە و پیشەسازیدا ، وەك نایەکسانی لە تەمەن و ڕەگەز و بالادان و ماهیەتی یەکسانی هاوڵاتی ناگۆڕن". جیاکاری لەنێوان هاوڵاتیانی یەکسان و تاکە نایەکسانەکان، لە زەمینەی نوێنەرایەتیدا بەکارهێنانێکی دیاریکراوی هەیە. لەراستیدا نوێنەرایەتی تەنها پەیوەستە بەو هاوڵاتیانەوە کە خەسڵەتگەلێکی هاوبەشیان هەیە، نەك بەو تاکەکەسانەی کە خەسڵەتی جیاوازیان هەیە: "مافی بوونی نوێنەر نەك بەهۆی خەسڵەتی جیاوازی هاوڵاتیانەوە، بەڵکو بەهۆی سیفەتی هاوبەشیانەوە، موڵکی ئەوانە".لێرەوە نوێنەرایەتی پەیوەندی بە بەرژەوەندی

هاوبەشــی هاوڵاتیانــەوە هەیــە، نــەك بــە بەرژەوەنــدی تایبــەتی تاكەكانــەوە: تــەنها بەرژەوەندی هاوبەش "چۆنایەتی نوێنەربوون بە هاوڵاتی دەبەخشێت"بە دەربرینێكی دی نوێنەرایەتی پشتی بەو شتە بەستووە كە لەنێوان هاوڵاتیاندا هاوبەشە، نەك بە جیاوازیان. لێرەوە نوێنەرایەتی پەیوەندی بە تاكەكان و بە گرووپەكانەوە نیە، بەڵكو پەیوەندی بە هاوڵاتیانەوە هەیە.

بەمشێوەیە سی یەس بەروونی لەوە تێگەیشت كە پرۆسەی لەناوبردنی چینەكان و گرووپەكان، بریتیە لە هەمان گواستنەوە لە دەوڵەتی پێشمۆدێرنەوە كە لە چین و گرووپەكان پێكهاتووە، بۆ دەوڵەتی مۆدێرن، واتە بۆ پێكەوەبونستانی هاوڵاتیان. ئەم شۆڕشە دوو بونەوەری جیاواز و سەربەخۆی پێكهێنا: لەلایەك دەوڵەتی سیاسی یا پێكەوەبونستانی هاوڵاتیانێك كە لەرووی یاساییەوە یەكسانن و خاوەن مافی یەكسانن، لەلایەكی دی كۆمەڵگای مەدەنی واتە كۆمەڵێك تاك كە لەرووی پراكتیكیەوە نایەكسان و خاوەن بەرژەوەندی جیاوازن. سی یەس لەراستیدا بە جیاوازیكردن لەنێوان مافە سیاسی و مافە مەدەنیەكاندا و بە روبەرودانانی بەرژەوەندیە گشتیەكان و بەرژەوەندیە تایبەتیەكان، بنەمای جیابونەوەی نێوان دەوڵەت و كۆمەڵگای مەدەنی هێنایە پێشێ و لێرەوە دەكرێ بە یەكەم تیورە داڕێژەری مۆدێرنەی سیاسی بزانرێت.

بەمشێوەیە ئەوەی دەبوو ئەنجامبدرێت بریتی بوو لەو پرۆسەیەی كە سی یەس مەبەستی بوو. وەك دەزانین شۆڕشی فەرەنسا پاش كەمێك هەوڵیدا ئەم ئەركە بەتایبەتی لە ئامادەكردنی "راگەیاندنی مافەكانی مرۆڤ و هاوڵاتی" لە ساڵی 1789دا جیبەجێبكات. دەكرێ ئەم راگەیاندنە بە بڵاوكراوەی بنەڕەتی دەوڵەتی مۆدێرن بژمێرێت. لەراستیدا "راگەیاندنی مافەكانی مرۆڤ و هاوڵاتی" هەم گۆڕانی قوڵی دەوڵەتی پیشاندا و هەم بەئەنجامیگەیاند. چونكە بە دەستەكەوتی "نوێنەرانی خەڵكی فەرەنسا لە ئەنجومەنی نەتەوەییدا" دەژمێرا. لەكاتێكدا دەوڵەت پێشتر لە سێ چین پێكهاتبوو كە لە ئەنجومەنی چینەكاندا كۆدەبونەوە. ئەم راگەیاندنە دەیویست "مافە سروشتیەكان، قابیلی نەسپاردن و پیرۆزی مرۆڤ" دەرببڕێت. دەبێت سەرنج لەوەبدەین كە ئەم مافە بنەڕەتیانە سەرچاوەیەكی سروشتیان هەیە و لێرەوە دەوڵەت تەنها بە فەرمی دەیانناسێت و دەیانسەلمێنێت، نەك ئەوەی ئەم مافانە ببەخشێت یان دابێتی. بەمشێوەیە ئەم مافانە بەرزترن لە پێكەوەبونستانی سیاسی و سەربەخۆن لێی و جگە لەمەش لە كۆمەڵگادا هەن و وەك مادەی دوهەمی راگەیاندنەكە دەڵێت، كۆمەڵگا دەوری پاراستنی ئەم مافانەی لە ئەستۆدایە. "ئامانجی هەر كۆبونەوەیەكی سیاسی پارێزگاریكردنە لەمافە سروشتی و هەمیشەییەكانی مرۆڤ". بەروونی دەتوانین ئەوە ببینین كە ئەم مادەیە لە لۆكەوە زیاتر لە رۆسۆ، ئیلهامی وەرگرتووە. چونكە لۆك وا بیری دەكردەوە كە مافە سروشتیەكان لە كۆمەڵگادا دەپارێزرێن و كۆمەڵگا پارێزگاریان لێدەكات،

لەکاتێکـدا ڕۆسـۆ بڕوایوابـوو مـرۆڤ مافـەکانی خـۆی بـە کۆمـەڵگا دەسـپێرێت، ئەگەرچـی هەندێکیان بۆ خۆی ڕادەگرێت.

لەراسـتیدا راگەیاندنەکـەی 1789 ئـەو جیاوازیـە وەردەگرێـت کـە سـی یـەس لـەنێوان تاك‌و هاوڵاتیدا دەیکات، چونکە لە دیباجەکەیدا هـاتووە، بـاس باسـی راگەیانـدنی مافـەکانی مـرۆڤ‌و هاوڵاتیـە کـە دو وتـەزای جیـاواز پێکدەهێنن. دیارە دەبێ سەرنج لەوە بدرێت کە لـەم راگەیاندنـەدا جیـاوازی نێـوان مافـەکانی مرۆڤ‌و مافەکانی هاوڵاتی و هەروەها جیاوازی نێوان مرۆڤ و هـاوڵاتی، زۆر روون نیە. چونکە هێشتا وشەکان مانایەکی نەگۆڕ و سەقامگیریان نـەبوو، هەنـدێکجاریش هێنـدە ورد نـەبوون. لەهەنـدێك حاڵەتـدا مافـە راگەیـەنراوەکان پەیوەنـدیان بـە مـرۆڤ واتـە بـە تاکەکـەس وەك تاکەکەسەوە هەیە و لەهەندێك حاڵەتی دیدا بـۆ هـاوڵاتی واتـە بـۆ ئەنـدامی پێکەوەبونسـتانی سیاسی بەکاردەهێنرێت. جگە لەمەش لەبارەی وشـەکانی "مـرۆڤ" و "هـاوڵاتی" کـە بەگشـتی مانای جیاوازیان هەیە، لە دوو حاڵەتدا هاومانا بـەکارهاتوون (مـادەی 7 و 11). بەهـەرحاڵ لـەم راگەیاندنـەدا مافـە سروشـتیەکانی مـرۆڤ وەك تاکەکـەس بریتیـە لـە ئـازادی، موڵکایـەتی" ئاسایش، سەقامگیری لەبەرامبەر ستەمکاریدا، ئـــــــــــازادی بـــــــــــیروڕا و دەربڕینـــە(مادەکـــانی10،2و11).مافـــەکانی هـاوڵاتی پەیوەسـتە بـەو پەیوەندیانـەوە کـە بـە پێکەوەبونستانی سیاسیەوە هەیـەتی -کـە بـە ئەنـدامی دەژمێرێـت- و لەبنەڕەتـدا باسـی بەشداریکردنە لە ئامادەکردنی یاسا، یەکسانی لەبەرانبـەر یاسـا، قبـوڵکردن لەهـەموو کاروبـارە گشتیەکاندا، بەشداریکردن لـە بودجـەی گشتی، دیاریکردنی ئەو بودجەیە و سەرفکردنیدا.

لەبەرئـەوە راگەیانـدنی سـاڵی 1789 دوو جۆر مافی زۆر جیاواز لەیەکدی لە خۆ دەگرێت، گەرچی بە روونی لەیەکیان جیا ناکاتەوە. سی یـەس لـەم زەمینەیـەدا دوو وتـەزا کـە پێشـتر لەیـەکی جیاکردبونـەوە، دەستنیشـاندەکات: یەکـەمیان "مافـە مەدەنیـەکان" کـە موڵکایـەتی و ئازادی تاکەکان لـەخۆ دەگرێت و دوهـەم "مافـە سروشـتیەکان" کـە پەیوەنـدی بـە بەشـداری هاوڵاتیانـەوە لـە ژیـانی سیاسـیدا هەیـە. سـی یەس بە جەختکردن لـە یەکسانی لـەم دو جـۆرە مافــەدا، کورتــەی راگەیاندنەکــە بەمشــێوەیە دەردەبڕێـت: "یەکسـانی لـە مافـە مەدەنیەکانـدا واتــە پارێزگــاری یەکســان لەهــەر هاوڵاتیــەك لـەبارەی موڵکایـەتی و ئازادیـەوە، و یەکسانیش لـە مافـە سیاسیەکاندا واتـە کاریگـەری یەکسـان لەبەرامبەر ئامادەکردنی یاسادا".

لەئەنجامدا زۆری نەخایاند دەستوری ساڵی 1791 بە پشتبەستن بە بنەما راگەیەنراوەکان لە راگەیانـدنی سـاڵی 1798دا، ئـەو دەزگایانـەی لابرد کـە نـەیاری ئازادی و یەکسـانی مافەکانن، بە تایبەتی چینەکان ، ئیمتیازەکان، ئەنجومـەنی چین و گروپـەکان (دیباجـە). هـەروەها کۆمـەڵێك "مـافی سروشـتی و مـەدەنی" زامنکـرد کـە هەندێکیان پەیوەندی بە هاوڵاتیـان و هەنـدێکی دیـان پەیوەنـدی بـە تاکەکەسـەکانەوە (هـەموو تاکـەکانی مـرۆڤ)وە هەیـە، ئەگەرچـی ئـەم دو وتەزایـە بـە روونـی لەیـەك جیانەکراونەتـەوە

(ناونیشانی 1).بەڵێ هەرچەند راگەیەنراوەکانی سـاڵی 1793 و سـاڵی 1795یـش مافـەکانی مـرۆڤو مافـەکانی هـاوڵاتی لەیەکجیادەکەنـەوە، بـەڵام هەنـدێکجار لـەم دوو تێکسـتەدا وشـەی "هـاوڵاتی" و "مـرۆڤ" هاوتـان. لەگـەڵ هـەموو ئەمانەشدا دەکرێ جیاوازی نێوان هاوڵاتی و تاکەکەس – سەرەرای کەموکوری راشکاوانەی– هاوکات لەگەڵ راگەیاندنی دوجۆر لە مافدا، بە نیشـانەی جیابونـەوەی دەوڵـەت و کۆمـەڵگا بزانرێـت. لەراسـتیدا شۆرشـی فەرەنسـی بـە بەعەمەلیکردنی ئەم جیابونەوەیە، گواستنەوەی لە دەوڵەتی پێشمۆدێرنەوە بۆ دەوڵەتی مۆدێرن بەئەنجامگەیانـد و بەمشـێوەیە پێینایـە نـاو مۆدێرنـەی سیاسـیەوە. بـەڵام نابێـت ئـەوە لەیادبکـەین کـە مۆدێرنـەی سیاسـی لەرێگـەی خۆیـدا روبـەروی چـەندان گرفتـی جۆراوجۆر بۆوە.

### ب) گرفتەکانی سەر رێ

فەرەنسـا بەپێچـەوانەی ویلایەتـە یەکگرتووەکانەوە کە رابردویەکی فیودالی نەبوو و بـە یـەکجار پێـی نایـە نـاو مۆدێرنـەی سیاسـیەوە، رێگەیـەکی درێژخایـەن و گرفتـی زۆری لەم رێگەیەدا هاتە سەر رێ کە دەبوو لە چـەندان سـەدە لـە حکومـەتی پاشـایەتی و ئەرسـتۆکراتی دابـبرێ و شـێوەیەکی تـازەی دەوڵـەت دروسـتبکات. هەرچـەندە نیـەت و ئامانجـەکان بـە روونـی راگەیـەنرابوون، بـەڵام بـەدیهێنانیان روبـەروی رێگری جدی بۆوە و بە خاوی و گرفتەوە بەرەو پێشەوە چوو.

دوو هـۆی سـەرەکی ئـەم هەلومەرجـە روندەکاتـەوە: یەکـەم ئـەوەی کـە رابـردووی پاشایەتی و ئەرستۆکراتی، درێژە بە کاریگەری خـۆی دەدات. لەسـێدارەدانی پاشـا بـۆ لەناوبردنی ئایدیای پاشایەتی بەس نەبوو، ئەم ئایدیایـەش بـە دەرکـەوتنی نـاپلیۆن دوبـارە لـەدایکبوە و پاشـان لەسـەدەی نۆزدەهەمـدا شـێوەی تـازەی بەخۆیـەوە گـرت. هـەروەها لـەناوبردنی چـین و ئیمتیازەکـان، نەبونـە هـۆی لەناوچـوونی ئەرسـتۆکراتیەت و لەراسـتیدا ئەرستۆکراتیەت لە کۆتایی شۆرشدا بە خێرای جێگـەی خۆیـان وەرگرتـەوە و پاشان لـە رەوتـی سەدەی نۆزدەدا بە گونجان لەگەڵ هەلومەرجی تازەدا، دەورێکی چارەنوسازیان بینی.

دوهـەم ئـەوەی کـە شۆرشـی فەرەنسـی وەك شۆرشـی ئەمـەریکا خۆبـەخۆ دەگەرایـەوە بـۆ نمونـەی دەوڵەتشـاری دێـرین و ژان ژاك رۆسـۆ ئیلهامبەخشـی سـەرەکی ئـەم شۆرشـە، بـە تیورەدارێژەری دەوڵەتی پێشمۆدێرن دەژمێررا. هەرچـەند نمونـە سیاسـیەکەی رۆسـۆ بـە قبـوڵکردنی بنـەمای نوێنەرایـەتی –کـە دەوڵەتشـاری دێـرین لەبنەرەتدا نەیبیسـتبوو– راسـتەخۆ چـاککرایەوە، بـەڵام نابێـت ئـەوە لەبیربکـەین کـە باڵادەسـتی ئـەم تیورەیـە لـە لوتکـەی شۆرشـدا، واتـە لەسـەردەمی کنوانیسیۆندا بە توندی رویدا و ئەم نمونەیە ئیلـهامی بـە بیرکردنـەوە و کـرداری رۆبسـپێر بەخشی. پاشان سەردەمی کلاسیکی کاریگەری خۆی بەسەر ئیمپراتۆری ناپلیۆندا ئاشکراکرد کـە لـە نیـوە رێگـەی دەوڵـەتی پێشـمۆدێرن و دەوڵەتی مۆدێرندا راوەستابوو.

ئەم هۆیانە بە باشی گرفتی دەستگەیشتن بە مۆدێرنەی سیاسی لە فەرەنسادا و بە تایبەتی ئەو دژایەتیە روندەکاتەوە کە شۆڕشی فەرەنسی گرتبۆوە: لەلایەك شۆڕش بە کردەوە کۆتایی بە رژێمی پێشوو هێنا و وەك راگەیاندنی سالّی 1789 بە باشی پیشانیداو دەیویست دەولّەتێکی مۆدێرن بونیاد بنێت، بەلاّم لەلایەکی دیکەوە نەیتوانی بەشێوەیەکی کاملّ دەست لە دەولّەتی پێشمۆدێرن هەلّگرێت و لەم روەشەوە دەگەڕایەوە بۆ نمونەی دەولّەتشاری دێرین. لە ئەنجامدا شۆڕشی فەرەنسی نیشانەی خۆی لە دروستبوونی دەولّەتی مۆدێرن لە چوارچێوەی سیاسیی پێشمۆدێرندا و هەروەها نیشانەی لە مۆدێرنەی سیاسی لە حالّەتێکدا گرتەوە کە دەولّەتشاری دێرینی بە نمونەی خۆی دەزانی. ئەم دژایەتیە بە شێوەی جیاواز لە رەوتی شۆڕشدا خۆی دەرخست و دەکرێت سەیری زوربەی لاڕێکان و بنبەستەکانی شۆرشی فەرەنسا وەك دەرئەنجامی ئەم دژایەتیە بکەین.

هەنوکە دەکرێت لەژێر تیشکی ئەم تەفسیرەدا جارێکی دی بە مێژووی شۆڕشی فەرەنسیدا بچینەوە. چەند نمونەیەك بۆ پیشاندانی پڕبەرهەمی ئەم رێبازە بەسە و ئێمە لێرەدا تەنها ئاماژە بۆ سێ نمونە دەکەین: یەکەم نمونە هەمان یاسایی رێکخستنی مەدەنیو رۆحانیەت بوو کە لە ناکۆکیەکی ئەسەفبارەوە سەریهەلّدا و دەرئەنجامی خراپی بەدوای خۆیدا هێنا. وەك پێشتر گوتمان شۆڕشی فەرەنسی لەسالّی 1789 وە بەکردەوە پێی خستە ناو مۆدێرنەی سیاسیەوە کە لە بواری دین و مەزهەبدا، بەشێوەی راگەیاندنی ئازادی بیرورا و ویژدان(مادەی 10ی راگەیاندنی سالّی 1789) دەرکەوت. لێرەوە شۆڕش ئەو بنەمایەی قبولّکرد کە دین پەیوەندی نەك بە دەولّەت، بەلّکو بە ئازادی شەخسی و نەك بە هاولاّتی، بەلّکو بە تاکەکەسەوە هەیە و ئەم تێڕوانینە لەراستیدا جیابونەوەی بواری گشتی و بواری تایبەتی بەدوای خۆیدا هێنا. بەمشێوەیە بنەمای جیابونەوەی دەولّەت و دین دامەزرا. بەلاّم ئەنجومەنی دامەزرێنەران بە دەنگدان بۆ یاسای رێکخستنی روحانیەت لە سالّی 1790دا بانگەشەی رێکخستنی کەنیسەی لەسەر بناغەیەکی تازە دەکرد، بەشێوەیەکی ناڕەوا دەستتێوەردانی لە زەمینەیەکدا ئەنجامدا کە لەدەرەوەی دەسەلاّت و سەلاّحیەتەکانی بوو. بەلّێ ئەم هەنگاوە دەرئەنجامی کارەساتاوی لێکەوتەوە کە دەکرێ بۆ نمونە ئاماژە بۆ دابەشبوونی کەنیسە، سەرکوتکردنی قەشە یاخیەکان و پاشان رۆحانیەتی کلاسیکی، لەگەلّ دەستگیرکردنی فراوان و دورخستنەوە و دواجار خەباتی ئاشکرای دژایەتی دین بکرێت.

هەرچەند بنەما شۆڕشگێڕیەکانی سالّی 1789 دەبوو بەشێوەیەکی لۆژیکی ببنە هۆی جیابونەوەی کەنیسە و دەولّەت، بەلاّم لە کرداردا پێچەوانەی ئەوە روویدا، چونکە دەولّەتی شۆڕشگێڕانە دەیویست وەك دەولّەتی پێشمۆدێرن، دین بخاتە ژێر کونترۆلّی خۆیەوەو درێژە بەو نەریتە گالیکینیە بدات کە کەنیسەی کردبووە فەرمانبەرداری دەولّەت. لەم حالّەتەدا دژایەتی نێوان خواستی جیابونەوەی دەولّەت لە کۆمەلّگا و نەتوانینی جیاکردنەوەی کەنیسە لە

دەوڵەت و هەروەها دژایەتی نێوان راکێشان بەرەو مۆدێرنەی سیاسی و رەفتاری خراپی لە زەمینەی دینیدا، بە باشی دەردەکەوێت. ئەم دژایەتیە کە لەسەرتاسەری قۆناغی شۆڕشدا بە سەقامگیری مایەوە، هەندێك گرفت و لارێ دەریدەخەن. بوناپارتیش لەبری چارەسەرکردنی ئەم دژایەتیە، بە رێکەوتنامەی کەنیسەیی ساڵی 1801، بۆ ماوەی یەك سەدە سەقامگیری کرد. لەراستیدا ئەم رێکەوتنامەیە بەپێی نەریتی باشەی گالیکنی، کەنیسەی ملکەچی دەوڵەت کرد. سەرئەنجام لە ساڵی 1905دا یاسای جیابونەوەی کەنیسەکان لە دەوڵەت، ئەم ناکۆکیەی چارەسەر کرد. دیارە نابێت ئەوەمان لەیاد بچێت کە ئەم یاسایە لە دۆخێکی پڕ کێشمەکێشدا قبوڵکرا کە هەم دەوڵەت و هەم کەنیسەی کاسۆلیك لە دروستبونیدا بەشداربوون. بەهەرحاڵ ئەم جیابونەوەیە کە درەنگ و بێگرفت روینەدا، پرۆسەی جیابونەوەی دەوڵەت لە کۆمەڵگا کە لە ساڵی 1789وە دەستی پێکردبوو، گەیاندە کۆتایی و بەمشێوەیە لە بەدیهاتنی کامڵی مۆدێرنەی سیاسیدا بەشداربوو.

نمونەی دوهەمی ئەو دژایەتیەی کە زیانی گەورەی بە شۆڕش گەیاند، هەمان ئەو جیاوازیە بوو کە ئەنجومەنی دامەزرێنەران لەنێوان هاوڵاتی کارا و هاوڵاتی بەرکاردا کردی و لە دەستوری 1791دا (ناونیشانی3، بەشی یەك، مادەی دو) نوسی. دەزانین لە دەوڵەتی مۆدێرندا هەموو تاکەکان بە هاوڵاتی دەژمێرێن و هاوڵاتیان لەرووی مافەوە یەکسانن – بەوشێوەیەی راگەیاندنی ساڵی 1789 (مادەی 1و 6) رایدەگەیێنێت – لێرەوە ناشێت چەند گروپێك لە هاوڵاتیان کە خاوەن مافی یەکسان نەبن، بونیان هەبێت. لێرەوە جیاکردنەوەی هاوڵاتیانی کارا کە دەبێت خاوەن هەندێك هەلومەرج بن – بەتایبەت دانی باجی راستەخۆ، بەرامبەر بە بەهای سێ رۆژ کار و ناونوسین لە دەفتەری گاردی نەتەوەییدا– ناکۆکیئامێزە. بەڵێ تەنها هاوڵاتیانی کارا لە ئەنجومەنی سەرەتاییدا –کە پێبەپێی دروستبونی ئەنجومەنی نەتەوەیی یاسادانەر دروستبوو– بەشداربوون. ئەم جیاکاریە بووە هۆی وەلاوەنانی هاوڵاتیانی دی –هاوڵاتیانی گوایە بەرکار– کە نە دەیانتوانی ببنە ئەندامی ئەنجومەنەکان و نە دەیانتوانی لە بڕیارە سیاسیەکاندا بەشداربن. جگە لەمەش ئەنجومەنە سەرەتاییەکان، ئەوانەیان دیاری دەکرد کە هەڵدەبژێرن. ئەمانە دەبوو هەلومەرجی زیادەیان لە رووی موڵکایەتی یان دەرامەتەوە هەبوایە (بوونی دەرامەتێك بە بەهای 150 یان 200 رۆژ کار یان بەکرێدانی خانویەك بە بەهای 100 یان 150 رۆژ کار بەپێی بابەتەکە). ئاشکرایە ئەم هەلومەرجەی هەڵبژاردن جیاوازیەکی تازەی لەنێوان هاوڵاتیانی کارادا دروستدەکرد.

لەهەردوو حاڵەتەکەدا جیاکاری لە نێوان گروپە جیاوازەکانی هاوڵاتیاندا لەسەر بناغەی موڵکایەتی و دەرامەت دامەزرابوو کە بە روونی لەگەڵ دەوڵەتی مۆدێرندا لە دژایەتیدایە. چونکە لە دەوڵەتی مۆدێرندا هەموو هاوڵاتیان یەکسانن و دەتوانن هەم خۆیان کاندید بکەن و هەم هەڵبژێرن. ئەمجۆرە جیاکاریە بەشێوەیەك

لە شێوەکان بیری دەوڵەتی پێشمۆدێرنمان دەخاتەوە. وەك ئەوەی بڵێی ریزی هاولاتیان جێگەی پلەکانی گرتۆتەوە. تەنانەت دەکرێ بگوترێت چەمکی هەمەکی هاولاتی لەناوچووە، چونکە لێرەدا خاوەن سێ پلەیە (هاولاتی کارا، هاولاتی بەرکار و هەڵبژێرانی ئەنجومەنە سەرەتاییەکان) و پلەی هاولاتی پەیوەستە بە موڵکایەتی یان دەرامەتەوە. بە دەربڕینێکی دی هاولاتیبوون پەیوەندی بە هەلومەرجی کۆمەلایەتی و ئابوریەوە هەیە و ئەمەش پێچەوانەی پێشنیارەکەی سی یەس و مافە سیاسیەکانە کە راگەیاندنی ساڵی 1789 رایگەیاندبوو. لەم هەلومەرجەدا هاولاتی لە تاکەکەس جیا نەبوو، لە ئەنجامدا دەوڵەتیش بەشێوەیەکی تەواو لە کۆمەڵگا جیا نەبووبۆوە. لێرەوە ئەگەرچی مۆدێرنەی سیاسی دەستی پێکردبوو، بەلام هێشتا بەتەواوی نەهاتبووە دی.

گەرچی پاش ماوەیەکی کەم ئەم ناکۆکیە لە چەمکی هاولاتیدا لە دەستوری (جێبەجێنەکراوی) ساڵی 1793دا چارەسەر کرا کە مەرجی ئابوری بۆ هاولاتیبوون هەڵگرت، بەلام لە دەستوری ساڵی 1795دا کە دیسانەوە هەندێك مەرجی ئابوری و کلتوری بۆ هاولاتیبوون دانا (دانی باجی راستەوخۆی شەخسی_مادەی8، توانای خوێندن و نوسین و کارکردن بە "پیشەیەکی تەکنیکی"-مادەی 16) ئەم دژایەتیە بەشێوەیەکی مامناوەندی تر پارێزرا. ماوەیەك دوای ئەمە دەستوری ساڵی 1799 جارێکی دی مەرجی ئابوری بۆ هاولاتیبوون هەڵگرت. لە بلاوکراوەکانی 1814و 1830دا تەنها باسی فەڕەنسیەکان دەکرا ، نەك هاولاتیان و بەمشێوەیە جیاوازی هاولاتی و تاکەکەس و لێرەوە جیاوازی دەوڵەتو کۆمەڵگایان خستە لاوە. جگە لەمەش دیسان بۆ هەڵبژێران مەرجی ئابوریان دانایەوەو مافی دەنگدانیان بەپێی دانی باج دانا. لە بلاوکراوەی 1814دا (مادەی 40) هاتووە بۆ خاوەندارێتی ئەم مافە، دەبێت لە ساڵێکدا باجی راستەوخۆی بەرابەر بە 300 فرانك بدرێت و لە بلاوکراوەی1830 (مادەی34) دانانی یاسایەك بۆ دروستکردنی مەرجێکی هاوشێوە، پێشبینی کرا. هەرچەند دەستوری ساڵی 1847 دەنگدانی گشتی "بێ دانی هیچ باجێك"(مادەی 24و25) سەلماند، بەلام جەختی لە سنوردانی بە پیاوانکرد. هەرچەندە ئەم دەستورە "مافەکانی هاولاتیانی" بە درێژی دەژمارد (بەشی دوو).بەلام جیاکاری هاولاتی و تاکەکەس فەرامۆشدەکات و تیایدا زوربەی مافەکان، هەمان مافەکانی مرۆڤن. دەستوری ساڵی 1852 نە باسی مافەکانی هاولاتیان دەکات و نە مافەکانی مرۆڤ، هەرچەند باسی فەڕەنسیەکان(مادەی 1) و هەروەها هاولاتیان دەکات(مادەکانی 17و 20 و 29)، بەلام ناتوانین لەمەوە ئەو دەرئەنجامە وەربگرین کە هاولاتی بە روونی لە تاکەکەس جیا دەکاتەوە. بەمشێوەیە یەکەم دەستورەکانی فەرەنسا دەریدەخەن کە چەمکی هەمەکی هاولاتی هەم بە زەحمەت قبوڵکراوە و هەم بە زەحمەت لە چەمکی هەمەکی تاك جیاکراوەتەوە. دواجار لە کۆماری سێهەمی فەرەنسادا (1870_1940) دەرئەنجامێکی وا بەدەستهات و لە ساڵی 1946

لــە کۆمــاری چــوارەمی فەرەنســادا(1946-1958) مــافی دەنگــدان بــە ژنــان درا. هــەموو ئەمانــە گرفتــەکانی ڕێگــەی بــەدیهێنانی جیابونــەوەی دەوڵــەت لــە کۆمــەڵگا و دەستگەیشــتن بــە مۆدێرنــەی سیاســی لــە فەرەنسادا، دەسەلمێنن.

سـێهەم نـاکۆکی کـە کاریگـەری زۆری کـردە سەر شۆڕشی فەرەنسی، لە قۆناغی کنواسیۆن و ترسناکی (تیرۆردا)ڕویدا. شۆڕش لەم قۆناغەدا لــە لوتکــەی خۆیــدا بــوو، بــە توندوتیژیــەوە ڕەفتــاری دەکــرد. لەراســتیدا بــە ڕاگەیانــدنی کۆمـارو لەسـێدارەدانی پاشـا، ڕژێمـی پێشـوو کۆتـای پێهـاتبوو، لێرەوە ئەگـەری ئـەوە هـەبوو دەوڵەتێکی تـازە پێکبێت و مۆدێرنەی سیاسی بەتــەواوی بێتــەدی. بــەڵام کنواســیۆن لــەژێر کاریگــەری ڕۆســـۆدا، دەوڵەتشــاری دێرینــی کردبــــووە نمونــــەی خــــۆی کــــە نیشــــانە ســەرەکیەکانی بریتــی بــوون لــە: گوێڕایــەڵی هــاولاتی بــۆ دەوڵــەت، خەســڵەتی ڕەهــای دەســەلات، پێـداگرتن لەسـەر یـەکێتی دەوڵـەت، لەپێشــبوونی بەرژەوەنــدی گشــتی، گرنگــی نیشـتیمان پـەروەری، نـەبونی جیـاوازی لـەنێوان هــاولاتی و تاکەکەســدا. بــەڵێ لــە قۆنــاغی کنواسـێۆندا و بـە تایبـەتی لـە توندڕوانـەترین قۆناغیــدا ، واتــە قۆنــاغی تۆقێنــەر (ی تــیرۆر) ســورترین شۆڕشـگێران واتـە ڕۆبسـپێر و سـەن ژۆســت، بــۆ بــەرپاکردنی دەوڵــەتی نــوێ و بەئەنجامگەیانــدنی شــۆڕش، ئیلــهامیان لــە دەوڵەتشــاری دێرینــەوە وەرگــرت کــە ڕۆســۆ کردبوویــە مــۆدەی ئــەو کاتــە. ئەمانــە بــە دەستدرێژیکردنی ئاشکرا بۆ مافەکانی مرۆڤ ، کردارێکی دیکتاتۆرانە و توندوتیژیان گرتە بەر، بۆئــــەوەی بــــە زۆر شــــارێکی نمونــــەیی دروســتبکەن و لێـرەوە رویـان لـە مۆدێرنـەی سیاسی وەرگێـڕا کـە بنـەماکانی چـەندان ساڵ پێشــتر راگەیــەنرابوو. بەمشــێوەیە توشــی ناکۆکیـەکی ئاشـکرا بـوون، چـونکە لەکاتێکـدا جوڵە بەرەو مۆدێرنەی سیاسی پێشتر دەستی پێکردبــوو، ئــەوان هەوڵیانــدا بگەڕێنــەوە بــۆ دەوڵەتشاری دێرین. بە دەربڕینێکی دی ئەوان دەیانویســت دەوڵــەتێکی پێشــمۆدێرن لــە چوارچێوەیەکی سیاسیدا بهێننە دی کە مۆدێرن بوو بوو. ئاشکراشە کارێکی وا ناکۆکیئامێز و نەشــیاوە. دواجــار مێــژوو هــەموو شــتەکانی یــــەکلاکردەوە: ڕوداوی تێپــــەڕ و ناعــــەقلانی تۆقانـدن، بـە شکسـتێکی کارەسـاتاوی کۆتـایی پێهــات و بکەرەکانیشــی هــەم بونــە قوربــانی ناهاوئاهــەنگی قــوڵی خۆیــان و هــەم قوربــانی زیادەڕەویــە شۆڕشــگێرانەکانی خۆیــان. ئــەم قۆناغـە تاریکـەی شـۆڕش، ڕێـك وەك سـەپاندنی جێگەیەك بەسەر کەنیسە و پێوەری تایبەت بە هــاولاتیبوون، بــە باشــی دەریــدەخات کــە مۆدێرنــەی سیاســی دەبــوو بــۆ بــەدیهاتنی، کۆمەڵێك ڕێگری گرنگ تێپەڕێنێت. ئەم راستیە بە باشی ڕونیدەکاتەوە کە چۆن بە پێچەوانەی ئەوەی لە ویلایەتە یەکگرتوەکاندا رویدا، لە فەرەنسادا مۆدێرنەی سیاسی لە پرۆسەیەکی درێژخایەن و پڕ گرفتدا، هاتە دی.

**سەرچاوە:**

وەرگێڕانـی فەسـڵی دوهـەمی بەشـی دوهـەمی ئـەم کتێبەی خوارەوەیە

مۆریس بارییە : مدرنیتەی سیاسی. ت:عبدالوهاب احمدی. تهران . اگه 1383.

# کەسایەتی دەسەڵاتخواز

**ئەریك فرۆم**

**لە فارسییەوە: ئاریا ئەحمەدی**

**تێبینی:**

ئەریك فرۆم (*erich fromm*) لە دیارترین نوێنەرانی قوتابخانەی دەروونناسی هیۆمانیستییە و ساڵی 1900 لە شاری (فرانکفۆرت/ ماین)ی ئەڵمانیا لەدایك بووە. فرۆم ساڵی 1927 خوێندنی لە بەشی دەروون شیکاری زانکۆی بەرلین تەواو کرد و لە ساڵەکانی 1929 بۆ 1932دا وەك مامۆستای دەروونناسی لە زانکۆی زانستە کۆمەڵایەتیەکانی فرانکفۆرت وانەی وتەوە. فرۆم پاشان ساڵی 1934 واتە ساڵێك پاش بە دەسەڵات گەیشتنی نازیەکان لە ئەڵمانیاوە ڕۆیشت بۆ ئەمریکا و لە زانکۆ باوەڕپێکراوەکانی (نیویۆرك و کۆلۆمبیا و کۆلورادۆ)ی ئەو وڵاتە، وەك مامۆستای دەروونناسی سەرقاڵی وانە وتنەوە بوو. فرۆم هەوڵی دەدا هەڵسەنگێنەرانە پەرەو بایەخ بدات بە قوتابخانەی دەرون شیکاری (زیگمۆند فرۆید). ئەو خۆی سەرقاڵ کردبوو بە پرسیارگەلێکی قوڵی کۆمەڵایەتی، کولتووری، فەلسەفی و دەروونناسی. بە تایبەتی هەوڵی ئەوەی دەدا لێکۆڵینەوە بکات لەسەر ئەو پێشمەرجە سایکۆلۆژیانەی بۆ پێکهاتەی کۆمەڵایەتی ڕەچاو دەکران. ئەریك فرۆم بە وردی چاودێری گۆڕانکارییە سیاسی و کۆمەڵایەتیەکانی ئەڵمانیای دەکرد لە سەردەمی دەسەڵاتدارێتی فاشیسمداو، چەندین نووسراوەو توێژینەوەی وردبینانەی لە بواری شرۆڤەکردنی سایکۆلۆژیانەی خەڵکی فاشیزم بڵاوکردەوە. زۆربەی بەرهەمەکانی فرۆم بۆ یەکەمین جار لە ئەمریکا بڵاوبوونەوەو دواتر وەرگێردرانە سەر زمانەکانی دیکە. بەشێك لە بەرهەمەکانی ئەریك فرۆم کە ساڵی 1980 کۆچی دوایی کرد، بریتین لە: (دەرون شیکاریو دین)، (دەروونناسی و کولتوور)، (زمانە لە بیرکراوەکان)، (پەیامی فرۆید)،

(بودیسم و دەرون شیکاری)، (دوگمەکانی مەسیح) و (تویکاری، ویرانگەری مرۆڤ).

ئەریك فرۆم لە لێکۆڵینەوەیەکیدا کە وەرگێڕانەکەی لە خوارەوە دەکەوێتە بەرچاوتان سەرقاڵی ڕاڤە و لێکۆڵینەوەی وردبینانەی ڕۆڵی دەسەڵاتخوازی دەبێت لە ناو کۆمەڵگادا. فرۆم لەم وتارەیدا، بە پشت بەستن بە ڕوانگەی کانت لە بواری فەلسەفەی ڕۆشنگەری، مرۆڤی ئەم سەردەمە (کە وەك زاتێکی عەقڵگەرا خۆی ڕزگار دەکات لە پێنەگەیشتوویی مەعنەوی و مەترسی و بەرپرسایەتی ئازادی خۆی قبوول دەکات) لەگەڵ مرۆڤێکی پێنەگەیشتوو جودا دەکاتەوە کە هەردەم خۆی بە مەرجەعێکەوە هەڵدەواسێت تاوەکو بەرپرسایەتی سەربەخۆبوونی نەبێت. فرۆم بە وردی هۆکارە دەرونییەکانی ئەم پێنەگەیشتنی مەعنەوییە دەخاتە بەر باس و بە پێچەوانەی ڕای گشتی نیشان دەدات: کەسایەتی دەسەڵاتخوازی ئەکتیڤ (یان بە تەعبیری خودی فرۆم مەرجەعی دەسەڵاتی سادیست "ئازاردانی ئەوانی تر") لەگەڵ کەسایەتی دەسەڵاتخوازی شوێن هەڵگر یان مازوخیست (خۆ ئازاردەر)، سەرەڕای جیاوازییە ڕواڵەتییەکانیان، پێوەندییەکی نەپساوەیان پێکەوە هەیە. فرۆم جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە هەردوو چەشنی کەسایەتی دەسەڵاتخواز خاوەن تایبەتمەندیگەلێکی هاوبەشی وەك پێنەگەیشتوویی مەعنەوی و ترسێکی قوڵی دەرونین. فرۆم لە هەمان کاتدا ئاگاداری جیاوازی نێوان دەسەڵاتخوازی عەقڵگەریە لەگەڵ دەسەڵاتخوازی عەقڵ ڕەتێن (عەقڵ پەڕێن، ناعەقڵانی).

ڕوانگەکانی ئەریك فرۆم بۆ ئێمە کە لە نیشتمانی خۆماندا لەگەڵ خراپترین شێوەکانی دەسەڵاتخوازی عەقڵ ڕەتێن بەرەو ڕووین و تازە لە قۆناغی دەستپێکردنی کێشمەکێشێك داین بۆ کۆتایی هێنان بە (پێنەگەیشتوویی خۆکردەی مەعنەوی)، خاوەن گەلێك خاڵی فێرکارییانەو پڕ بایەخە.

مەبەستمان لە (کەسایەتی دەسەڵاتخوازان) چییە؟ وەك باوە جیاوازی هەیە لە نێوان مرۆڤێك کە خوازیاری خستنە ژێر ڕکێف و کۆنترۆڵ و سەرکوتی کەسانی دیکەیە، لەگەڵ مرۆڤێك کە خوازیاری گوێڕایەڵی و فەرمانبەری و بچوك بوونەوەیە.

هەندێك جار ئەگەر بمانەوێت بۆ ئەم مەسەلەیە لە دەستەواژەی جوانتر کەڵك وەربگرین، دەتوانین (ڕابەر) و (پێڕەو) بەکاربهێنین. ئەگەر لە زۆر بوارەوە جیاوازی هەبێت لە نێوان فەرمانبەران و فەرماندەران، ئەوا ئەوەندەش لە ڕاستیدا هەردوو جۆر یان بە دەربڕینێکی دیکە هەردوو چەشنی کەسایەتی دەسەڵاتخواز پێوەندییەکی نزیك و نەپساوەیان پێکەوە هەیە.

ئەو شتەی لە قۆناغی یەکەمدا لە ناخی هەردوو جۆری دەسەڵاتخوازدا هاوبەشە و لە ڕاستیدا زات و جەوهەری کەسایەتی دەسەڵاتخواز پێك دەهێنێت، جۆرێك لە بێ تواناییە: بێ توانایی لە پشت بەستن بە خۆو سەربەخۆبوونی خۆ. یان بە دەربڕینێکی دیکە بێ تواناییە لە تەحەمولکردنی ئازادی.

خاڵی بەرامبەر کەسایەتی دەسەڵاتخواز، مرۆڤی باڵغ و پێگەیشتوویە: مرۆڤێك کە نابێت

خۆی بە کەسانی دیکەوە هەڵبواسێت. چونکە بە شێوەیەکی چالاکانە لە جیهان و مرۆڤ و شتەکانی دیکە تێدەگات و کەڵکیان لێوەردەگرێت. ئەمە چ مانایەکی هەیە؟ منداڵ هێشتا دەبێت بە کەسێکی دیکەوە پشت ببەستێت. لە ڕوانگەی جەستەییەوە ئەو منداڵە لە ناوسکی دایکیدا (لەگەڵ دایکیدا) دەبن بە یەك. لە ڕوانگەی دەرونیشەوە پاش ئەوەی ئەو منداڵە – هاتە دونیا، بۆ چەندین مانگ و هەندێك جار بۆ چەندین ساڵیش دەبێتە بەشێك لە دایك و ناتوانێت بە بێ ئەو بژی. بەڵام منداڵ گەورە دەبێت و پێدەگات: فێری پیاسە و قسەکردن دەبێت و زۆرتر دەکەوێتە شوێن ئاراستە جیهانیەکانی خۆی. منداڵ بە بەشێك لە پێداویستییەکانی مرۆڤ دەژمێردرێ و خاوەن دوو جۆرە چالاکیە کە دەتوانێت کامڵ یان پوختەی بکات. ئەو دوو جۆرە چالاکیە بریتین لە: عەشق و عەقڵ.

عەشق، پەیوەندی و پەیوەست بوونە بە دونیایەك کە تیایدا سەربەخۆیی و سەربەستی پارێزراو بێت. مرۆڤێکی سۆزبەخش پەیوەستە بە جیهانەوەو هیچ ترسێکی نیە، چونکە جیهانماڵی ئەوەو بە هۆی لە خۆ دڵنیابوونی، دەتوانێت کەمتر بیر لە خۆی بکاتەوە.

عەشق، ناسینی جیهانە لە ڕێی ئەزموونی هەستەوە. بەڵام جۆرە ناسینێکی دیکە هەیە کە بریتییە لە: "تێگەیشتن لە ڕێگای هزرەوە". تێگەیشتنێکی عەقڵی کە جیاوازی هەیە لەگەڵ تێگەیشتنی هۆشی. هۆش بەکارهێنانی هزرە بۆ گەیشتن بە ئامانجێکی تایبەتی کردەیی.

کاتێك مەیمونی جۆری (شەمپانزی) مۆزێك لە هەمبەر قەفەس بەدی دەکات و ناتوانێت ئەو مۆزە لە ڕێی دانە دانەی ئەو چێودەستیانەی کە لەناو قەفەسەکەدا هەن بەدەست بهێنێت، بۆ بەدەستهێنانی ئەو مۆزە دەڕوات چێودەستیەکان پێکەوە دەبەستێتەوە. ئەو مەیمونە لەو حاڵەتەدا هۆشی دەردەخات و بەکاری دەهێنێت. ئەمە هۆشی ئاژەڵێکە. هەمان هۆشی دەستەمۆکراو کە لای مرۆڤەکاندا بەفام یاخود بە تێگەیشتن ناوزەد دەکرێت. بەڵام عەقڵ شتێکی دیکەیە. عەقڵ جۆرە چالاکیەکی فکرییە کە هەوڵ دەدات لە ڕووکەشی شتەکانەوە بگاتە ناخ و نیوەرۆکیان، تاوەکو لەو ڕێگایەوە واقعی پشت ڕووداوو شتە نهێنیەکانی بۆ دەرکەوێت. هەروەها عەقڵ هەوڵی تێگەیشتن لە جەوهەر و کاکڵی هەموو ئەو هێز و نهێنییانە دەدات کە دیاریکەر و شوێندانەرن لەسەر دیاردەگەلێکی دیکە. کاتێك مرۆڤ کەڵك لە عەقڵ وەردەگرێت، ئیدی ترس و بێ دڵنیایی دایناگرێت. واتە چۆن لە ڕێگای عەشق و هەستی خۆیەوە پەیوەندی بە جیهانەوە دەگرێت، بە هەمان شێوەیش لە ڕێگای هزرییەوە پەیوەندی دەبێت لەگەڵ جیهانی خۆیدا.

من بە مەبەستی هەوڵدان بۆ تیشك خستنە سەر دەرخستنی زاتی کەسایەتی دەسەڵاتخواز تایبەتمەندی مرۆڤی پێگەیشتوو، عەقڵگەرا و سۆزبەخشم باس کرد. کەسایەتی دەسەڵاتخواز باڵغ نەبووە و پێنەگەیشتووە. ئەو توانای خۆشەویستی و کەڵك وەرگرتن لە عەقڵی خۆی نیەو دواهات یان ئەنجامی ئەو کارەشی، زاڵبوونی ترسێکی قووڵ و تەنهایی و

گۆشەگیربوونی دەبێت. کەسایەتی دەسەڵاتخواز پێویستی بە هەستێك هەیە بۆ پەیوەندی کردن کە لە ڕێیەوە، چ دیکە بۆ گەیشتن بەو هەستە پێویستی بە عەشق و عەقڵ نەبێت. کەسایەتی دەسەڵاتخواز ئەو هەستی پەیوەندییە، لە پەیوەندییەکی پێکەوە ژیاندا (*symboiotisch*) دەبینێتەوە. واتە لە پەیوەندییەك کە هەست بەوەك یەکبوونی خۆی دەکات لەگەڵ ئەوانی دیکەدا. بەڵام وەك یەکبوونێك کە لەسەر بنەمای پاراستنی کەسایەتی و سەربەخۆبوونی خۆی پێك نایەت، بەڵکو لەسەر بنەمای تواندنەوەو لەناوچوونی سەربەخۆیی کەسایەتییەتی لەگەڵ ئەوانی دیکەدا. کەسایەتی دەسەڵاتخواز پێویستی بە مرۆڤێکی دیکەیە کە تیایدا بتوێتەوە. چونکە بە تەنهایی توانای تەحەمولکردنی ترس و گۆشەگیربوونی نیە.

لێرەدا بە سنووری هاوبەشی نێوان دوو جۆر کەسایەتی جیاوازی دەسەڵاتخوازی فەرمانبەر و فەرماندەر دەگەین. بۆیە هەنووکە بە پێویستی دەزانین باس لە جیاوازیەکانی نێوان ئەم دوو جۆرە کەسایەتییە بکەین:

کەسایەتی دەسەڵاتخوازی شوێن هەڵگر یاخود بە واتایەکی دیکە کەسایەتی مازوخیستی (خۆئازاردان) خوازیاری گوێرایەڵییە و نا هۆشیارانە بە شوێن ئەم ئامانجەدایە کە خۆی بگۆڕێت بۆ بەشێك لە یەکەیەکی گەورەتر، و لە ڕێگای خۆهەڵواسین بە ئەوانی دیکەوە ببێت بە بەشێکی هەرچەندە بچوك لە مرۆڤ، دامەزراوە یاخود ئایدیایەکی (گەورەتر). ڕەنگە بە ڕاستی ئەم مرۆڤ و دامەزراوەو ئایدیایە پڕ بایەخ و بەهێز بن یاخود بە شێوەیەکی ساویلکانە لە بڕوای کەسایەتی مازوخیستیدا وەك پەیکەرێکی فووتێکراو خۆ بنوێنن. ئەوەی لێرەدا پێویستە باسی لێبکرێت ئەوەیە کە ئەم کەسە یاخود کەسایەتییە لەسەر ئەو بڕوایەدا بێت کە ڕابەر، حیزب، دەوڵەت یان ئایدیای (ئەو) بەرجەستە و بەهێزترەو خودی خۆیشی کاتێك بەهێز و مەزنتر دەبێت کە ببێت بە بەشێك لەم (گەورەییە)، دوو فاقیەتی و پارادۆکسێك کە لە جۆری کەسایەتی دەسەڵاتخوازی شوێن هەڵگردا دەردەکەوێت ئەوەیە کە خۆی بچووك دەکاتەوە بۆ ئەوەی — وەك بەشێك لە گەورەیی — گەورە ببێتەوە. ئەم کەسە دەیەوێت فەرمانبەری و گوێرایەڵی بکات بۆ ئەوەی پێویست نەکات خۆی بڕیار بدات و بەرپرسایەتی قبووڵ بکات. مرۆڤێکی پاشکۆو خۆ ئازاردەری لەم چەشنە، زۆربەی کات لە ناخەوە ترس دایدەگرێت و پتر بەشێوەیەکی ناهۆشیارانە هەست بە بێ توانایی و بچووك بوونەوە و تەنیایی خۆی دەکات. هەر بەم هۆیەوە دەکەوێتە شوێن (ڕابەر) و دەسەڵاتێکی گەورە و باڵاتر بۆ ئەوەی لە ڕێگای تێکەڵاوبوون و هاوبەشی کردن لەگەڵیاندا، بە ئاسایش بگات و زاڵ بێت بەسەر هەستی خۆ بە (بچووك بینین). ئەو کەسە هۆشیارانە بڕوای بەوە هەیە کە ڕابەر، حیزب، دەوڵەت و هەر شتێکی دیکەی بەرچاوی ئەو، یەکسان و پەرچوو (موعجیزە) ئاسا و بەهێزترینە. کەسایەتی دەسەڵاتخوازی مازوخیستی ناهوشیارانە هەست بە لاوازی و بێ توانایی خۆی دەکات. ئەو بۆ زاڵبوون بەسەر ئەو هەستەدا پێویستی بە ڕابەرێك هەیە. ئەم مرۆڤی

خۆئازاردەر و فەرمانبەرە کە ترسی لە ئازادی هەیە و لە ترسی ئازادیدا پەنا بۆ بتپەرستی دەبات، مرۆڤێکە سیستەمە دەسەڵاتخوازەکانی نازیسم و ستالینیزم لەسەر شانی ئەو دامەزراون.

تێگەیشتن لە کەسایەتی دەسەڵاتخوازی شوێندانەر و سادیستی (ئازاردانی ئەوانی تر)، دژوارترە لە تێگەیشتن لە کەسایەتی دەسەڵاتخوازی شوێن هەڵگر و مازوخیستی (خۆ ئازاردەر). کەسایەتی دەسەڵاتخوازی سادیستی لە ڕوانگەی لایەنگرانییەوە لە خۆ دڵنیاو بەهێز دەردەکەوێت، بەڵام لە ڕاستیدا ئەم کەسایەتییەش وەك کەسایەتی مازوخیستی ترسنۆك و گۆشەگیرە. کەسایەتی مازوخیستی هەست بە بەهێزبوونی خۆی دەکات چونکە بەشێکی گرنگە لە شتێکی گەورەتردا. کەسایەتی سادیستی هەست بە بەهێزبوونی خۆی دەکات چونکە ئەوانی ترو گەر بۆی بگونجێت زۆر کەسی دیکە لە خۆیدا قبوولْ دەکات و قووتیان دەدات. کەسایەتی دەسەڵاتخوازی سادیستی (ئازاردانی ئەوانی تر) هەر وەك چۆن فەرمانبەرەکانی دەبنە پاشکۆی، ئەویش ئاوەها دەبێت بە پاشکۆ و وابەستەی ئەوان. بەڵام ئەم وێناو تێگەیشتنە لە رابەر (کەسایەتی دەسەڵاتخوازی سادیستی) هەڵخەڵەتێنەرە کە پێمان وابێت ئەو کەسایەتییە بۆ خۆی دەسەلات و توانای هەیە بۆیە لە ڕوانگەی خۆی و کەسانی دیکەشەوە بە هێز و بە توانا دەردەکەوێت. ئەو ڕوانگە هەڵخەڵەتێنەرە، چونکە نەبوونی دڵنیایی و بێ توانایی قوڵی ئەو کەسایەتییە کاتێك دەردەکەوێت کە دەسەلاتی خۆی لە دەست دابێت و چ دیکە نەتوانێت کەسانی تر قوت بدات و ناچار بێت پشت بە خۆی ببەستێت.

کاتێك وەك نمونەیەکی ئەکتیڤی کەسایەتی دەسەڵاتخواز باس لە سادیسم دەکەم، دەبێت لای زۆرێك لە خوێنەران سەرسامی دروست بێت. چونکە وەك باوە لە (سادیسم)دا مرۆڤ لە مەیلی ئازاردان و دروستکردنی دەرد و گرفت بۆ ئەوانی دیکە تێدەگات. بەڵام لە راستیدا ئەم کارە لە (سادیسم)دا دیاریکەر و دەستنیشانکەر نییە. ڕەگ و ڕیشەی نمونە دیار و جیاوازەکانی سادیسم لەوەدا خۆ دەبینێتەوە کە بە تەواوەتی مرۆڤێکی دیکە بخاتە ژێر رکێفی خۆیەوە و بیکات بە ئامێر و مۆرەیەك لە هەمبەر ئێمەدا. ئیرادەی ئێمەیەك کە دەبێت زالْ بێت بەسەر ئەوداو بەپێی لێکدانەوەمان بە شێوەی ڕەها ببین بە خاوەنی (ئەو). بچووك کردنەوەو کۆیلەکردنی مرۆڤێکی دیکە تەنها ئامێرگەلێکن لە خزمەت ئامانجەکانی (سادیسم)دا. ڕادیکاڵترین ئامێر بۆ بچوك کردنەوەو بە کۆیلەکردنی مرۆڤەکانی دیکە، پەککخستن و سەپاندنی بیْ دەسەڵاتییە بەسەریاندا. چونکە هیچ دەسەڵاتێك لەوە بالاتر و تاڵتر نییە مرۆڤێکی دیکە ئازار بدەیت و ناچاری بکەیت دەرد و گرفتەکان قبوولْ بکات بیْ ئەوەی بتوانێت داکۆکی لە خۆی بکات.

هەروەك ئاماژەم پێکرد کەسایەتی جۆری (سادیستی) هەڵخەڵەتێنەرە. ئەو لە ڕواڵەتدا خۆی بە هێز نیشان دەدات لە کاتێکدا ئەویش بە مانای قووڵی ئینسانی وەك مرۆڤی جۆری مازوخیستی (خۆ ئازاردەر) لاوازە. ئەو چەندە

فەرمانبەرەکانی پێویستیان پێی هەیە ئەویش بە هەمان ڕێژە پێویستی بەوان هەیە و تەنیا تێگەیشتنێکی جیاواز کە لە نێوان ئەم دوو جۆرە کەسایەتییە دەسەڵاتخوازەدا دەردەکەوێت ئەوەیە کە، گوایا فەرماندەری فەرمانبەر و پاشکۆکان سەربەست و سەربەخۆیە. بەڵام لە ڕاستیدا ئەو دوو جۆرە کەسایەتییە پێویستی و تەواوکەری یەکدین.

واقعی هەردوو جۆرەی کەسایەتی دەسەڵاتخواز بۆ ڕاستیەکی هاوبەش واتە خواستی پێکەوە ژیان دەگەڕێتەوە. ئەم واقعەش تێگەیشتنمان لەو مەسەلەیەدا سانا دەکات کە بۆچی مرۆڤ ڕووبەرووی زۆرێك لە کەسایەتییە دەسەڵاتخوازەکانی وەك مازوخیستی و سادیستی دەبێتەوە. چونکە وەك باوە تەنیا پێوەرەکان جیاوازن. هەموومان ملهور و زۆرداری ماڵ دەناسین کە لەگەڵ هاوسەر و منداڵەکانی هەڵسوکەوتێکی سادیستیانەی هەیە، بەڵام لە ئیدارە و لە بەرامبەر سەرۆکی خۆیدا دەبێت بە کارمەندێکی گوێڕایەڵ. ئەگەر بمانەوێت نمونەیەکی دیار بهێنینەوە دەتوانین ئاماژە بە هیتلەر بکەین. هیتلەر شەیدای ئەو هەستە دەروونییە بوو کە دەسەڵاتی ئەڵمانیا و گشت جیهان بگرێتە دەست و خەڵك بکات بە ئامێرێکی بێ گیان و بێ توانا لە ئاست ئیرادەی تاکەکەسی خۆیدا. ئەوە لە حاڵێکدا بوو کە خودی هیتلەر مرۆڤێکی پاشکۆ و وابەستە بوو. وابەستە بوو بە چەپڵەڕێزان کردنی لە لایەن خەڵکەوە، بە پەسەندکردن و هاندان و پشتگیری کردنی راوێژکارەکانی. هەروەها وابەستە بوو بەو شتەی کە خۆی بە دەسەڵاتی باڵای سروشت و چارەنووس و مێژوو ناوی دەبرد. هیتلەر بۆ بەدیهێنانی ئایدیا و خواستەکانی لە ڕێباز و باوەرە مەزهەبیەکان کەڵکی وەردەگرت. بۆ نموونە دەیگوت: "ئاسمان باڵاتر و لەپێشترە لە خەڵك، چونکە بەختەوەرانە دەتوانرێت خەڵك هەڵبخەڵەتێندرێت بەڵام ناتوانرێت ئاسمان فریو بدرێت". ئەو دەسەڵاتەی کە پێش لە خوداو چارەنووس و مێژوو هیتلێری خستە ژێر کاریگەری خۆیەوە، سروشت بوو. بە پێچەوانەی هەوڵی (400) ساڵی ڕابردوو بۆ زاڵبوون بەسەر سروشت، هیتلێر جەختی لەسەر ئەوە دەکردەوە کە مرۆڤێك دەتوانێت بەسەر مرۆڤێکی دیکەدا زاڵ بێت بەڵام هەرگیز ناتوانێت و نابێت بەسەر سروشتدا زاڵ بێت. ئێمە تێکەڵاویەکی تایبەتی لە ئینتیمای مازوخیستی و سادیستی لە کەسایەتی دەسەڵاتخوازی هیتلێردا بەدی دەکەین: سروشت دەسەڵاتێکی بەهێزە کە دەبێت گوێڕایەڵی بین، بەڵام بوونەوەرە زیندووەکان بۆ ئەوە هاتونەتە دونیاوە کە لە ژێر دەسەڵاتی ئێمەدا بن.

بەبێ باس کردنی مەسەلەیەك کە بۆتە سەرچاوەی زۆرێك لە خراپ لێکتێگەیشتنەکان، ناتوانین کۆتایی بەم بابەتە واتە کەسایەتی دەسەڵاتخواز بێنین. ئەگەر بە فەرمی ناساندنی دەسەڵات، مازوخیسم و کردەی دەسەڵات بە واتای سادیسم دێت، ئایا ئەوە بەو مانایەیە کە گشت سەرچاوەکانی دیکە دەسەڵات هەڵگری ناوەرۆکێکی زیانناسانە (*pathologisch*)یە؟ ئەو پرسیارە جیاوازی نێوان دەسەڵاتی (عەقڵانی) و

دەســـەڵاتی (عـــەقڵ ڕەتـــێن) ڕەچـــاو ناكـــات. ئۆتۆریتـــە یـــان دەســـەڵاتی عـــەقڵ گـــەر، قبـــووڵ كردنـــــی ئۆتۆریتەیـــــە لەســـــەر بنـــــەمای هەڵســـەنگاندنی شـــیاوی و لێهـــاتوویی. كاتێـــك قوتابییـــەك ئۆتۆریتـــەی مامۆســـتاكەی قبـــووڵ دەكات بەو هۆیەی كە زانیاری لەو زیاترە، ئەوە بـــە مانـــای هەڵســـەنگاندنێكی ژیرانەیـــە لەســـەر شـــیاوبوونی ئـــەو مامۆســـتایە. منـــیش ئەگـــەر گەشـــتیاری كەشـــتییەك بم، ئۆتۆریتـــەی كـــاپتنی كەشـــتیەكە قبـــووڵ دەكـــەم. چـــونكە لـــە كـــاتی ڕوودانی مەترسیدا فەرمانی دروست و پێویست دەدات. دەســـەڵات یـــاخود ئۆتۆریتـــەی عـــەقڵ لەســـــەر بنـــــەمای یەككـــــەوتنی عـــــەقڵ و ڕەتكردنـــەوەی مـــن (خـــود) ڕانەوەســـتاوە بـــەڵكوو عەقڵ و ڕەخنە لە خۆگرتن و باوەڕ بەخۆبوون بە مەرجێكی پێویست دادەنێت. ئەوە تێڕوانینێك نیـــە مـــن بچـــووك بكاتـــەوە و چـــاوگەی دەســـەڵات گـــەورە بكـــات. ئـــەو تێڕوانینـــە ڕێخۆشـــكەرە بـــۆ ئـــــەوەی ئۆتۆریتـــــە بـــــەردەوام و لـــــە هـــــەموو شـــوێنێك لەســـەر بنـــەمای شـــیاوی و لێهـــاتوویی باڵادەست بێت.

بـــەڵام دەســـەڵاتی عـــەقڵ ڕەتـــێن لـــە بنەڕەتـــدا جیـــاوازی هەیـــە لەگـــەڵ ئۆتۆریتـــەی عـــەقڵ گـــەرا، چونكە پشـتی بـە گوێڕایـەڵی كردنـی ئیحساسـی مـــن (خـــۆی) بەســـتووە بەرامبـــەر بـــە مرۆڤێكـــی دیكە. بۆ وێنە: "من لەسەر ئەو بڕوایـەم كە ئەو لەسەر هەقە. ئەویش نەك لەبەر ئەو هۆیـەی كە لێهـــاتوویی و شـــیاوی هـــەبێت و مـــن لـــە ڕووی عەقڵەوە شیاوی ئەو قبووڵ بكەم". لە پەیوەندی لەگـــەڵ دەســـەڵاتی عـــەقڵ ڕەتێنـــدا پێویســـتە بگوترێـــت گوێڕایـــەڵی و مـــل نوانـــدنێكی مازۆخیســـتیانە لـــە ئارادایـــە. وەك "مـــن خـــۆم بچـــووك دەكەمـــەوە و دەســـەڵات لـــە خـــۆم گـــەورەتر دەكـــەم". یـــان "مـــن دەبێـــت ئـــەو گـــەورە بكەمـــەوە بۆئـــەوەی خۆیشـــم بتـــوانم وەك بەشـــێك لـــە (ئـــەو)دا گـــەورە ببمـــەوە". ئۆتۆریتـــەی عەقڵگـــەرا خـــاوەن ئـــەو ئینتیمـــاو تایبەتمەندییەیـــە كـــە خـــۆی گـــەورە و مـــەزن بكاتـــەوە چـــونكە" (مـــن) هەرچـــی پـــتر تێبگـەم و فێربـبم مـەودای خـۆم لەگـەڵ چاوگەی دەسـەڵاتدا كـەمتر دەكەمـەوە". بـەڵام دەسـەڵاتی عـــەقڵ ڕەتـــێن خـــاوەن ئـــەو ئینتیمـــا و تایبەتمەندییەیـە كـە خـۆی بچـووك بكاتـەوە و ماوەی وابەستە بوونەكەشی زیاتر بكات. "من هەرچەندە ماوەی پاشكۆ و وابەستە بوونم پتر بكـــەم لاوازتـــر دەبم بۆیـــە پێویســـتیم بـــە گوێڕایەڵی و خۆهەڵواسین بە چاوگەی دەسەڵات زیـــاتر دەبێـــت". گـــەورەترین بزوتنـــەوە دیكتاتۆریەكانی سەردەمی ئێمە لەسەر بنەمای دەســـەڵاتی عـــەقڵ ڕەتـــێن بـــەردەوام بـــوون و (بـــەردەوامن). پەیـــڕەوی ســـەركەوتنی ئـــەو دیكتاتۆرانـــە هەســـت و لاوازی و تـــرس و پشـتگیری كردنـی تـاكی گوێڕایـەڵ بـووە لـە ڕێبەرایـەتی كردنیـان. بـەڵام گشـت كولتـوورە ڕاهێنـەر و مەزنـەكانی دونیـا لەسـەر بنـەمای ئۆتۆریتـەی عەقڵگـەری بـەردەوام بـوون: لەسـەر شـــانی ئـــەو مرۆڤانـــەی كـــە شـــیاو بـــوون و ئـــەركی پێســـپێردراوی خۆیـــان لـــە بـــواری مەعنـەوی و كۆمەڵایـەتی بـە ئـەنجام گەیانـد و لـــەو ڕووەشـــدا پێویســـتیان بـــەوە نـــەبوو كـــە شەیدای دەسەڵاتی عەقڵ ڕەتێنی ئەوانی تر بن و پشتیان پێ ببەستن.

حەز دەکەم پێش لە کۆتایی پێهێنانی ئەم باسە جەخت لەسەر ئەوە بکەمەوە کە پێویستە ئامانجی مرۆڤ ئەوە بێت کە خۆی وەك سەرچاوەی دەسەلأت ببینێت. واتە لە مەسەلە ئەخلاقییەکاندا بە ویژدان و لە مەسەلە هزرییەکاندا خاوەن بڕواو لە مەسەلە ئیحساسیەکاندا راستگۆ بێت. مرۆڤ ئەو کاتە دەتوانێت ببێت بە خاوەنی ئەو دەسەلأتە دەروونییە کە وەك پێویست پوختە و باڵغ بێت بۆ ئەوەی تێگەیشتنی لە ژیان، بە عەقڵ و عەشقەوە بێت.

گەشەپێدانی ئەم تایبەتمەندیانە بنەمایەکە بۆ دەسەلأتی تاکەکەسی و لە رێگای ئەویشەوە بناغەیەکە بۆ دیموکراسی سیاسی.

**سەرچاوە:**

سایتی (www.andishe.de)

# زانین وەکو دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی

شۆڤ سایەز
لە ئینگلیزییەوە: سەدرەدین عارف

بیرۆکـەی ئـەوەی کـە زانـین (*Knowledge* = معرفـە) دیاردەیـەکی کۆمەڵایەتییـە دەمێکـە کۆنبووە و زانراوە. لەگـەڵ پەرەسـەندنی زانسـتە کۆمەڵایەتییەکانـدا بـەوە راهـاتووین کـە بـیر (*ideas*) و باوەڕەکـان (*beliefs*) بـە زاراوەی کۆمەڵایەتی و مێژوویی باسبکەین و هەوڵبدەین لـەوە تێبگـەین ئـەم بـیرو باوەڕانـە چـۆن پەیـدا دەبـن و ئـەو شـێوازانە وەردەگـرن کـە وەریانگرتووە.

بەهـەرحاڵ، فەیلەسـووفەکان بەرەبەرە لەگـەڵ ئـەم دیـد و بۆچـوونەدا رێکدەکـەون کـە ئـەو بیرۆکانـەی هـەن دەربـارەی سروشـتی زانین و لـە سەدەی حەڤدەوە زاڵە بەسـەر ئەپسـتیمۆلۆجیدا بخەنە ژێر پرسیارەوە.

دوو لقـی سـەرەکیی فەلسـەفە، ئەقڵانییـەت و ئەزموونگەرایی، وایدادەنێن کە زانینی رەسـەن و راسـتەقینە لـە راسـتییە رەهاکـان پێکهـاتووە، بیرۆکـە هەڵـەکان (*False*) وەکـو سـەراوێکی (سـەرابێکی) رووت و خـەیاڵێك سـەیر دەکـرێن، کـە دەبێـت ئاشـکرا بکـرێن و "لـەناو بـبرێن". بێگومـان ئـەم فەیلەسـووفانە دەزانـن کـە بـیرو باوەڕەکـان کاریگـەریی کۆمەڵایـەتیان لەسـەرە. شـتێکی تـازە نییـە ئەگـەر بڵـێین کـە کەسـانی جیـاواز، لـە کۆمـەڵگای جیـاوازدا و لـە قۆنـاغی مێژوویی جیاوازدا، جیهان بەشێوەیەکی جیاواز دەبیـنن. بەهـەرحاڵ، ئـەم کاریگەرییانـە وەکـو شـتێکی نـەرمێن و شـێوێنەر دەبینـرێن، وەکـو سەرچاوەی هەڵە و خەیاڵ کە دەبێت لـەناوببرێن ئەگەر بمانەوێت زانینی رەسەن و راستەقینەمان بەدەستبکەوێت.

ئامانجی ئەپستیمۆلۆجیی باستانی ئەوەبوو کە میتۆدێکمان پێببەخشێت کە هـەمان کارمان

بۆ بکات. مەبەستی ئەو ئەپیستیمۆلۆجییە دامەزراندنی بناغەیەکی گومانلێنەکراو و پەسەندکراوی گەردوونی بوو بۆ زانین لە ڕێی ئەزموونی ڕاستەوخۆوە یان بەهۆی بەڵگەی پێشینییەوە *apriori reason*.

لەم ڕێگەیەوە دەخوازێت داواکارییەکانی بۆ زانین مسۆگەر بکات و گومانداری *scepticism* بخاتەوە. ڕوونکردنەوەی کۆمەڵایەتی هەڕەشەی بنکۆڵکردنی هەموو ئەم بۆچوونانە دەکات، چونکە گومان لەو بۆچوونە دەکات کە دەڵێت یان ئەزموون یان ئەقڵ ئەو بەردە بناغەیەیە کە زانین لەسەری دادەمەزرێت. هەموو بیرو باوەڕەکان بەرهەمی کۆمەڵایەتین. کاریگەریی کۆمەڵگا لەناو نابرێت. زانین کارێکی سەراپا کۆمەڵایەتییە.

زۆرجار وا بیردەکرێتەوە کە ئەم بۆچوونە بێگومان دەبێتە هۆی ڕێژەگەرایی و گومانداری. هەندێك نووسەری هاوچەرخ هێشتا لە دەرخستنی ئەم ئەنجامە دەرباز نەبوون. لە ترسی ئەم حاڵەتە زۆر کەس هەن کە بۆچوونی کۆمەڵایەتی بۆ زانین بە تەواوی ڕەتدەکەنەوەو پشتگیری چەمکی باستانیی ڕاستیی ڕەهاو هەڵەی ڕەها دەکەن. هەوڵدەدەن ئەم کارەش لە ڕێگەی جەختکردن لەسەر ئەو ڕایەوە ئەنجامبدەن کە دەڵێت ئەو ڕاستییانەی کە لە بارەی ڕەوشتی کۆمەڵایەتیی بیرۆکەکانەوە هەن هیچ گرنگییەکیان نییە لە پرسیارە ئەپیستیمۆلۆجیەکاندا دەربارەی ڕاستی و ناڕاستی *falsity*. بەمجۆرە ڕووبەڕووی دوو ئەلتەرنەتیڤ دەبینەوە کە هیچ کامیان قایلکەرنین ئەویش ئەوەیە کە یان دەبێت دان بەوەدا بنێین کە زانین دیاردەیەکی کۆمەڵایەتییەو لە ئەنجامدا تووشی ڕێژەگەرایی ببین، یان دەبێت خۆمان ببەستینەوە بە دیدە ڕەهاکەو نکوڵی لە وێنەی کۆمەڵایەتیی زانین بکەین. ئەم دووە، بە گشتی، بە تاقە ئەلتەرنەتیڤ دەژمێردرێن. ئەتوانم بەڵگە بهێنمەوە کە وا نییە، چونکە دەشێت دان بەوەدا بنێین کە زانین دیاردەیەکی کۆمەڵایەتییە بێئەوەی دابەزین بۆ ئاستی ڕێژەگەرایی یان گومانداری. ڕێگەیەکی دیکە هەیە، ئەویش بۆچوونی کۆمەڵایەتی و مێژووییە بۆ زانین کە لەلایەن هیگل و مارکسەوە بە تەواوی گەشەی پێدرا.

## هیگڵ

لەوانەیە هیگڵ یەکەم بیرمەندی گەورەی ئەوروپی بێت کە لە ڕووی کۆمەڵایەتی و مێژووییەوە لە زانین گەیشتبێت. هیگڵ دەیزانی کە بەم کارەی بەرەنگاری ئەو وێنە باستانییەی زانین دەبێتەوە کە هەیە و لەگەڵیدا ڕووبەڕووی چەمکەکانی ڕاستیی ڕەها و هەڵەی ڕەها دەبێتەوە. خۆی ئەم حاڵە لە پێشەکیی کتێبی (دیاردەی ڕۆح *phenomenology of spirit*) باس دەکات. لەوانەیە هەر لەبەر ئەم هۆیەش بێت کە زۆرجار پشتگیریی ڕێژەگەرایی دەکات. بەڵام وانییە. هیگڵ زۆر واقیعی بوو، بە تەواوی پابەندی چەمکە بابەتییەکان و ڕاستی بوو.

هیگڵ بەرگری لە دیدی خۆی دەکات و بە زانستیی دادەنێت و ڕەخنە لە فەیلەسووفەکانی پێشوو دەکات و بۆچوونەکانیان بە هەڵە و ناتەواو لە زۆر لایەندا دادەنێت، بەڵام تەواو

بەهەڵەیان دانانێت و پشتگوێیان ناخات. هیگڵ جەخت لەسەر ئەوە دەکات کە ئەگەر مێژووی هزرێك لەسەر بناغەی ئەو مەرجانە دامەزرابێت هیچ واتایەك نابەخشێت و تەنها دەبێتە "مووزەخانەیەك بۆ لادانەکان لە روشنبیریی مرۆڤایەتیدا" و تەنها لیستێك بۆ دید و بۆچوونە هەڵەکان.

لە بری ئەوە، ئێمە دەبێت وا بڕوانین کە زانین شتێکە بە شێوەیەکی پێشکەوتووخوازانە گەشە دەکات. تیۆرەکانی پێشوو چەند قۆناغێکی پێویستیان لەم پرۆسەیەدا دامەزراندوە، چونکە تیۆرەکانی پێشوو هەندێك لایەنی راستیان تێدابوو کە پارێزراون و تێکەڵاوی ئەو تیۆرە تازانە کراون کە لێیانەوە پەیدا دەبن و نموونەی باش و پەسەندن. بەمشێوەیە، بۆچوونە لابراوەکان نە بە تەواوی بە هەڵە دادەنرێن و نە لە کاتی پێشکەوتنی زانیندا بە تەواوی فڕێدەدرێن.

لە هەمان کاتدا، ئەم روونکردنەوەیە گوماندەخاتە سەر بیرۆکەی راستی رەها، تەنانەت ئەگەر هیگل خۆیشی دوو دڵ بێت لەوەی کە پرسیار لەم بارەیەوە بکات، چونکە مێژووی زانین پرۆسەیەکی بێکۆتاییە و ئەو تیۆرانەی پێشوو کە کەمتر تەواون بەردەوام دەگۆڕدرێن بە تیۆری راستتر و پەسەندتر و هەرگیز ناگەنە "راستی رەها"، واتا خاڵێك کە لەودیو ئەوەوە پێشکەوتنی زیاتر نەشیاو بێت.

لەبەرئەوە، بە بەراوورد لەگەڵ بۆچوونە باستانییەکاندا، هیگڵ زانین وەکو بنیاتنانی سەرخانێکی (*super structure*) نەگۆڕ نابینێت کە لەسەر بناغەیەکی هەمیشە چەسپاو دامەزرابێت، بەڵکوو تێگەیشتنمان هەمیشە بەرەو پێشەوە دەڕوات لە پرۆسەیەکدا کە تیایدا هەموو قۆناغێك بۆ دەرکەوتنی قۆناغەکەی دواتر پێویستە. لە نووسینەکانی هیگڵدا ئەم پرۆسەیە زۆرجار بە گەشەکردنی رووەکەکان بەراورد دەکرێت. لە رووەکدا، چرۆکان لە کاتی پشکووتنی گوڵەکاندا نامێنن. مرۆڤ دەتوانێت بڵێت کە گوڵەکان بەرپەرچی چرۆکانیان داوەتەوە. بە هەمان شێوە، کاتێك میوە پەیدا دەبێت گوڵەکان نامێنن، کە لەم حاڵەتەدا دەتوانین بڵێین کە گوڵەکان خستنە رووی هەڵەی (*false manifestation*) رووەکەکەیە.

ئەم شێوانەی رووەك هەر بە تەنها لە یەکتری جیاناکرێنەوە بەڵکوو جێی یەکتریش دەگرنەوە وەکو دوو شتی پێکەوە نەگونجاو. بەڵام، لە هەمان کاتدا، سروشتە نەرمەکەیان وایان لێدەکات ببنە ماوەی یەکگرتنی ئۆرگانی، کە نەك تەنها ناکۆك نابن بەڵکو پێویست دەبن بۆ یەکتر، تەنها ئەم پێویستیە دوو لایەش ژیانی هەموو پێکدەهێنێت.

## چەمکی ئایدیۆلۆجی

هەمان جۆرە بیر لە فەلسەفەی مارکسیشدا هەیە. مارکس گریمانەی ئەوە دەکات کە بیر بەرهەمێکی کۆمەڵایەتی و مێژووییە و بە ئایدیۆلۆجیی دەژمێرێت. ئەم زاراوەیە بەشێوەی جۆراوجۆر لەلایەن زانا کۆمەڵایەتییەکانەوە بەکارهاتووە. زۆر جار بە واتای گومان و نەرێیەتییەوە (*negative*) بەکاردێت. کاتێك کە دەڵێین بیرێك

"ئایدیۆلۆجییە" ئەو بیرە رەتدەکەینەوەو بە هەڵە و رێژەیی و ناتەواوی دادەنێین.

بەهەرحاڵ، ئێمە ناتوانین بە تەواوی لە رێی ئەم زاراوانەوە (*terms*) لە فەلسەفەی مارکس بگەین. ئەمە بە باشی لە لێکۆڵینەوەکەی مارکس دەربارەی ئایین بەدیدەکرێت. بێگومان، مارکس بیرە ئایینییەکان بە ئایدیۆلۆجیا دادەنێت. پێویست ناکات ئەوە بڵێین کە مارکس لە رەخنەگرتن لە ئاییندا سازش ناکات چونکە ماددییە و باوەڕی بەخودا نییە. لەگەڵ ئەوەشدا چارەسەرییەکەی بۆ مەسەلەی ئایین جیاوازە لەو رەخنەگرانەی ئایین کە ماددی بوون یان خودا نەناس بوون. ئەوان ئایینیان رەتدەکردەوەو وەکو خەیاڵێکیان (وەهم *illusion*) دادەنا کە لە ئەنجامی نەزانینەوە پەیدا بووە و قەشە و فەرمانڕەواکان برەویان پێداوە بۆ ئەوەی خەڵك لەگەڵ دامەزراوەکاندا بگونجێن، مارکس بەشێکی زۆری ئەم بۆچوونانەی لا پەسەند بوو، بەڵام لێکۆڵینەوەکانی ئەو لە زۆر لایەنی گرنگەوە جیاوازیی هەیە چونکە بە بۆچوونی مارکس بیرە ئایینیەکان خەیاڵێکی رووت و هەرەمەکی نین.

مارکس بۆچوونە رەخنەییەکانی "هیگلییە گەنجەکانی" وەکو شتراوس (لە کتێبی ژیانی مەسیح 1835) و نیورباخ (لە کتێبی گەوهەری مەسیحیەت 1841) وەرگرت و پەرەی پێدان. مارکس جەختدەکات کە ئایین ناوەرۆکێکی راستی (واقعی) هەیە، هەرچەند شێواوە. هەرچەند بیرۆکە ئایینیەکان خەیاڵ و فەنتازیان –"ئەفیونی میللەتان"ن– بەڵام ناوەرۆکێکی راستی دەردەبڕن. ئەمەش کاتێك دەردەکەوێت کە لەو هەموو مەرجانە بگەین کە دەبنە هۆی بیرە ئایینییەکان و ئەو کاردانەوانەی کە تیایدا دەردەبڕێن:

(چەوسانەوەی ئایینی دەربڕینی چەوساندنەوەی راستییە و پروتۆستۆکردنی چەوساندنەوەی راستییە. ئایین نیشانەی بوونەوەرێکی چەوسێنراوە، دڵی دنیایەکی بێدڵە و رۆحی هەلومەرجێکی بێرۆحە *soulless*.)

بە کورتی، ئایین رەنگدانەوەی بارودۆخێکی بابەتییە و گوزارشی بەرزخوازییە راستییەکانە، هەرچەند کە بەشێوەیەکی شێواو پێشکەشدەکرێن و دەخرێنە نێو فۆرمێکی ئەفسانەیی و ئاسمانییەوە. بەمجۆرە، دنیای ئایین هەڵدەوەشێنرێتەوە بۆ سەر بنەما دنیاییەکانی. مارکس لەم بارەیەوە دەڵێت: "بەمجۆرە نهێنی خێزانە رەمینییەکەمان بۆ دەردەکەوێت کە هەر خۆی خێزانە پیرۆزەکەیە." مارکس ئەم شیکردنەوەیە بەرەو پێشتر دەبات. ئەو نەك هەر هەوڵی لێکدانەوە و دۆزینەوەی واتای شێوە ئایدیۆلۆجییەکانی ئاگایی دەدات، بەڵکو هەوڵی لێکدانەوەو راڤەکردنی سەرچاوەکانیشیان دەدات و دەیەوێت هۆی شێواویی شێوە نامۆکەیان روونبکاتەوە. لە وەسفی ئەو گریمانە گشتییانەی کە بنەمای ئەم بۆچوونەن دەنووسێت: (ئاگایی هەرگیز لە بوونێکی ئاگا زیاتر نییە، بوونی مرۆڤیش پرۆسەی راستیی ژیانیانە. ئەگەر لە هەموو ئایدیۆلۆجیەکاندا مرۆڤ و بارودۆخەکەی سەربەرەو خوار (وەکو لە *camera obscura* دەردەکەوێت) هۆی ئەو دیاردەیەش پرۆسەی

مێـژوویی ژیانیـەتی وەکـو چـۆن هەڵگەڕانـەوەی شـتەکان (بابەتـەکان) لـە تـۆڕی چـاودا (*retina*) بەهۆی پرۆسەی فیزیاییەوە). دەردەکەون.

بـە واتایـەکی دیکـە، ئاگـایی هەمیشـە لـە واقیعـەوە هەڵدێت و ڕەنگدەداتـەوە، تەنانـەت لـە شێواندنەکانیشیدا. ئەمەش ئەوە دەردەخات کە هەڵــە و وەهمـــی ڕەهـــا بـــوونی نییـــە — لـــە هــەموو بیرۆکەیەکــدا کــە بــاوەڕی پێــدەکرێت لایەنێکی ڕاستیی تێدایە، هەرچەند هەڵەو قەڵب بێنە بەرچاو.

بـەڵام، بـە پێچەوانەشـەوە هـیچ ڕاسـتییەکی ڕەهـــا نییـــە. زانـــین هـــەرگیز دڵنیاییـــەکی گومانلێنـەکراوو نـەگۆڕ نییـە، هەمیشـە بەرهـەمی هەلومـــەرجێکی کۆمەڵایـــەتی و مێژووییـــە، لەبەرئـــــەوە ســـــنووردارە. زانـــین تـــەنها نزیکبوونەوەیـەکی کـەم و زیـادە لـە ڕاسـتییەوە. شـتێکی ڕێـژەیی و ناتـەواوە. بـەڵام ئەمـە بـەو واتایە نییە کە هیچ جۆرە بەڵگە هێنانەوەیەکی تێـدا نییـە و تـەنها شـتێکی ڕێژەییـە. بـەپێی هیگـڵ و مـارکس نـە ڕێژەگـەریی تـەواو نـە بێگومـــانی ڕوونکردنەوەیـــەکی قایلکـــەر دەبەخشن. دەبێت واز لـە زیـادەڕۆیی (یـان ئـەم / یـان ئـەو) بهێـنین لـە پێنـاوی تیـۆری زانینێکـی کۆمەڵایەتی و مێژووییدا.

### ئەپیستیمۆلۆجی و تیۆری کۆمەڵایەتی

ئـەم چـەمکانە کاریگەرییـەکی ئێجگـار زۆری هەیە لەسەر ژیانی ڕۆشنبیریی هاوچەرخ و زۆر لە نەریتـەکانی هیگڵ و مارکس تێدەپـەڕێنێت و کاریگەریی زۆری هەیە لە بوارەکانی فەلسـەفە و بـیری کۆمەڵناسـیدا. بـەڵام شـێوازە کۆنـەکانی بیرکردنــەوە هــەروا بــە ئاســانی لاناچــن. زۆر فەیلەسووفی هاوچەرخ هێشتا دەستبەرداری ئەو بۆچـوونە نـەبوون کـە دەڵێـت ڕاسـتی و هەڵـە ڕەهـان. هێشـتا بـەرگری لـەو بۆچـوونە دەکـەن و دەڵـــێن کـــە ئـــەو ڕاســـتییە کۆمەڵایـــەتی و مێژوویانـەی لـە بـارەی بنچینـەی بیرۆکەکانـەوە هـەن هـیچ گرنگییـەکیان نییـە لـە بـارەی پرسـە ئەپیسـتیمۆلۆجییەکانی ڕاسـتی و درۆ. ئـەوان ســوورن لەســەر ئــەوەی کــە ئەپیسـتیمۆلۆجی شـــتێکی ســـەربەخۆ و جیـــاوازە لـــە تیـــۆری کۆمەڵایەتی. جۆن ئەندرسن ئەم خاڵە بەڕوونی دەخاتە ڕوو کاتێك کە دەنووسێت:

(باسکردنی ئەوەی چۆن بۆچوونەکان پەیدا دەبــن مانــای باســکردنی ڕاســتییەکان نییــە، هەروەك چۆن باسکردنی سەرچاوەی شتێك بە واتای باسکردنی شتەکە نییە. بە هـەمان شێوە، ڕوونکردنــەوەی کاریگەرییــە کۆمەڵایەتییــەکان لەســەر هــزری فەلســەفی فەلســەفە نییــە و هــیچ کێشــەیەکی فەلســەفی چارەســەر ناکــات). ئــەم جـــۆرە بۆچـــوونانە زۆر جێگـــەی گومـــانن. بەڕاسـتی، لەبـەر ڕۆشـنایی ئـەو شـێوازانەی کـە زانسـتە کۆمەڵایەتییـەکان تێگەیشـتنی ژیـانی ڕۆشــنبیریمانی گۆڕیــوە، ســووربوون لەســـەر ئـــەوەی کـــە گـــەڕان بـــە دوای سەرچـــاوە کۆمەڵایەتییـــەکانی بیرۆکـــەکان گرنگییـــەکی ئەپیستیمۆلۆجی پۆزەتیڤ نادات بە دەستەوە، تۆزێـك لـەملای ناماقووڵەوەیـە. بەهـەرحاڵ، ئـەم جـــۆرە بۆچـــوونانە لـــە نێـــوان فەیلەســـووفە شیکەرەوەکان و هەندێك قوتابخانەی تر، وەکو بونیادگەری زۆر بڵاو بوو. سەرەڕای ئەوەش ئەو

مشتومڕانەی کە بەکاردێن بۆ بەرگریکردن لەو بۆچوونانە مەسەلەگەلی گرنگ دەوروژێنن کە دەبێت چارەسەر بکرێن، ئەگەر بمانەوێت باسی بۆچوونی کاریگەریی کۆمەڵایەتی لە تیۆری زانیندا باسبکەین و بەرگریی لێبکەین.

ئەم مشتومڕە بەم شێوەیەیە: پرسیاری ئەوەی ئایا بیرۆکەیەك راستە یان نا، زۆر بە سادەیی، پەیوەندیی هەیە بە مەسەلەی ئەوەی ئایا ناوەرۆکەکەی پەیوەندیی هەیە بە راستییەوە، ئەمەش بە تەواوی سەربەخۆیە لە سەرچاوەکەی (سەرەتاکەی *genesis*)، لەبەرئەوە باسکردنی هۆی پەیدابوونی بیرۆکەکان نە پێویستن و نە مەرجی تەواوی راستییانن. بیرۆکەیەك لەوانەیە بۆ هەڵوێستێك راستبێت بێئەوەی هۆی پەیدابوونی بێت، لەوانەشە بەهۆی هەڵوێستێکەوە هاتبێت و لەو بارەیەوە راست نەبێت. با لەم مەسەلانە بکۆڵینەوە:

## دەربارەی واقیع (راستی)

کەواتە، پێش هەموو شتێك ئەو راستییەی کە دەڵێت بنچینەی هەموو بیرۆکەیەك هۆیەکی تایبەتە هەرگیز مەرج نییە بۆ راستیی بیرۆکەکە. بۆ نموونە، ئەگەر بیرۆکەیەك لەگەڵ واقیعدا گونجا، ئەوە تەنها بە رێکەوتە.

بەڵام، کام لایەنی واقیع لێرەدا جێی پرسیار لێکردنە؟ بۆ نموونە، سەعاتێك تەنها بە دانانی سەعاتژمێرەکانی دەستنیشانی کات دەکات. کاتەکە، بە پێی ئەم بۆچوونە، راستە ئەگەر سەعاتژمێرەکە لەگەڵ کاتی راستیدا بگونجێت. ئەمەش پەیوەندیی نییە بە شێوازی کارکردنی سەعاتەکەوە. بە هەمان شێوە، ئەو سەعاتەی کە بەشێوەی هەرەمەکی دەگۆڕێت هەندێجار کاتەکە بە شێوەی راست دەستنیشاندەکات، هەروەها ئەو سەعاتەی کە وەستاوە رۆژی دووجار کاتەکە بە شێوەی راست دەستنیشاندەکات. لەلایەکی دیکەوە، ئەگەر سەعاتێك بەشێوەیەکی زۆر راست کاربکات، بەڵام یەك چرکە لە پێش کاتی راستییەوە دانرابێت، هەرگیز راست نابێت. بەراستی، هەموو ئەم شێوازانەی قسەکردن جۆرێکن لە چەواشەکردن. باشتر وایە بڵێین کە سەعاتێکی راوەستاو هەرگیز بە راستی کات دەستنیشان ناکات، بەڵام تەنها وا دێتە بەرچاو چونکە شوێنی وەستانی سەعاتژمێرەکە هیچ زانیارییەك لەبارەی کاتەوە نادات بەدەستەوە، بەڵام ئەو سەعاتەی کە بە باشی کاردەکات بەڵام بەهەڵە دانراوە، یان ئەو سەعاتەی کە پاش و پێش دەکات زانیاری لەبارەی کاتەوە دەدەن. لە راستیدا هەموو سەعاتەکان دەچنە ناو یەکێك لەم کاتیگۆریانەوە (پۆلانەوە). بە واتایەکی تر، بۆ ئەوەی سەعاتێك کات دەستنیشان بکات هەر ئەوەندە بەس نییە کە سەعاتژمێرەو چرکە ژمێرەکانی دەستنیشانی کاتی تەواو بکەن بەڵکوو دەبێت پەیوەندییەکی رێك — واتە پەیوەندیی هۆیی *causal* — هەبێت لە نێوان کارکردنی و گوزەرکردنی کاتدا.

هەمان مشتومڕ (*argument*) دەربارەی پەیوەندیی نێوان واقیع و بیرۆکەکان دەکرێت. بۆچوونی ئەوەی باوەڕێك کاتێك راستە کە پەیوەندیی بە واقیعەوە هەبێت، بێگوێدان بە چۆنییەتی دەستپێکردنی ئەویش هەمان

ڕەخنەی لێدەگیرێت. ئەگەر بۆچوونەکانی من تەنها بەشێوەیەکی هەرەمەکی پێشکەشکرابن، ئەوا هیچ هۆیەك نییە کە بڵێین باسی لایەنێکی تایبەتی واقیع دەکات، چونکە ناوەرۆکی بابەتەکە، ئەو لایەنەی واقیع کە باسی دەکات، کەرەستەی ناوەکیی باوەڕەکە نییە، تەنها بە بڕیارێکی خودیی بڕیاری لەسەر نەدراوە، هیچ ئاماژەیەکی بیرۆکەکەی تێدا نییە بەرەو واقیع. ماناکان، وەکو پەتنام *parnam* دەڵێت "لە مێشکدا نین". بە پێچەوانەوە، بۆئەوەی باسی لایەنێکی تایبەتیی واقیع بکات، دەبێت بەشێوەیەکی بابەتیانە پەیوەندیی پێوەی هەبێت و لە ئەنجامدا، دەبێت لە واقیعەوە هەڵقولابێت و پەیوەندییەکی هۆکاریی *causally* پێوە هەبێت. بە کورتی، مەرجی پێویست ئەوەیە کە لە شتێکی ئەو واقیعەوە هەڵقولابێت بۆ ئەوەی ئەو باوەڕە راستبێت. ئەمە بەلایەنی کەمەوە، بۆچوونی ماددی و واقیعییە.

### سروشتی خەیاڵ (وەهم *illusion*)

لەبەر ئەم هۆیە، دەشێت (لە هەندێك بارودۆخدا و پێویستیشە) کە بابەتی رواڵەتی باوەڕێك یان بیرۆکەیەك لە بابەتی واقیعەکەی جیابکەینەوە. ئەم جیاکردنەوەیە بەسوودە لە کاردانەوەدا بەرامبەر ئەو رەخنانەی کە لە بۆچوونی مێژوویی دەگیرێت. ئەم بۆچوونە، وەکو وتم، دەمانباتە سەر ئەو دیدەی کە دەڵێت لە هەموو بیرۆکەیەکدا هەندێك راستی هەیە. بەهەرحاڵ، لەوانەیە بوترێت کە هەموو باوەڕێك بەرهەمی بارودۆخێکی تایبەتییەو لەوانەیە بەڕاستی دەربڕی ئەو بارودۆخە نەبێت.

بۆ نموونە، بیر لە خەیاڵی (وەهمی) هەبوونی دەریاچەیەکی ئاو بکەرەوە کە دێتە بەرچاوت کاتێك کە لە رۆژێکی گەرم و هاتاوییدا لە رێگە ئەزموونی دەکەیت. هەرچەند ئەو خەیاڵە بارودۆخەکە دروستیکردووە بەلام راستی لە بارەیەوە دەرنابڕێت. بیروباوەڕە ئایینیەکانیش بەهەمان شێوەن. ئەوانیش هەرچەند لە بارودۆخێکی کۆمەڵایەتیی تایبەتییەوە هەڵدەقوڵێن، بەلام راستیی بارودۆخەکە دەرنابڕن. بەڕاستی، بۆ ئەو کەسانەی کە بیرکردنەوەی واقیعییان هەیە جەختکردن لەسەر ئەوەی کە هەندێك راستی هەیە لە بیرۆکە هەڵەکاندا، ئەم بیرە بە پێویست نازانن و بە پابەندبوونێکی ناڕەوا بە بیری بابەتی و دژایەتیکردنی پێشکەوتنی دادەنێن.

بەهەرحاڵ، ئەم دژایەتیکردنە لەسەر بەدحاڵیبوون بنیاتنراوە. کاتێك کە دەڵێین هەندێك راستی هەیە تەنانەت لە ئەزموونە خەیاڵییەکانیشدا، وەکو تراویلکە (سەراب)، ئەمە ئەوە ناگەیەنێت، لەم حاڵەتەدا، کە گۆمی ئاوا لەسەر رێگاکاندا هەیە. بێگومان گۆمی ئاو نییە.

ئاشکرایە ئەزموونەکە راست نییە لەبارەی ئەو بابەتەوە. ئەمە کەمترین تێڕبینییە (*insight*) کە بتوانین لەم بارەیە بیڵێین. بەلام شتی زیاتر هەیە کە دەتوانین لەبارەی ئەم ئەزموونەوە بیڵێین، بەلام ئەمە کاتێك دەتوانین ئەنجامی بدەین کە ئەو بۆچوونە رەتکەینەوە کە دەڵێت ئەپیستیمۆلۆجی سەربەخۆیە و ئەو

راستییانەی کە هەن لە بارەی بنەمای بیرۆکەکانەوە پەیوەندییان پێوەی نییە، چونکە تێگەیشتنی تەواوی ئەم راستییانەیە کە وامان لێدەکات بزانین چی روودەدات بۆمان روونەکەنەوە کە گۆمەکانی سەر رێگا تەنها بابەتی بەرچاوی ئەزموونەکەیەو ئەوەی دەیبینین لە تراویلکەکەدا شتێك نییە کە لەسەر رێگا هەبێت. ئەوەی دەیبینین ئاسمانەو بەهۆی هەوای گەرمەوە وێنەکەی شکاوەتەوە.

بابەتی راستیی ئەزموونەکە ئاسمانەو کاتێك بەم شێوەیە لە ئەزموونەکە دەگەین دەزانین هەندێك راستیی تێدا هەیە چونکە بەراستی شەوقدانەوەی هەندێك لایەنی بینراوی بابەتێکی راستەقینەیە کە ئاسمانە، واتا شینییەکەی و روونییەکەی، هەرچەند، بێگومان، لە شێوەیەکی شێواو خەیاڵیدایە (وەهمیدایە). مەسەلەکەش وەهایە چونکە لە تیشکی ئاسمانەوە دروستبووە.

دەتوانین هەمان شیکردنەوە لە بارەی مەسەلەی ئایین و باوەڕەکانەوە ئەنجامبدەین، چونکە، بەپێی ئەو دیدەی کە من بەرگری لێدەکەم، ئاینیش شێوەی وەهمی و فەنتازیی ئەزموونێکە. بابەتە بەرچاوەکانی ئەزموونی باوەڕی ئایینی نییە. نە بەهەشت هەیە و نە شتی تر. ئەم ئەنجامانە گرنگن چونکە خاڵی سەرەتای رەخنەی ئایین پێکدەهێنن. بەلاّم، وەکو دیدی مێژوویی و کۆمەلاّیەتی ئاشکرای دەکات، ئەم رەخنەیە دەتوانرێت زیاتر بەرەو پێشەوە ببرێت. مارکس دەنووسێت:

(جیهانی ئایینی رەنگدانەوەی جیهانی واقیعییە (راستییە)، لە کۆمەڵگایەکدا کە لەسەر بەرهەمهێنانی کەلوپەل بنیاتنرابێت، کە تیایدا بەرهەمهێنەرەکان، بە گشتی.. کاری تاقە کەسیی خۆیان دەکەنە پێوەری کاری مرۆڤایەتییەکی چوونیەك لە ئایینی مەسیحیدا، کە چینێك پیاوی ئایینی ئابستراکتی (مانایی، بەدەستنەگیراو) هەیە، بە تایبەتی لەسەردەمی پێشکەوتنی بورجوازیدا.. پروتستانتیەت و خواپەرستی، هتد، دەبێتە باشترین شێوەی ئایین.)

باوەڕی ئایینی رەگەکەی لە ئەرزە نەك لە ئاسمان، لەلایەنە نامۆکانی پەیوەندییە کۆمەلاّیەتییەکاندایە و لەوێوە دەردەکەوێت و بەرز دەکرێتەوە بۆ (ئەودیوێکی) بالاّ *transcendent*. ئەم دیاردە ئەرزییە بابەتی راستیی باوەڕە ئایینیەکانە. تێگەیشتن لە بنەمای راستی بیرۆکە ئایینییەکان ئەوەمان بۆ روونەکاتەوە کە شێوە شێواوەکانی رواڵەتەکانن و لە ئاسمانەوە نەهاتوون بەڵکوو لە هەلومەرجی زەمینیی باوەڕدارانەوە هاتوون. ئەمە بابەتی راستییانە. نهێنی خێزانە پیرۆزەکە، وەکو مارکس دەڵێت، ئەوەیە کە هەر خێزانە زەمینییەکەیە.

بێگومان، بیرۆکە وەهمییەکان دەربارەی بابەتە دیارەکان راست نین و وەکو بابەتی دەقاودەق، لەم حاڵەتانەدا، وەرناگیرێن. بەلاّم لەگەڵ ئەوەشدا بەگشتی، هەڵەو وەهمێکی رەهانین. رەگەزێکی راستییان تێدایە، هەرچەند لە شێوەیەکی شێواودا پێشکەشکراوە. کاتێك ئەم رەگەزە ئاشکرا دەبێت کە بابەتی راستیی ئەم بیرۆکانە ئاشکرا دەکرێت. ئەمەش لە رێگەی تێگەیشتنی سەرەتای دروستبوونیانەوە دەبێت

که بریتییه) له دۆزینەوەی ئەو هەلومەرجانەی که وایانکردووە ئەم جۆرە بیرۆکانە هەڵقوڵێن.

بە کورتی، باسکردنی بنەمای بیرۆکەکان زۆر بنچینەییە بۆ تێگەیشتنی تەواوی سروشت و ناوەرۆکیان و هەڵسەنگاندنی تەواوی راستی و ناراستییان، وەکو چۆن باسی بنەمای راستی هەرشتێك بۆ دڵنیابوون لێی. ئێمە دەبێت ئەو دیدە دژ – مێژوویی و دژ – سەرەتا رەهایانە رەتبکەینەوە کە لە بنەمای بۆچوونی باستیاندا لە بەشێکی زۆری فەلسەفەی سەردەمدا هەیە دەربارەی تیۆری زانین (معرفە *knowledge*). تەنها لەم رێگەیەوە دەتوانین دەستبکەین بە ئاشنابوون بە گرنگیی ئەو بۆچوونەی کە دەڵێت زانین دیاردەیەکی کۆمەڵایەتییە.

## سەرچاوە

گۆڤاری *Philosophy Radical* – ژمارە 52 هاوینی 1989.

# خودا لە ئایینە یەکتاپەرستیەکاندا

شجاع الدین شفا
لە فارسییەوە: محەمەد کەریم

**(2-1)**

تاڕادەیەك هەموو موسڵمانەکانی جیهان – لەوانیش ئێرانییەکان – بۆچوونیان وایە کە تەورات و ئینجیل دوو کتێبن کە لە لایەن خوداوە بۆ موسا و عیسا هاتوونەتە خوارەوە. بە هەمان شێوەش قورئان بۆ محەمەد هاتۆتە خوارەوە. ئەم باوەڕەش لە ڕاگەیاندنی خودی قورئانەوە سەرچاوەی گرتووە کە تیایدا هاتووە: "ئەو خودایەی کە قورئانی بۆ تۆ (محەمەد) نارد، تەورات و ئینجیلیشی بۆ موساو عیسا نارد" (ال عمران، ئایەتی 3، 48، المائدة، ئایەتی 46، الاعراف، ئایەتی 157، التوبة، ئایەتی 111، الفتح، ئایەتی 29، الحدید، ئایەتی 27، الصف، ئایەتی 6، الجمعة ئایەتی 5) بەڵام ڕاستی مەسەلەکە ئەوەیە کە تەورات و ئینجیل، هیچکامیان نە یەك کتێبن و نە موسا و عیساش بەشێوەی "وەحی" لە ئاسمانەوە بەدەستیان گەیشتووە. لە مێژووی مەزهەبەکانی جیهاندا جگە لە محەمەد تەنیا یەك کەسی دیکە بانگەشەی ئەوەی کردووە کە ڕاستەوخۆ کتێبێکی لەلایەن خوداوە پێگەیشتووە، ئەویش (جۆزیف سمیث)ی بنیاتنەری گروپی مەزهەبی مۆرمۆن – ە لە ئەمریکا.

ئەوەی ئەمڕۆ لە جیهانی مەسیحیەتدا بە ناوی کتێبی پیرۆز (*Bible*) دەخرێتە ڕوو کۆمەڵێ کتێبە لە هەردوو بەشی (پەیمانی کۆن)و (پەیمانی نویٚ) پێکهاتووە کە تەورات بەشێکە لە بەشی یەکەم و ئینجیلیش بەشێکە لە بەشی دووەم. پەیمانی کۆن کە پێنج کتێبی یەکەمی تایبەتە بە تەورات و ناوی تەوراتە، بە گشتی (24) کتێبی لەخۆ گرتووە[1] کە نەك تەنیا بە یەکجار نەهاتوونەتە خوارەوە، بەڵکو

بەرە بەرەو بە درێـژایی زیـاتر لـە هـەزار سـاڵ لەلایـەن چـەند کـەس و گروپێکـی کـاهینی جولەکـەوە بـە نـاوی (26) پێغەمبـەرەوە نووسراوە کە ناویان لەسەر کتێبەکانە. پەیمانی نوێش کە چوار کتێبی یەکەمیان بەتایبەتی بە ئینجیـل نـاودەبرێ، بـە گشـتی (27) کتێـب و پەیامیان لەخۆگرتووە کە لە ماوەی دوو سەدەدا لەلایەن کەسانی جیاجیاوە نووسراون کە هیچ یەکێ لەوانە لە یارانی عیسا نەبوون. خودی عیسا تا کاتی مردنی لە بنەڕەتدا لە بوونی کتێبێك بە ناوی ئینجیل بێئاگابووە.

پرەنسـیپی بنـەڕەتیی هەرسـێ ئایینـە "یەکتاپەرسـتیەکە" ئەوەیـە کـە خوڵقێنـەر و بزوێنەری گەردوون یەك خودایە کە لە تەوراتدا بە (یەهوە) و لە ئینجیلدا بە (باوکی ئاسمانی) و لە قورئاندا بە (ئەڵڵا) ناوی هاتووە. لەم هەرسێ کتێبەدا دروستکردنی گـەردوون و خوڵقانـدنی ئـادەم بـە دەسـتی ئـەم خودایـە بەشـێوەی لەیەکچـوو باسـکراوە. ئـەو پەیامبەرانـەی کـە خودا بۆ مرۆڤی دەنێرێ هاوبەشن، و ئەو یاسا مەزهەبیانـــەی کـــە ڕایاندەگەیـــەنێ زۆر لەیەکدەچـن، لەگـەڵ ئەوەشـدا، ماهیـەتی ئاسمـانیو زەمـینی ئـەم خودایـە لـە ئـایینی جولەکـەو مەسـیحی و ئیسـلامدا بەشـێوەیەکی هێنـدە بنـەڕەتی جیـاوازە و جـاری واشـە بـە ڕاشکاویی ناکۆکە کە زۆرجار بە یەك زانینی ئەم سێ خودایە دەکات بە کاری نەکردە. جیهانی یەکتاپەرستی ئەگـەر لـە رووی تیۆرییـەوە لـە خودایـەك زیـاتری نییـە، لـە کـردەوەدا سـێ خـودای هەیـە کـە خـالی جیاوازییـان لـە خـالی هاوبەشیان زیاترە.

خـودای تـەورات کـە نـاوی (یـەهوە)یـەو (لـە تـەورات دا 6823 جـار نـاوی هـاتووە) تـەنها خودای نەتەوەی جولەکەیە و خۆشی خودایەکە لـە سـەدا سـەد جولەکەیـە. ئـەو پەیامبەرانـەی کـەلای خۆیـەوە دەیـانێرێ تـەنها پەیامبـەرانی میللـەتی جولەکـەن و کاریـان بـە کفر و ئیمـانی ئـەوانی دی نییـە. یاسـا و ڕێنماییـەکانیان بـە گشتی لـە دەوری ئەو میحوەرە دەخولێتەوە کە بەرژەوەندییە تایبەتیەکانی نەتەوەی جولەکە لـە هـەر ڕێگایەکـەوە کـە پێویسـت بێـت بپـارێزرێ، ئەگـەر ئەمـە پێویسـتی بـەوەش هـەبێ کـە زۆر مەسـەلەی ئاکـاریی و ئینسـانی بکـرێن بـەژێر پێوەو مافە ڕەواکانی میللەتەکانی تر لەبەرچاو نەگیرێن یان کەسانێکی زۆر بە ناڕەوا بکوژرێن. لـە کـاتی روودانـی ئـەو رووداوانـەدا کـە رۆژانـە روودەدەن یـان لـە رووداوی گرنگـی لـە بابـەتی شـەڕ و بـەڵای ئاسمـانی و زەمینیـدا، (یـەهوە) بۆخۆی لە ئاسمانەوە دێتە سەر زەوی بۆئەوەی ڕاستەوخۆ سەرپەرشتی ئەو مەسەلانە بکات کە پەیوەنـدیان بـە نەتـەوە هەڵبژێردراوەکـەی خۆیـەوە هەیـە و لـە کـاتی پێویسـتدا خـۆی کاروبارەکـان بەڕێوەبـەرێ، و لـە هـەموو ئـەم حالەتانـەدا وەکـو خودایـەکی جولەکـە رەفتـار دەکات، نەك خودای هەموو نەتەوەکان و هەموو سەرزەمین. لەگەڵ پەیامبەرەکەی خۆیدا پەیمان دەبەستێ کە ئەگـەر کوڕانی ئیسرائیل سونەت بکـرێن لـە بەرامبـەر ئەمـەدا بـۆ هـەتا هەتایـە سەرزەمینی کەنعانیان پێ ببەخشێ، پاشانیش یـەك لـە دوای یـەك شـارە جیاجیاکـانی ئـەم وڵاتـەیان تەسلیم دەکات بەو مەرجەی کە هیچ یەکێ لەمانە نەك تەنها پیاوو ژن و منال بەڵکو

مانگا و مەڕ و کار و سەگ و پشیلەیەکیش بە زیندوویی نەهێڵنەوە. لەگەڵ پەیامبەرێکدا کەباب و ئاوی گۆشت دەخوات و لەبن درەختدا پشوو دەدات. لەگەڵ پەیامبەرێکی تریدا زۆرانبازی دەکات و دەرەقەتی نایەت. لە شەوێکی تاریکدا لە بیاباندا بە دوای پەیامبەرێکی تریدا ڕادەکات بۆ ئەوەی بیکوژێ لەبەرئەوەی سونەتی نەکردووە. فەرمان بە پەیامبەرێکی دیکەی دەدات کە نانی ڕۆژانەی خۆی لەسەر گو ببرژێنێ و بیخوات. داوا لە پەیامبەرێکی تری دەکات ژنێکی زۆڵی بێڕەوشت بهێنێ و بیکات بە هاوسەری خۆی. لای پەیامبەرێکی دیکەی شکات لەو دوو خوشکە دەکات کە دڵداری بوون یەك لە دوای یەك کلاویان کردۆتە سەری و زینایان لەگەڵ کەسانی تر کردووە. غەزەب لە کچە بەناز پەروەردەکانی ئۆرشەلیم دەگرێ فەرمان دەدات کە چیتر موو لە بەریان نەڕوێت. ڕیخۆڵەی ئەو کەسانەی کە بێڕێزییان پێکردووە لە کۆمیانەوە دەردەهێنێ. لەگەڵ شەیتاندا لە ئەیوبی بەندەی گرەو دەکات. لەگەڵ پەیامبەرێکی تریدا شەڕ دەکات کە بۆچی لەگەڵ ژنی یەکێك لە سەردارانی خۆیدا زینای کردووە لە کاتێکدا کە خودی (یەهوە) ئامادەبووە ژنی دیکەی بۆ بنێرێ. شێوەی بەکەبابکردنی گۆشتی مانگا و مەڕ بە جوانی وەکو وەستایەکی کارامە فێری پەیامبەرە خاوەن عەزمەکەی خۆی دەکات. وەکو کارمەندێکی خەفیەی زانیاری هەوالی نهێنی دەربارەی جولەکە بە پەیامبەرێکی دیکەی دەگەیەنێ. وەکو سەرۆکێکی مافیا ڕێنمایی جولەکەکانی میسر دەکات کە هەرچەندە لە توانایاندایە بە ئەمانەت ئالتوون و زیو لە دراوسێ میسرییەکانیان وەربگرن بۆئەوەی لە کاتی دەرچووندا لە میسر لەگەڵ خۆیاندا بیانبەن، بۆ خۆی لە ماوەی یەکشەودا چەند ملیۆن گەنج و منالی میسری و تەنانەت مانگا و بەرخە کۆرپەش بەدەستی خۆی سەردەبڕێ.

لە ئینجیلدا هەمان خودا دەبێ بە خودایەکی دوو کارەکتەر کە لە هیچ ئاینێکی دیکەی ئەفسانەیی یان یەکتاپەرستی مێژووی جیهاندا ناتوانین هاوشێوەی بدۆزینەوە. واتە بەپێی هەر یەکێ لە چوار ئینجیلەکەو هەر پەیامێ لە پەیامەکانی پەیمانی نوێ بەدەستی هەرکەسێ نووسرابێ، هەڵوێستی خودایەکی ترسناك و تۆڵە ئەستێن و فریودەر و چاوچنۆکی وەکو (یەهوە) ماهیەتی دەگۆڕێ بە هەڵوێستی خودایەکی میهرەبان و دەست و دڵ باش و بەخشندە و بێگرێی وەکو (باوکی ئاسمانی) عیسا. ئەم خودایە هەمیشە ناچارە دەوری دەرهێنەرێکی هەبێ کە لەیەك کاتدا هەم قین لە دڵە و هەم لێبووردەیە، هەم شەڕانگێزە و هەم ئاشتیخواز، هەم خودای تایبەتی جولەکەیە و هەم باوکێکە کە هەموو ئینسانەکان وەکو منالی خۆی تەماشا دەکات، زۆرجار لەم هەموو هاو دژییانەدا خۆشی نازانێت چیدەوێت و چیبکات.

لە قورئاندا، خودا نە لەسەدا سەد خودا قین لە دڵ و تووڕەو بێڕەحمەکەی تەوراتەو نە خودا خاوەن دوو کارەکتەرەکەی ئینجیل، بەڵکو خودایەکە ئەوپەڕی ڕەها و بەدەسەڵاتە کە لە دەرەوەی ئەو هیچ یاسایەك و هیچ ئیرادەیەك و

هیچ ڕاستیەك وجودی نییە و تەنانەت "گەلآیەك بەبێ مۆڵەتی ئەو لە درەختێك بەرنابێتەوە" هەرچی لە ئاسمان و زەوی ڕوودەدات، لە بەشەوە تا گشت، ڕێك بەو شێوەیە ڕوودەدات کە خودا ویستوویەتی، فریمان کلارك توێژەری مێژووی مەزهەب و نووسەری کتێبی بەناوبانگی "مەزهەبە گەورەکان" ئەم سێ ڕاستیە ئاوا کورت دەکاتەوە و دەڵێت: خودای موسا دەسەڵاتێکی ترسناکە کە هەمیشە لەناو بەندەکانی خۆیدا دەژی و لە هەموو ڕاستی و ناڕاستیەکانیاندا هاوبەشە، خودای عیسا هەم لە سەرووی مرۆڤەکانەوەیە و لە ناخیاندایە، و خودای محەمەد ڕێك لە سەرووی ئینسانەکانەوەیە و لە پێگەی فەرمانڕەوایەکی ڕەهاوە قسەیان لەگەڵ دەکات کە هیچ کاتێ لە پێگەی خودایی خۆی نایەتە خوارەوە.

لە نێوان ئەم سێ مامەڵە جیاوازەدا، ئەگەر مامەڵەی خودای مەسیحیەت باوکانە تر و خودای ئیسلام سەروەرانە ترە، مامەڵەی خودای جولەکە ئاودار و ڕەنگینترە و زیاتر شایانی خوێندنەوەیە، چونکە بەپێی ئەوەی لە تەوراتدا باسی دەکرێ هەم "الوهیم"ی جولەکەیە و هەم ئاتون-ی میسری و هەم مەردۆخ-ی بابلی و هەم (بەعل)ی فینەقی و هەم زیوس-ی یونانی و هەم ژوپیتەر-ی ڕۆمییە. لە نێو هەموو خوداکانی مێژوودا، چ لە ڕووی خاسیەتی کەسییەوە و چ لە ڕووی فراوانی و هەمەڕەنگی ئەو بەسەرهاتانەوە کە ئەو ئەکتەری سەرەکییە تیایاندا هیچ خودایەك هاوشانی نییە.

وا باشترە تۆش بە هەندێ لەو بەسەرهات و خاسیەتانە ئاشنابیت، کە لە ڕێگەی لاپەڕەکانی خودی تەوراتەوە لێرەدا بەشێوەیەکی کورت کراوە بۆت دەنووسمەوە[2].

یەکەم پەیامبەری جولەکە، ئابرام (ئیبراهیم) لە سەفەریدا بۆ خاکی کەنعان، لە باخێکی داربەڕوودا لە نزیکی (حەبرون) کە لەگەڵ سارای ژنیدا لەوێ نیشتەجێبووە ڕۆژێك سێ کەسی نەناس دەبینێ کە هاتوونەتە سەردانی میوانداریيان دەکات و کاتێ داوەتەکەی بۆ نانی نیوەڕۆ قبوڵدەکەن بریانی گۆشتی گوێرەکە و شیر و کەرە ئامادە دەکات پێکەوە نان دەخۆن و پاشان لەبن دارێکدا پشوو دەدەن، دوایی ئاشکرا دەبێ کە یەکێ لەو سێ میوانە خوا خۆی بووە. "خودا لە باخی دار بەڕوودا هات بۆ لای ئیبراهیم کە لەبەر قرچەی گەرمادا لەبەردەمی خێمەکەیدا دانیشتبوو.. ئیبراهیم بەرەو پیریی خوا چوو و سەری داخست و وتی ئەی خودایە ئێستا کە حسابت بۆ من کردووە و هاتووی بۆ لام کەواتە با هەندێ ئاو بێنم بۆ ئەوەی قاچت بشۆریت و لە ژێر درەختەکە بحەوێیتەوە، و بەرلەوەی بڕۆی با پارویەك نان ئامادە بکەم بۆ ئەوەی وزەت بێتەوە بەر، چونکە بۆ ئەمە ڕێت کەوتۆتە ئێرە. پاشان سێ کیلۆ ئاردی دا بە سارا بۆ ئەوەی بیکات بە نان، گوێرەکەیەکیشی لە گایەلەکەی جیا کردەوە و دایە دەست نۆکەرەکەی بۆ ئەوەی گۆشتەکەی لێبنێ. پاشان کەرەو شیر و گوێرەکە بە بریانی کراوەکەی هێناو لە بندارەکەدا وەستا تا میوانەکانی نانیان خوارد. پاشان خوا لێی پرسی ژنەکەت لە کوێیە؟ وتی لە خێمەکەیە، خودا وتی هەڵبەتە رازیم کات لای تۆ ژیانی بەبەردا بکرێتەوە و سارای ژنت کوڕێکی دەبێ.

سـارا لەبـەردەمی خێمەکـەدا گـوێی لێبـوو پێکەنی و وتی مێردەکەم پیرەو منیش لە سوڕی مانگانە وەستاومەتەوە چۆن کوڕێکم دەبیٚ؟ خوا بە ئیبراهیمـی وت سـارا بۆچـی پێکـەنی بۆچـی هـیچ مەسـەلەیەك لای خـودا قورسـە؟ بەڕاسـتی سارا کوڕێکی دەبیٚ. ئەوسا سارا ئینکاری کردو وتی پێنەکەنیووم، چونکە ترسا بوو. خوا وتـی: نـەخێر، پێکـەنیت. پاشـان ڕۆیشـت و ئـیبراهیم بـەڕێی کـرد. خـودا لەبەرخۆیـەوە وتـی: ئایـا ئـەوەی دەیکـەم لـە ئیبراهیمـی بشـارمەوە؟ (کورتکراوەی سفرپیدایش، باب هجدهم).

لە کاتێکی تردا خودا لە شەوێکی تاریك و لە بیابانێکی چۆڵدا لەگەڵ یەعقوبی پەیامبەریدا زۆرانبـازی دەکـات، لەگـەڵ ئەوەشـدا کـە تـا بەرەبەیان زۆرانبازییەکە درێژە دەکێشیٚ خودا نـاتوانیٚ یـەعقوب بـدات بـە زەویـدا. "‥ کەواتـە یـەعقوب هـەردوو ژنەکـەی و دوو کەنیزەکـەی و یـانزە کوڕەکـەی و هەرچـی هـەبوو لـە ڕێـرەوی یەربوق پەڕاندەوە، بەڵام لەم کاتەدا لە بیابانـدا ڕووبـەڕووی پیـاوێکی نـەناس بـۆوە کـە هـەتا بەرەبـەیان زۆرانـی لەگـەڵ گـرت کـابرای نـەناس لەبەرئەوەی بینی کە دەرەقەتی یەعقوب نایەت لەقەیەکی دا لە ڕانی و لە جوڵەی خست، پاشان پێـی وت بەرمـەدە چـونکە وا بەیانییـە، بـەڵام یەعقوب وتی هەتا بەرەکەتم بەسەردا نەبارێنی بەرت نادەم، کابرا لێی پرسی ناوت چییە؟ وتی یەعقوب. وتی: نەخێر لەمەودوا تۆ بە یـەعقوب بـانگ نـاکرێی بەڵکو بە ئیسـرائیل نـاو دەبرێـی، لەبەرئـەوەی لەگـەڵ خـوادا ململانێـت کـرد و سەرکەوتی. یەعقوب پێی وت ئێستا تۆش ناوی خۆتم پیٚ بڵیٚ. کابرا وەڵامی دایەوە: چۆن نـاوی مـن دەپرسـی؟ و لـە وێـدا بەرەکـەتی بەسـەردا بارانـد. یـەعقوب ئـەو شـوێنەی ناونـا فنوئیـل چونکە لەوێدا ڕووبەڕوو خودای دیبوو، هەر کە لە فنوئیل جیابۆوە خۆری لێهەڵهات و دەشەلی. لەبەرئەوەیـە کـە نـەوەی ئیسـرائیل هـەتا ئـەمڕۆ (عـرق النسـاء) نـاخۆن کـە ماسـولکەی ڕانـە، چـونکە خـودا لـە (عـرق النسـاء)دا بەریـەعقوب کەوتبوو (کورتکراوەی سفر پیدایش، باب سی و دوم 22-32)[3].

کاتێکی تـر خـودا لەگـەڵ پەیامبـەری خـاوەن عـەزمی خۆیـدا واتـە موسـا ماوەیـەك مشـتومڕ دەکات بۆ ئەوەی قەناعەتی پێبکات کە ئەرکی گفتوگـۆ لەگـەڵ فیرعـەونی میسـردا لـە ئەسـتۆ بگریٚ تا ناچاری بکات کە مۆڵەتی کۆچکردنی قەومی جولەکە لە خاکی میسر بدات، موساش بـە بیـانووی جیـاوازەوە هەوڵـدەدات خـۆی لـە قبـوڵکردنی ئـەم ئەرکـە بدزێتـەوە. "‥ خـودا بـە موسای وت کەواتە ئێستا وەرە با بتنێرم بۆ لای فیرعەون و قەومەکەی من واتە نـەوەی ئیسـرائیل لە میسر بهێنێتە دەرەوە. موسا وتـی بۆچـی مـن کێم کە بچم بۆلای فیرعـەون و نـەوەی ئیسـرائیل لـە میسـر بهێنمـە دەریٚ؟ خـودا وتـی: هەڵبەتـە منـت لەگـەڵ دەبم. موسا بـە خـودای وت ئێسـتا من چۆن بچم بۆ لای نـەوەی ئیسـرائیل و پێیـان بڵـێم کـە خـودای بـاوکی ئێـوە مـنی نـاردووە بـۆ لاتان و لێم بپرسن ناوی چییە، چییان پێبڵێم؟ خودا بە موسای وت من هەر ئەوەم کە هەم و بە نەوەی ئیسرائیل بڵیٚ کە (هەم) منی ناردووە بۆ لاتـان. موسـا لـە وەڵامـدا وتـی هـەروا بـاوەڕم پێناکەن و گویٚ لە قسەکانم ناگرن بەڵکو دەڵێن (یەهو) خۆی نیشانی تۆ نەداوە. پاشان خودا بە

موسای وت من دارەکەی تۆ دەکەم بە مارو دەستت وەکو بەفر سپی دەکەم و خوێنی دەستت دەکەم بە ئاو بۆئەوەی باوەڕت پێبکەن.. پاشان موسا بە خودای وت من پیاوێکی قسەزان نیم و زمانم دەیگرێ و بە خاوی قسە دەکەم. خوا وتی: من دەبم بە زمانت و هەرچی پێویستە بیڵێی فێرت دەکەم. موسا وتی لەگەڵ هەموو ئەمانەدا ئەی خودا، داواکارم کەسێکی تر بۆ ئەم کارە رابسپێری. ئەوسا خوا تووڕە بوو و فەرمووی بۆچی من نازانم کە هارونی برات گەنجێکی دەنگ زولالە، تۆ فێری قسەی دەکەیت و ئەو لە جیاتی تۆ قسە لەگەڵ قەومەکەت دەکات و تۆ دەبیتە زمانی ئەوو ئەو دەبێتە خودای تۆ" دوای ئەم گفتوگۆیە موسا بە ناچاری ژن و کوڕەکەی سواری وڵاخ دەکات و دەگەڕێتەوە بۆ خاکی میسر و خۆی دارەکەی خودا دەگرێت بە دەستیەوە و بۆ راگەیاندنی فەرمانەکانی خوا بەرەو پایتەختی فیرعەون دەکەوێتە رێ. بەڵام رێك لەم کاتەدا خوا هەستدەکات کە ئەم پەیامبەرەی سونەت نەکراوە، بەڕادەیەك لەم مەسەلەیە تووڕە دەبێت کە شەو شوێنی دەکەوێت بۆ ئەوەی بیکوژێ، تەنیا زرنگی و هۆشمەندی (صفورە)ی ژنی موسا مێردەکەی لە مردن رزگار دەکات. "ئەوە بوو بە رێگاوە خوا دوای موساکەوت بۆ ئەوەی بە دەستی خۆی بیکوژێ. ئەوسا صفورە بەردێکی تیژی هەڵگرت لە هەمان کاتدا کوڕەکەی خۆی سونەت کرد و گۆشتە بڕاوەکەی هەڵدا بۆ لای موساو وتی ئەوەی کە خەریکە لەسەری دەکوژرێن سونەت نەکردنتە، پاشان خوا وازی لە موسا هێنا" (سفر خروج – کورت کراوە لە باب سوم و چهارم).

لە کاتێکی تردا خوا ئەمر بە پەیامبەری زۆر بەرێزی خۆی واتە (حزقیال)، دەکات ماوەی (390) رۆژ گو لەنانی رۆژانەی خۆی هەڵبسوێ و پاشان بیخوات. ".. ئەوسا خوا (یەهوە) بەمنی وت ئاسنێکی تیژ هەڵگرەو سەرو ریشتی پێ بتاشە، پاشان بچۆ بۆ ناو شارو سێیەکی بسووتێنە و سێیەکی تری فرێبدەرە خۆڵە عەمەلەوە. ئەگەر ئەمەت ئەنجامدا بەرامبەر گوناهی ئیسرائیل بۆ ماوەی 390 رۆژ لەسەر لای چەپ بخەوە، چونکە من گوناهی جولەکەم رۆژی بە سالێ لەسەر تۆ حسابکردووە. کەواتە ئەو خواردنەی کە دەیخۆی هەر رۆژەی کێشی بیست مسقالە وەختاو وەخت دەیخۆی، ئەو نانی جۆیانەی کە دەیانخۆی لەبەرچاوی هەموو ئیسرائیل لەسەر گوی خۆت دەیانبرژێنی . پاشان وتم: ئای ئەی خوایە، من لە منالیەوە هەتا ئێستا گوم نەخواردووە! ئەوسا پێی وتم: ئەوا قبوڵم کرد لە جیاتی گویێ مرۆڤ بڕیارم دا بیکەم بە شیاکەی مانگا. (کتاب حزقیال نبی، باب چهارم، 4-12).

ماوەیەك دوای ئەوە هەمان خوا پەیامبەرێکی تری خۆی واتە (ربشاقی دەنێرێ بۆ لای (ئەلیاقیم کوڕی حەلقیا) بۆ ئەوەی پێی بڵێ من بۆ لای ئەو پیاوانە نێردراوم کە لەسەر حەساری شار دانیشتوون بۆئەوەی لەلایەنی خواوە پێیان بڵێم کە لەگەڵ ئێوەدا گوی خۆیان بخۆن و میزی خۆیان بخۆنەوە (کتاب دوم پادشاهان باب هجدهم، 27).

له كاتێكی تردا ئەم خودایە فەرمان بە پەیامبەرێكی بەرێز و خاوەن متمانەی تری خۆی واتە (هوشع) دەدات كە ژنێكی زۆڵی بێرەوشت بهێنێ و بیكاتە هاوسەری خۆی ".. له رۆژگاری عەزیا و یوتام و حەزقیای پاشایانی یەهوداو یەربعامی كوڕی یوشاشای پاشای ئیسرائیل و تەنانەت لای خوداوە بۆ هوشع كوڕی بییری هاتە خوارەوە و خوا بە هوشعی وت بڕۆ ژنێكی بێرەوشت بهێنە كە خۆشی زینا زادە (زۆڵ) بێت.. پاشان هوشع رۆیشت و جومری كچی دبلاییمی هێناو سكی پڕ بوو و كوڕێكی بوو.. خوا وتی تۆ ئیتر خزمی من نیت و من خوای تۆ نیم.. دوژمنایەتی دایكی خۆت بكە، چونكە ئەویش چیتر ژنی من نییە و من مێردی ئەو نیم. بۆیە زینای خۆت لە پێشەوەی و كاری خراپەی خۆت بە نێوانی مەمكەكانی تەواو بكە، نەبادا جلەكانی لەبەرداكەنی و بەرووتی بیبینم.. رەحمەت بۆ كوڕەكانی نانێرم چونكە منالەكانی زۆڵن و دایكیان بێشەرمی كردووە و وتویێتی ڕەدوی عاشقانی خۆم دەكەوم، لەبەرئەوەی ئەوان نان و ئاوو خوری و كەتان و رۆن و شەربەتیان داومەتێ.

لەبەرئەوە من رێگای ئەو بە درك دەگرم و دیوارێك لە دەوری دروست دەكەم بۆ ئەوەی رێگای خۆی نەدۆزێتەوە و هەرچەند بە دوای دۆستەكانی خۆیدا بڕوات پێیان نەگات.. پاشان دەڵێت دەڕۆم و دەگەڕێمەوە بۆ لای مێردی یەكەمم چونكە لەو كاتەدا لە ئێستا باشتر دەژیم. بەڵام ئەو نازانێت كە من بووم گەنم و شەربەت و رۆنم دەدایە و ئەو زیوو ئالتوونەم بۆ زیاد دەكرد كە بۆ (بەعل) سەرفی دەكرد. بەڵام من چیتر گەنمی خۆم لە وەرزیدا و شەربەتی خۆم لە كاتیدا بەو نادەم و خوری و كەتانی خۆمی نادەمێ كە دەبوو خۆی پێداپیۆشێ، ناشیرینی ئەو لای دۆستەكانی ئاشكرا دەكەم و كەس لە دەستم دەربازی ناكات، هەموو شادی و جەژن و هیلال و شەممە و هەموو وەرزەكانی دەوەستێنم، رەزو باخی هەنجیرەكانی وێران دەكەم كەوتبووی ئەمانە كرێی منن و دۆستەكانم پێیان داوم، رەزو باخی هەنجیرەكانی دەكەمەوە بە دارستان بۆ ئەوەی ئاژەڵی كێوی بیانخۆن. تۆڵەی ئەو رۆژانەی لێدەكەمەوە كە بخوردی بۆ دۆستەكانی دادەگیرسان و بە گوارەو ئالتوونەكانیەوە خۆی دەڕازاندەوەو ڕەدوی دۆستەكانی خۆی دەكەوت و منی فەرامۆش كردبوو". (كتاب هوشع نبی، باب اول، 1-4).

له كاتێكی تردا خودا لەبەرئەو گرەوەی كە لەگەڵ شەیتاندا كردویێتی بەندەیەكی دڵپاك و ملكەچی خۆی تووشی جۆرەها بەڵا دەكات. هەر حەوت كوڕەكەی دەكوژێ، گاگەل و رانە مەڕ و حوشترەكانی لەناو دەبات، ماڵ و سامانەكەی دەسووتێنێ، دواجار خۆشی سەراپا تووشی گەڕی دەكات و لە جێدا دەیخات بۆ ئەوەی بۆ شەیتانی بسەلمێنێ ئەم بەندەیەی ئەو سەرەڕای هەموو ئەمانە لە فەرمانی خوا دەرناچێت و نارەزایی دەرنابڕێ:

"لەسەرخاكی (غوص) پیاوێك هەبوو كە ناوی ئەیوب بوو، ئەم پیاوە كامڵ و ڕاست و لە خوا ترس بوو و لە خراپە دوور دەكەوتەوە، حەوت كوڕ و سێ كچی هەبوو، ماڵ و

سامانەکەی بریتی بوو لە حەوت هەزار سەر مەڕو سێ هەزار سەر حوشتر و پێنج سەد جووت گا و پێنج سەد ماکەری هەبوو، نۆکەری زۆری هەبوو، ئەم پیاوە لە هەموو نەوەی خۆرهەلات گەورەتر بوو.. رۆژی کوڕانی خوا هاتن بۆ ئەوەی بچنە حوزوری خوا و شەیتانیش لەگەڵیاندا هات، خوا بە شەیتانی وت لە کوێوە هاتووی؟ شەیتان لە وەڵامدا وتی لە هاتوچۆی زەوی و رۆیشتن بەسەر زەویدا، خوا بە شەیتانی وت ئایا بیرت لە ئەیوبی بەندەی من کردۆتەوە کە وێنەی لەسەر زەوی نییە و پیاوێکی راست و لە خوا ترسە؟ شەیتان وتی ئایا ئەیوب بە خۆڕایی لە خواترسە یان لەولایەنەوە کە تۆ بەرەکەتت بەسەردا باراندووەو رەشە ولاخی ئەو لەسەر زەوی بلاوبۆتەوە؟ ئێستا دەستی خۆت درێژ بکەو سەروەت و سامانەکەی لێبسێنەرەوە ئیدی ئەو دەستبەردارت دەبێت. خوا بە شەیتانی وت ئەوا هەموو سەروەت و سامانەکەیم دایە دەست تۆ، پاشان شەیتان لای خوا رۆیشت".

شەیتان بەوەی کە ئەم سەدەفەی بە دەستەوەیە کارێك دەکات کوڕەکانی ئەیوب بە بای ژەهراوی لەناو دەچن، و مەڕ و حوشتر و گاو کەرەکانی ئەیوب یەك لە دوای یەك بە دەستی دوژمنان یان بە ئاگری خوا کە لە ئاسمانەوە دێت لە ناو دەچن، لەگەڵ هەموو ئەمانەدا ئەیوب سەری دەتاشێ و کڕنووش دەبات و دەڵێت خوا دای و خوا بردیەوە ناوی خوا موبارەك بێت! بەلام مەسەلەکە لێرەدا کۆتایی نایەت "ئەوە بوو جارێکی تر کوڕانی خوا هاتن بۆ ئەوەی لە کۆبوونەوەی راوێژکاریی خوادا ئامادەبن و شەیتانیش لە ناویاندا بوو. خوا بە شەیتانی وت ئایا ئەیوبی بەندەی منت بینی کە کاملی خۆی بە قایمی هێشتەوە، هەرچەندە منت والێکرد کە بەبێ هۆ ئازاری پێبگەیەنم؟ شەیتان لە وەلامی خوادا وتی مرۆڤ هەرچییەکی هەیە بۆ تەندروستی خۆی دەیبەخشێ. کەواتە ئێستا دەستت درێژ بکە و ئێسقانی بلەرزێنە و بەجێی بهێڵە، خوا بە شەیتانی وت ئەوا گیانیشم دایە دەست تۆ. پاشان شەیتان لای خوا رۆیشت و ئەیوبی لە نوکە پێیەوە هەتا تەوقی تووشی دوومەڵی سەخت کرد. ئەیوب گڵێنەیەکی هەڵگرت بۆ ئەوەی خۆی پێبخورێنێ و لەناو خۆڵەمێشدا دانیشتبوو. ژنەکەی پێی وت: دیسان کاملی خۆت دەهێڵیتەوە؟ واز لە خوا بێنە و بمرە، ئەیوب پێی وت وەکو ژنێکی گێل قسە دەکەی، ئایا چاکە لە خوا وەربگرین و خراپەی لێوەرنەگرین؟ لەگەڵ ئەوەشدا ئەیوب گوناهی بە زماندا نەهات" لەگەڵ ئەوەشدا کاتێ دێت کە وزەی ئەم پیاوەی خوا تەواو دەبێت و (سەبری ئەیوبی) کۆتایی دێت، لەم کاتەدایە بە سکالایەکی پڕ لە یاخیبوونەوە روو لە (یەهوە) دەکات و دەڵێت:

"ئیدی گیانم داوەشاوەو رۆژانی بەلا گرفتاریان کردوم. شەوانە ئێسقانەکانم لە ناخمدا لێم دەبن بە تیر، قاچەکانم لە ئازاردا ئارامیان نییە، لە تاو ئازاری سەخت لە کراسەکەمدا جێم نابێتەوە، وەکو خاك و خۆڵەمێش لە قوڕا چەقیوم. لە حالێکی وا شیوەن دەکەم و گوێم نادەیتێ، هەڵدەستم و سەرنج نادەی. لە بەرامبەرمدا بێرەحم بوویت و

به هەموو هێزی دەستت دەکێشی بە سەرما. لە بەر رەشەبادا پەرشو بڵاوت کردوومەتەوە. چاوەڕێی روونـاکیم کـردو گەیشتمە تـاریکی. ناخم دەکوڵێ و ئارام ناگرێ. وەکو ماتەم زەدە لە تاریکیدا بەرێی خۆمدا ملدەنێم. بووم بە برای چەقەڵان و هاوڕێی حوشتر مەلان. پێستم رەش بۆتەوەو گەرد گەرد لە گیانم دەوەرێ. ئێسقانەکانم لە گەرمیدا سووتاون. لە گەروی من جگە لە دەنگی شیوەن هیچ بەرز نابێتەوە و لەنای من جگە لە نالەی شیوەن گێران هیچ نایەتە گوێ". بەڵام ئەم سکاڵا پڕ ئازارە، لە جیاتی ئەوەی (یەهوە) بۆ هاودەردی و بەزەیی بەرێت تووڕەی دەکات، چونکە خوا لە رێگای ئەم شتەوە وا هەست دەکات کە ئەیوب ویستوویەتی کەمالی خودایی ئەو بخاتە ژێر پرسیارەوە. هاوار لە ئەیوب دەکات ".. تۆ کێی کە بە زۆر بڵێی خۆت دەست لە کاری خودایی من وەردەدەی؟ .. کاتێ من زەویم دروست کرد تۆ لە کوێ بووی؟ ئایا رێت بە کوگاکانی بەفر و تەرزە دەبرد کە من بۆ رۆژی جەنگ پاشەکەوتم کردووە؟ ئایا تۆی کە نێچیر بۆ شێری مێ راودەکەی بۆ ئەوەی ئیشتهای تێر بکەی؟ ئایا ئاگات لە کاتی زاینی بزنە کێوی هەیە؟ ئەوە کێیە کە کەرە کێوی بەرەڵاکردو پێوەندەکانی کردەوەو بیابانی کرد بە مالی و شۆرەکاتی کرد بە خانووی بۆ ئەوەی هەراو زەنای شار فەرامۆش بکات و گوێ بە هاواری شوان نەدات؟ ئایا گاکێوی رازی دەبێ کە خزمەتی تۆ بکات یان لە نزیك ئاخوری تۆوە لە مال بخزێ؟ ئایا دەتوانی بالی حوشترمەل وەکو پەڕو بالی لەقلەق لێبکەی کە هێلکەی خۆی لە زەویدا بەجێدەهێڵێ و فەرامۆشی دەکات کە رەنگە درندەکانی بیابان پێی پێدا بنێن؟ ئایا تۆی کە یالت داوە بە ئەسپ و وەکو کوللە خستوتەتە هەڵبەزو دابەز و حیلە و جوڵەیت ترسناك کردووە، و ئەو توانایەت داوەتێ کە هەراسان نەبێ و تیرکێش بە پشتیەوە چکەچك بکات و لە نێزەی بریقەدار و حەربە هەڵنەیەت و کاتێ کە رەنا فووی پیادەکرێ بحیلێنێ؟ ئایا تۆ بازووی وەکو هی خوات هەیە، ئایا دەنگی تۆ هەورەگرمە ئاسایە؟ ئەگەر راست دەکەی ئێستا وەکو من خۆت بکە بە خاوەنی شان و شکۆ و توندی تووڕەیی خۆت بنوێنە تەماشای "بەهیموت" بکە کە ئەویش وەکو تۆ من دروستم کردووە. وەکو رەشە وڵاخ گیا دەخوات، هێزی لەکەمەریدایە و توانای لە دەمارەکانی رانیدا بەیەکدا چووە و ئێسقانەکانی وەکو بۆری زەرد و ئەندامەکانی وەکو نوێڵی ئاسن وایە. ئەمە دروستکراوی خوایە بەڵام خالقەکەی شمشێری لێهەڵکێشاو لە شاخ و هەموو ئەو درندانەی کە لە شاخ یاری دەکەن دووری خستەوەو لە ناو گیاو زەلی قەراغی گۆماوەکانو لە سایەی گوڵی نیلۆفەری شین و لە ناو داربیەکاندا نیشتەجێی کرد. لەوەش ناترسێ کە رووبار هەڵچێت یان تەنانەت چۆمی ئوردن قووتی بدات، چونکە کەس ناتوانێ بیگرێ یان قولاب لە لووتی هەڵکێشێ. یان دەتوانێ "لویاتان" لغاو بکەی یان بە پەت زمانی رابکێشی یان قولاب بخەیتە چەناگەی کە دەسکردێکی دیکەی منە؟ ئایا دەتوانی وەکو چۆلەکە یاری پێبکەی یان بیکەی بە کۆیلەی خۆت یان بۆ یاری کچەکانت بە پەت رایکێشی؟

ئەگەر ناتوانی ئەم کارانە بکەی، کەواتە بۆچی دژایەتی من دەکەی و داوەرییەکەی من بەتال دەکەیتەوەو داوا لە من دەکەیتەوە کە خۆت لە من دادپەروەرتر نیشان بدەی؟ "خلاصە شدە از بابهای سی و هشتم تا چل ویکم کتاب ایوب".

"ئەیوب وەڵامی خوای دایەوەو وتی دەزانم توانای هەموو شتێکت هەیە و هەرچی مەیلت لێبێ کەس ناتوانێ رێت لێبگرێ، لەم رووەوە رقم لە خۆمە و لەناو خاك و خۆڵەمێشدا تۆبە دەکەم. لەبەرئەوەی ئەمەی وت خوا دوو ئەوەندەی ئەوەی پێشوو دابوویە سەروەت و سامانی دایە، و هەموو برا و خوشك و تەواوی ئاشنایانی هاتن بۆ لای ئەیوب و لەگەڵیدا نانیان خوارد و سەبارەت بە هەموو ئەو بەڵایانەی کە خودا بەسەری هێنابوو سەرەخۆشیان لێکرد و هەریەکەیان قسیتەیەك و ئەڵقەیەکی ئالتوونیان دایە، خودا دووبارە بەرەکەتی بەسەر ئەیوبدا باراند، چواردەهەزار سەر مەڕ و شەش هەزار سەر حوشتر و هەزار جوت گا و هەزار ماکەری دایە.. پاش ئەوە ئەیوب سەد و چل ساڵ ژیاو کوڕی کوڕەکانی هەتا چوار پشت بینی. پاشان پیر بوو و مرد" (کتاب ایوب، باب چهل و دووم، 1-17).

بە دەربڕینی شارەزایەکی هاوچەرخ، (یەهوە) دەربارەی تاقیکردنەوەی سەبری ئەیوب رێك وەکو ئەو رەفتارە رەفتاری کردووە کە لە تاقیگەکانی ئەمڕۆدا لەگەڵ بەرازی تاقیکردنەوەدا دەکرێ، واتە بۆئەوەی دەسەڵاتی خۆی بۆ شەیتان بسەلمێنێ، ئەم پیاوە ئازادەی کە خودا خۆی بە راستگۆترین خزمەتکاری خۆی زانیبوو لەسەر زەوی بە خواستی شەیتان بە ئەوپەڕی بەڵای زاڵمانە مەحکومی دەکات، تەنها بۆئەوەی غروری خۆی لە زۆر نیشان لە بەرامبەر شەیتاندا بخاتە ڕوو[4].

لە کاتێکی تردا خودا لەوە نیگەران دەبێ کە منالەکانی نوح توانیویانە بورجی بەناوبانگی بابل دروست بکەن، چونکە لەوە دەترسێت کە ئەم بورجە بگاتە ئاسمان و ئەوسا ئەوان بیر لە دەستدرێژی بکەنەوە بۆ سەر دەزگای خودایی ئەو. لەبەرئەوە پیلانێکیان لێدەگێڕێ کە دەبێتە هۆی ئەوەی هەتا کۆتایی دنیا هەموو مرۆڤانی دنیا بگرێتەوە. تەورات بە درێژی باسی ئەم مەسەلەیەی کردووە "لە سەراپای جیهاندا یەك زمان و یەك لەهجە هەبوو.. خەڵکەکە بە یەکتریان وت وەرن با شارێك بۆ خۆمان دروست بکەین و بورجێك دروست بکەین کە سەری بگاتە ئاسمان، بۆ ئەوەی ناوبانگێ بۆ خۆمان پەیدا بکەین.. خوا هاتە خوارەوە بۆئەوەی ئەو شارو بورجە ببینێ کە بنیادەم دروستیان دەکرد. خوا لەبەرخۆیەوە وتی دیارە ئەم قەومە یەکن و هەمووشیان یەك زمانیان هەیە، ئێستا دەستیان بەم کارە کردووە و ئیدی هەر کارێ کە بیانەوێ دەتوانن بیکەن و لە دەستیان دێت. کەواتە با ئێستا بچینە خوارەوەو زمانیان تێك بدەین بۆئەوەی زمانیان تێکبدەین بۆ ئەوەی لە قسەی یەکتری تێنەگەن. پاشان خودا بەسەر سەراپای زەویدا پەرش و بڵاوی کردنەوەو دەستیان لە دروستکردنی شارەکە هەڵگرت، هەر بۆیە ئەو شوێنەیان ناونا بابل، چونکە لەو شوێنەدا خودا زمانی هەموو خەڵکی جیهانی تێکداو خەڵکەکە لەوێوە بەسەر

گۆی زەویدا بڵاوبوونەوە"(سفرپیدایش، باب یازدەم، 1-9)[5].

لە کاتێکی تردا یەهوە سەموئیلی پەیامبەری خۆی رادەسپێرێ کە قەومی ئیسرائیل لەوەی کە داوای پاشایەك دەکەن بۆ خۆیان ئاگادار بکاتەوە، بۆ ئەو مەبەستە لە هەموو ئەو مەترسییانە ئاگاداریان بکاتەوە کە لەلایەن پاشا و سوڵتانەکانەوە رووبەروویان دەبێتەوە "سەموئیل لای خودا سکاڵای کرد کە هەموو پیرەکانی ئیسرائیل داوا لە من دەکەن کە پاشایەکیان بۆ دابنێم بۆئەوەی وەکو باقی میللەتانی تر فەرمانڕەواییمان بکات. خودا بە سەموئیلی وت ئەوان دەستبەرداری تۆ نەبوون، بەڵکو دەستبەرداری من بوون بۆ ئەوەی خوایەتییان نەکەم. کەواتە ئێستا لە رێوشوێنی ئەو پاشایە ئاگاداریان بکەرەوە کە حوکمیان دەکات. سەموئیل تەواوی قسەکانی خودای بۆ میللەتەکەی باسکرد کە داوای پاشایان لێکردبوو وتی: رێوشوێنی پاشا ئەوەیە کە کوڕەکانتان دەکات بە عەرەبانچی و سواری خۆی، ئێوەش لە پێش گالیسکەکانییەوە رادەکەن، هەندێك بۆ کێڵانی زەوییەکانی و دروێنەکردنی دەغڵودانەکانی و دروستکردنی کەرەسە جەنگییەکانی و کەلوپەلی گالیسکەکانی دادەمەزرێنێ، و کچەکانتان بۆ عەتر رژاندن و چێشت لێنان و نانکردن بەکاردەهێنێ و باشترین کێڵگە و رەزو باخی زەیتوونتان دەبات و دەیدات بە خزمەتکار و دەست و پێوەندەکانی خۆی. دە یەکی کشتوکاڵ و رەزەکانتان لێوەردەگرێ و دەیدات بە نۆکەرە مەحرەمەکان و خزمەتکارەکانی خۆیو کوڕ و کچ و باشترین گەنجەکانتان و کەرەکانتان بۆ کارەکانی خۆی بەکاردەهێنێ و دە یەکی ئاژەڵەکانتان لێوەردەگرێ و ئێوە دەبن بە نۆکەری ئەو، لەو کاتەدا لە دەست پاشاکەتان کە بۆ خۆتان هەڵبژاردووە هاوار دەکەن و ئەوسا خودا بە هاوارتانەوە نایەت و یارمەتیتان نادات، بەڵام قەومەکەی سەموئیل دوای ئەوەی هەموو ئەمانەیان بیست وتیان: نەخێر بەڵکو دەبێ پاشایەك حوکممان بکات. سەموئیل گوێی لە قسەکانی قەومەکەی گرت و بۆ خودای گێڕایەوە. (کتاب اول سموئیل، باب هشتم، 6-12). لەگەڵ ئەمانەشدا، ئەم خودایە پاشان داود هەڵدەبژێرێ بۆ پاشای ئیسرائیل و بە کوڕی خۆی ناوی دەبات و لە دەستە ڕاستی تەختی خودایی خۆیەوە دایدەنێ، و بەرەکەتی پاشایی بە سلێمان و میراتگرانی دەبەخشێ و سلێمان بە بەندەی هەڵبژاردەی خۆی لە قەڵەم دەدات و گشت خشۆك و باڵندەکان و جن و بای سەرسەر دەخاتە بەردەستی.

لە کاتێکی تردا خودا وەها غەزەب لە کچانی ئۆرشەلیم دەگرێ کە فەرمان دەدات لە ئێستا بەدواوە تووکە بەریان نەڕوێت، چونکە ئەم کچانە کاتێ بە شەقامەکاندا رێدەکەن ناز و عیشوە دەنوێنن و بەغەمزەوە دەڕۆن:

"لەو ڕووەوە کە کچانی ئۆرشەلیم لە خۆیان بایی بوون و ناز و عیشوە دەنوێنن و بە لووت بەرزی و بەغەمزەوە بەرێدا دەڕۆن و پاوانەکانیان دەزرنگێننەوە، من تەپڵی سەریان کەچەڵ دەکەم و فەرمان دەدەم کە مووی بەریان نەڕوێت، جوانی خرخاڵ و لەرزانە و گوارە و بازن و دەسڕیان ناهێڵم، هەروەها جوانی

زنجیرو پشتوێن و شووشە عەترو مستیلە و ئەڵقە و قوماشی گرانبەها و جبە و شاڵ و ئاوێنە و کەتانی تەنك و روبەندەکانیان ناهێڵم. کاریّ دەکەم عەترەکانیان بۆگەن بێت و لە جیاتی پشتوێن پەت بکەنە پشتیان و لە جیاتی عاشق بەند زنار بکەنە سینەیان، لە جیاتی جوانی سوتاویان پێدەبەخشم و لەجیاتی پرچ کەچەڵی" (کتاب اشعیاء نبی، باب سوم، 16-24).

"تۆ ئەی ئۆرشەلیم، ئێستا خۆت گلاوکردووە، دانیشتوانی تۆ عەورەتی باوکیان ئاشکرا کردووە و لە ژنانی بێنوێژ نزیك بوونەتەوە، هەندێکیان لەگەڵ ژنی دراوسێکانی خۆیاندا خەوتون و هەندێکی تریان بە زۆر زینایان لەگەڵ بووکەکانی خۆیان کردووە. کەسانێکیش خوشکی خۆیان کردووە بە ژن. ئێستا کەوایە منیش لەبەرچاوی هەموو قەومەکان ناموسی تۆ ناهێڵم بۆئەوەی بزانی من یەهوەی خوای تۆم" (کتاب حزقیال، باب بیستو دوم 10-16).

لە کاتێکی تردا خودا لای حزقیال-ی پەیامبەری سکاڵا دەکات کە ئۆرشەلیم و سامرە، دوو پایتەختە پیرۆزەکەی ئەو تووشی گەندەڵی بوون و خۆیان خستۆتە داوی میللەتانی ئاشووری و بابلی و میسرییەکانی دراوسێیانەوە، بەڵام ئەم سکاڵایە بە زمانێ بەیاندەکات کە نەك تەنها ریتمی کۆنی کتێبێکی ئاسمانی تێدا نییە، بەڵکو هاوشێوەی زمانەکەی لە (*Sex Shop*)ەکانی ئەمڕۆشدا بەزەحمەت دەستدەکەوێت.

"ئەوەبوو رۆژی (5)ی مانگی (4)ی ساڵی سێهەمی (دیلێتیم لە بابل)، کە لەوکاتەدا لە دیلەکانی رووباری خاپور بووم، ئاسمان بۆ من کرایەوە و قسەی خودام بۆ هاتە خوارەوە و وتی: ئەی کوڕی ئادەم، بزانە دوو ژن کە کچی دایکیّ بوون، هەردووکیان لە میسر زینایان کرد، و لەویّ مەمکیان گوشین و فشاریان خستە سەر پەردەی کچێنیان، گەورەکەیان ناوی (ئەهولە) و بچووکەکەیان ناوی (ئەهولیبە) بوو، هەردووکیان لە منەوە نزیك بوون. بەڵام ئەهولە رووی لە من وەرگێڕاو زینای کرد و لەگەڵ هەموو هەڵبژاردەکانی بەنی ئاشووردا بێڕەوشتی کرد، دەستبەرداری ئەو بێڕەوشتیانەش نەبوو کە لە میسر دەیکرد، چونکە لە سەردەمی گەنجێتیدا لەگەڵی دەخەوتن و مەمکە ساواکانیان دەگوشی و زینایان لەگەڵ دەکرد. بۆیە من دامە دەست دۆستەکانی کە ئەو خۆشی دەویستن ئەوانیش عەورەتیان خستە ڕوو و پاشان بە شمشێر کوشتیان.

خوشکەکەشی واتە (ئەهولیبە) لە سێکسبازیدا لەو خراپتر بوو، لە خوشکەکەی زیاتر زینای کرد. بینیم ئەویش گلاو بووە و ڕێگای هەردووکیان یەك ڕێگا بووە... کوڕەکانی بابل چوونە سەر جێگای نووستنی و سێکسیان لەگەڵ کرد و گلاویان کرد، لەبەرئەوەی بێڕەوشتی خۆی ئاشکراکرد و عەورەتی خۆی خستەڕوو هەروەکو چۆن رۆحم لە خوشکەکەی بێزار بوو لەمیش بێزار بوو. بەڵام (ئەهولیبە) زیاتر بێڕەوشتی کرد و زیاتر هەوەسبازیی لەگەڵ دۆستەکانی کرد کە گۆشتیان وەکو گۆشتی کەرو تۆویان چەشنی تۆوی ئەسپ

بوو... ئێستا تۆ پێی بڵێ کە خودا دەفەرموێ: من غیرەی خۆم لە دژی تۆ دەخەمە گەڕ بۆئەوەی بــە تووڕەییـــەوە مامەڵـــەت لەگـــەڵ بکـــەن، رووتوقوتــت دەکەمــەوە بــۆ ئــەوەی رووتــی و بێڕەوشـــتی و ناشـــیرینی و داوێـــن پیســـیت دەرکـەوێ، لەبەرئـەوەی منت لـە بیرکـردو رووت لێوەرگێڕام. (کتاب حزقیال نبی، باب بیست و سوم، 1-35).

بەشێکی تر لەم سکاڵانامەیەی خودا لەمەش سەرنجراکێشترە:

"مـن وەکـو گیایـەك کـە لـە لـەوەڕگادا دەڕوێ تۆم گەورەکرد تا گەورە بوویت و گەیشتیتە ئەو تەمەنـەی کـە تیایـدا کچـان حـەز بـە جـوانی و ئـــارایش دەکـــەن. وردە وردە مەمکـــەکانت بەرزبوونەوە و موولە بەرت هات. لەو کاتەدا بوو کـــە دام بەلاتـــدا و تێگەیشـــتم کـــە کـــاتی هەوەســـبازیت هـــاتووە. دامـــێنی جبەکـــەم هەڵدایـەوەو خـوێنی پـەردەی کچێنیتم شـورد و سـوارت بـووم بـۆ ئـەوەی ناشـیرینی کارەکـەت بشـارمەوە. قوماشـی رەنگـاو رەنـگ و پـێڵاوی شـین و پشـتوێنی کـەتانیم دایـتێ و بـە جـوانیی زێڕ و زیو تۆم رازاندەوەو نان و هەنگوین و رۆنم بۆ هێنـای. بـەلام تـۆ بـە جوانیـت لـە خـۆت بـایی بوویـت و زینـای خـۆت بـۆ سـەراپای رێبـواران خسـتە بـازاڕەوەو مالێکـت بـۆ زیناکـاری خـۆت دروسـت کـرد و لـە هـەمان کاتـدا لـە رێوبـانیش بێڕەوشـتیت کـرد، لـە تیاترۆخانەکانـدا پـارە بـە سۆزانییەکان دەدەن بۆ ئەوەی لەگەڵیاندا بخەون بـەلام تـۆ خـۆت پـارەت بـە دۆسـتەکانت دا بـۆ ئەوەی زینات لەگەڵ بکەن".

بە پێچەوانەی بۆچوونی باوی مەزهەبە یەکتا پەرســـتییەکانەوە، یـــەهوە خوداکـــانی تـــر رەتناکاتەوە، و تەورات لـە هـیچ جێگایەکیدا، بە پێچەوانەی قورئانەوە، تەئکید لەوە ناکاتەوە کە خوداکـــانی تـــر درۆن، تـــەنها داوا لـــە نـــەوەی ئیســرائیل دەکــات کــە جگــە لــەو خــودای تــر نەپەرستن. لە تەوراتدا خودا بە قەومەکەی خۆی دەڵێ "تۆ نابێ کڕنووش بۆ خودایانی تر بەری، چونکە من کە خودای تۆم خوایەکی غیرەمەند و حەســودم کــە تۆڵــەی گونــاهی باوکــان لــە کوڕەکانیــان دەکەمــەوە هــەتا پشــتی ســێیەم و چوارەم (سفر خروج، باب بیستم، 5). پـەیمانی خوایانی دیکە مەپەرستە، لەبەرئەوەی یەهوە کە نـاوی (غیرەمەنـدە) خودایـە کـە غـیرە دەکـات" (سفر خروج، باب سی و چهارم، 14). لـە یەکەم رسـتەدا (دە) فرمـانی ناسـراو تەئکیـد لـە موسا دەکاتـەوە کـە یـەهوە خودایـەکی (غیرەمەنـدە) و نـاتوانێ ئـەوە قبـوڵ بکـات کە قەومەکـەی خـوای تـریش بپەرستن. لـە سـرودێکدا کـە موسـا بـە بۆنەی سەدو و بیست سالەی تەمەنییەوە کەمێك پێش مردنی کە لە بیابانی سینا بۆ قەومەکەی دەخوێنێتـــەوە دەڵێـــت: لەبەرئـــەوەی خـــودا مرۆڤانی لەسەر زەوی بڵاوکردەوەو هەرمیللەتـە بەشـی خـۆی دانـێ و ئەوسـا یـەهوەی کـرد بـە بەشـی بـەنی ئیسـرائیل و یـەعقوب بـوو بەشـی میراتـی ئـەو. یـەهوە لەسەر زەوی ئیسرائیلی بە وێرانی بینی و وەکو سۆمای چاوی پاراستی. وەکو هەڵۆیەك کە هێلانەکەی خۆی بجوڵێنێ و بێچـــوەکانی خـــۆی دابـــنێ و بالـــەکانی بڵاوبکاتــەوەو بێچــووەکانی بخاتــە ســەر و بــە پــەڕەکانی خــۆی بیانگوێزێتــەوە، خــودا تــەنها یــەهوەی بــۆ ئــەم کــارە رێنمــایی کــرد و هــیچ

خودایەکی بێگانەی تری لەگەڵدا نەبوو. (سفر تثینة، باب سی و دوم، 8-12)[6].

تەقریبەن لە هەموو کتێبە جیاوازەکانی تەوراتدا، تەنانەت تا کۆتایی سەردەمی پادشاکان، بەردەوام سەبارەت بە ستایشی خودایانی تر لە لایەن قەومی ئیسرائیلەوە سکاڵا کراوە، بێئەوەی ئینکاری لە بوونی ئەو خودایانەی تر کرابێ یان بە خودای درۆزن ناوبرابن. کێشەکە تەنها لەوەدا بووە کە ئەو خودایانە خودای کەسانی ترن و هی ئیسرائیل نین. تەنانەت دوای سەردەمی دوورخستنەوەی بابلییەکان و گەڕانەوەی جولەکەکان بۆ (خاکی پەیمان پێدراو) دیسان حزقیالی پەیامبەر سکاڵا لەوە دەکات کە قەومی ئیسرائیل خودایانی بێگانەیان پەرستووە و ستایشی خۆرو تەموزیان کردووە. ".. ئەوسا خودا منی بەرەو زارکی دەروازەی خۆی لە باکوور برد کە هەندێ ژن لەوێ دانیشتبوون و بۆ تەموز دەگریان، پاشان بردمی بۆ سەحەنی ناوەوەی ماڵەکەی لەوێ بیست و پێنج پیاوم بینی کە پشتیان لە پەیکەری خودا کردبوو و روویان لە خۆرهەڵات کردبوو و رووەو خۆر کڕنووشیان بردبوو، حەفتا کەسم لە پیرەکانی ئیسرائیل بینی کە هەریەکەیان مقالیەکیان بەدەستەوە بوو بۆ خودایانی بێگانە تیایاندا بخوردیان دەسووتاند" (کتاب حزقیال نبی باب هشتم، 11- 16) لە (مەزامیری داود) دا لەلایەکەوە یەهوە وەکو تاکە خودای راستەقینە ناسێنراوەو لەلایەکی ترەوە ئەوە هاتووە کە خودایان لەناو خۆیاندا ستایشی کارە سەرسوڕهێنەرەکانی یەهوە دەکەن و ئافەرینی دەکەن بۆ موعجیزەکانی، چونکە هیچیان ناتوانن رووبەرووی یەهوە ببنەوە و بەرامبەری بوەستنەوە (کتاب مزامیر، مزمور هشتاد و نهم، 5 و 6) لە کتێبی ئەیوب و کتێبی ئەرمیائی پەیامبەریشدا باسی ئەم کۆمەڵە خودایە کراوە. بە قسەی رینگ گێرن لە کتێبی "مەزهەبی ئیسرائیل"دا هەڵەیەکی تەواوە ئەگەر ئایینی موسا بە ئاینێکی بەراستی یەکتاپەرستی بزانین، چونکە لە هیچ جێگایەکی ئەم ئایینەدا ئینکاری لە بوونی خودایانی تر نەکراوە. ئەم خودایانە بوونیان هەیە، تەنها بایەخی یەهوەیان نییە، یەهوەش ناڕەزایی لە بوونیان دەرنابڕێ، تەنها دژی بوونیانە لە قەڵەمڕەوی تایبەتی خۆیدا".

یەکێکی تر لە سیفەتەکانی یەهوە بەڵێندانی بێپشتیوانە کە یان لە بنەڕەتدا قابیلی جێبەجێکردن نین یان خۆی مەبەستی نییە جێبەجێیان بکات. بەڵێن بە ئیبراهیم دەدات و لە بەرامبەر سونەتکردنی کوڕەکانیدا پێی دەڵێت "تەواوی زەوی هەتا ئەبەدی ئەبەد بە تۆ دەبەخشم و نەوەی تۆ وەکو تەپوتۆزی زەوی زیاد دەکەم، بەشێوەیەك ئەگەر تەپوتۆزی زەوی لە ژماردن بێت نەوەی تۆش لە ژماردن بێت. (سفر پیدایش، باب سیزدهم، 15) (ئەم زەویەم لە نیلەوە هەتا فورات بە تۆ بەخشیووە کە هەتا ئەبەدی ئەبەد فەرمانڕەوایی تێدا دەکەی" (باب پانزدهم، 18) و بەڵێن بە ئیسحاق دەدات کە "نەوەی تۆ وەکو وردە بەردەکانی کەناری دەریا زۆر دەکەم و تەواوی سەرزەوی بە کوڕەکانی تۆ دەبەخشم و لە نەوەی تۆوە بەرەکەت بەسەر سەراپای نەتەوەکانی جیهاندا دەبارێنم" (باب

بیست و شەشم، 4) و بە یەعقوب دەڵێت "لە دەوری تۆ دەبم و نەوەی تۆ دەکەم بە نەوەیەکی بەردار و دوای دوژمنانی خۆت دەکەویت و هەموویان بەر شمشێری تۆ دەکەون من لە هەموو جێگایەکدا لە پێش تۆدا بە لووتبەرزییەوە دەڕۆم" (سفر لاویان، باب بیست و شەشم، 7) و بە یوشع دەڵێت "لە بیابانەوە هەتا روباری فورات و هەتا دەریای گەورە موڵکی تۆ دەبێ و هیچ کەسێ توانای بەربەرەکانی قەومەکەی تۆی نابێ و تەواوی قەومەکانی سەر زەوی دەستی من دەبینن کە زۆر هێنەرە" (صحیفه یوشع، باب اول). بەڵام راستی مێژوو ئەوەیە کە سەرەڕای ئەم هەموو بەڵێنانە، نە نەوەی ئیبراهیم بە قەد تەپوتۆزی زەوی و وردە بەردەکانی کەناری دەریا زیادیان کرد و نە هەرگیز لە نیلەوە هەتا فورات کەوتە ژێر دەسەڵاتی ئیسرائیلەوە، نە تەواوی نەتەوەکان بەر شمشێری ئەو کەوتن.

سەبارەت بەم بەڵێنە بێپشتیوانانە، ڤۆڵتێر لە "هەڵسەنگاندنی کتێبی پیرۆز"دا کە بەرهەمێکی خۆیەتی بە گاڵتەی هەمیشەیی خۆیەوە روو لە قەومی ئیسرائیل دەکات و دەڵێت "هاورێیانم، پێتان وانییە کە رەنگە یەهوە بەم بەڵێنانەی کە نەیبردونەتەسەر گاڵتەی پێکردبن؟ چونکە ئێوە نەك هەر هیچ کاتێ نەبوونەتە خاوەنی خاکی لە نیلەوە تا فورات، بەڵکو چەندین جار خۆتان بوونە ژێر دەستەی خاوەنانی نیل و فورات و ماوەیەکی زۆر زیاتر لەوەی کە ئاغای خۆتان بوون کۆیلەی کەسانی تر بوون. فریدریکی دووەم، کاتێ لە جەنگە سەلیبییەکاندا سەرزەمینی بەڵێن پێدراوی ئێوەی لە نزیکەوە بینی وتی موسا لەم خاکەدا بەڵێنی شیر و هەنگوینەکەدا بیخۆن، زۆر باشتر بوو ئەگەر لەبری چل ساڵ رێپێوان لە بیاباندا بە کەشتیەکی کرێ بیبردنایە بۆ ناپۆلی. بە هەرحاڵ لە بیرتان نەچێت کە تەنانەت خودای ئێمە و ئێوەش دەتوانێ بەڵێن بدات و نەیباتە سەر".

یەهوە چەندین جار دان بەوەدا دەنێ کە بەدەستی ئەنقەست نەیارەکانی بە رێی هەڵەدا دەبات بۆ ئەوەی بیانوویەکی بە دەستەوە بێت بۆ ئازاردان و ئەشکەنجەدانیان. نموونەی دیاری ئەم گەمە دوو سەرەیەی یەهوە رووداوی رووبەڕووبوونەوەی موسایە لەگەڵ فیرعەوندا کە دابەزینی جۆرەها بەڵای ترسناکی بە دوادا دێت بۆ سەر میسرییەکان. لەم بارەیەوە لە بەشی تایبەت بە موسا لەم کتێبەدا روونکردنەوەی زیاتر دراوە(7).

لە سەراپای تەوراتدا ئەم مامەڵە گشتییە رەنگی داوەتەوە کە یەهوە بەتایبەتی خۆی بە خودای ئیسرائیل و بەرپرسی پشتیوانی لە بەرژەوەندییەکانی ئیسرائیل لە قەڵەم دەدات. تەنانەت ئەگەر لە رووداوە جیاوازەکاندا ئیسرائیل لەسەر حەقیش نەبێت.

لە کتێبی حزقیالی پەیامبەردا هاتووە کە "کەلامی خودا بۆ من حەزقیالی کوڕی یوزی هاتە خوارەوە و فەرمووی ئەی ئادەمیزاد، بڕۆ بۆ لای خانەدانی ئیسرائیل و قسەی منیان بۆ بەیان بکە، چونکە من بەتایبەتی تۆ بۆ ئیسرائیل دەنێرم نەك بۆ ئەو قەومانەی تر کە زمانیان تەمومژاوی و قورسە و ناتوانی لە

قسـەیان تێبگـەی" (کتـاب حزقیـال نـبی، بـاب سوم، 4–6).

لـە جێگایـەکی تـردا لـە ڕێگـەی حـەزقیالی پەیامبـەری خۆیـەوە پـەیام بـۆ خـەڵکی شـاخی سـەعیر دەنێـرێ کـە بـەر بـە دەسـتێوەردانی ئیسرائیلیەکان دەگرن، لە پەیامەکەیدا دەڵـێ کە ئـەو خـودای ئیسـرائیلە و لـە هـەموو کاتێکـدا لایەنگریی ئیسرائیل دەکات:

".. کەلامی خودا بۆ من هاتە خوارەوە وتـی: بـە چیانشـینانی سـەعیر بڵـێ یـەهوەی خـودا دەفەرموێ من لەمەودوا دژی ئێوە دەبم و دەست درێژیشـتان دەکەمـە سـەر و دەتانکـەم بـە مەسخەرەو شارەکانتان وێران دەکەم تا کاول بـن و بـزانن کـە مـن یـەهوەم، لەبەرئـەوەی دوژمنایەتی ئیسرائیلتان کرد... بە ژیانی خۆم قەسەم بە خوێن چۆکتان پێدادەدەم کە خوێن بۆ هەموو شوێنێ دواتان کەوێ، پێشینان و نەوەی داهاتووتان لێ دادەبڕم و شاخەکانتان پڕ دەکەم لـە کـوژراو کـە کوژراوەکـان بـە شمشـێر لەسـەر گـردو لـەناو دۆڵ و نشـێوەکانتان بکـەون، وێرانـەکانتان دەکـەم بـە وێرانـەی دایمـی تـا شارەکانتان چیتر ئاوەدان نەبنەوە تا بزانن کە من یەهوەی خودای ئیسرائیلم. (حزقیال نبی، باب سی و پـنجم، 1–9) هـەموو کـاتێ مـن بـە ئـاگری ڕقـی خـۆم لـە دژی هـەموو نەتـەوەو میللەتـەکانی تـرم کـە دەسـتیان لـە خـاکی مـن وەرداوەو کردوویانە بە مایەی نەفرەتی کەسانی تر (هەمان سەرچاوە – باب سی و هشتم، 5)".

ئارەزووی تایبەتی یەهوە بۆ ئەوەی هەرچی زیـاتر قوربـانی بـۆ بکـەن و بەتایبـەتی بـۆنی خۆشـی گۆشـتی بـرژاو بگاتـە لـووتی لـە سەرانسـەری تەوراتـدا ڕەنگـی داوەتـەوە. یـەك کتێبی تـەواو لـە تـەورات واتـە (سفر لاویـان) بـە 27 بـاب و زیـاتر لـە هـەزار بەنـدەوە بـۆ بڕیـار و مەرجەکانی قوربانی تەرخانکراوە، جگە لـەوەش بـەلای کەمـەوە لـە سـێ سـەد حالـەتی جیـاوازی دیکەدا بە بۆنـەی جیاجیاوە لە پەیمانی کۆندا ئاماژە بۆ قوربانی کراوە.

بـۆنکردنی بـۆنی کـەباب، چـەندان جـار ئـەم خودایـە والێـدەکات کـە لـە بڕیـارە سـەختەکانی پێشـووی خـۆی پاشـگەزبێتەوەو لـە ڕاسـتیدا قوربـانی ڕۆڵـی بـەرتیلێك دەبـینێ کـە بـە خـودا درابـێ. کـاتێ نـوح لـە کۆتـایی لافاوەکـەدا لـە کەشـتیەکەی دێتـە دەرێ و لـە هـەر ئـاژەڵ و باڵندەیەکی گۆشت حەلالی کەشتیەکە یەکێك بۆ یـەهوە دەکـات بـە قوربـانی و دەیـبرژێنێ بـۆی، یەهوە بە بۆنکردنی بۆنە خۆشەکەی لە بڕیاری پێشووی خۆی سەبارەت بە لەناوبردنی نـەوەی مرۆڤ پەشیمان دەبێتەوەو لە دڵـی خۆیدا دەڵێت "دوای ئەمـە ئـیتر بـەهۆی مرۆڤـەوە نـەفرەت لـە زەوی نەکـەم و جـارێکی تـر هـەموو ئاژەڵـەکان لـەناو نەبـەم، هـەروەکو کـردم" (سـفر پیـدایش، بـاب هشـتم، 20–22)، شـائولی یەکـەم پاشـای ئیسرائیل و خودای نیعمەت، کاتێ داود بـەهۆی ناڕاسـتی و کەموکورتییەکانییـەوە بـە غـەزەبی خـودا هەڕەشـەی لێـدەکات شـائول پێیـدەڵێت ئەگەر یەهوە تۆی لە من هانداوە من بە ئاگری بۆن خۆشی قوربانی ئەو ڕازی دەکەم (کتاب اول سموئیل، باب بیست و ششم، 19). لە بیابانی سـینادا یـەهوە فـەرمان بـە موسـا دەدات و پێیدەڵێت: (بە بەنی ئیسرائیل بڵێ دیاری من لە قوربـانی بۆنخـۆش و بـرژاو بێـنن و خواردنەکە

قوربانی دوو بەرانی یەکسالەی بێ عەیب بێت یەکێکیان بەیانی و ئەوی تریان لە عەسردا بێت لەگەڵ دەیەکی کیسەیەك ئاردی نەرم کە لەگەڵ چارەکی قاپێ رۆنی زولالی هەر بەرانێکدا تێکەڵ کرابێ لەگەڵ خواردنەوەی مەستکەر کە برێژرێ بە میحرابەکەی منداا، و لە رۆژی (شەممە)دا لەجیاتی بەرانێ دوو بەران و لەجیاتی دە یەك ئارد بیستیەك ئارد بێت، وێرای قوربانی برژاو لەگەڵ دیاری خواردنەوەکە برێژرێ (سفر اعداد، باب بیست و هشتم، 1-11).

له بابی یەکەمی ( سفر لاویان)دا خودا وەکو چێشتلێنەرێکی پرۆفیشنال، فەرمانی ئامادەکردنی قوربانی بۆ خۆی بە هەموو وردەکارییەکانییەوە بە موسا رادەگەیەنێ "کەواتە ئەو کەسەی قوربانی بۆ من دەکات بێگومان دەبێ لە ئاژەڵ واتە لە رەشەوڵاخ یان لە حەیوانی سپی بیکات. ئەگەر قوربانیەکە لە رەشەوڵاخ یان لە حەیوانی سپی بێت کەواتە دەست بخاتە سەر سەری و سەری ببڕێ و کوڕانی کاهینەکان خوێنی قوربانیەکە هەڵسون لەو ناوە، دوایی قوربانیەکە کەوڵ بکەن و کوڕی کاهینەکان لە شوێنی سەربڕینەکەدا ئاگر بکەنەوەو داری لەسەر بچنن و سەری قوربانییەکەو پیوەکەی بخەنە سەر ئەو دارانەی کە خستوویانەتە سەر ئاگرەکە، ریخۆڵە و سەروپێی قوربانییەکە بە ئاو بشۆن ئەوسا خودی کاهینەکە لەسەر شوێنی سەربڕینەکە هەمووی بسووتێنێ و چاودێری بکات کە بۆنەکەی خۆشتر بێ.. ئەگەر قوربانیەکە مەل بێت کەواتە لە کۆترە نەخشینە یان لە بێچووە کۆتر بێت، کاهین بیهێنێ بۆ لای شوێنی سەربڕینەکە و سەری بابدات تا سەری لە لەشی جیابێتەوەو بەسەر مەزبەحەکەدا بیسووتێنێ و خوێن بەلای قەسابخانەکەدا چڕ بکرێتەوە، و چیکڵدانەکەی هەرچی تێدایە فڕێی بدرێ و لای خۆرهەڵاتی مەزبەحەکەدا لە شوێنی خۆڵەمێشەکەی وەربدات و پاشان لە نێو باڵەکانیدا دایبنێ باڵەکانی لەیەك جیانەکاتەوە، و کاهینەکە لەسەر ئاگرەکە بیسووتێنێ و کە ئەوە قوربانی سووتاو دیاری ئاگرین و بۆنی خۆشە بۆ خودا" (سفر لاویان، باب اول، 1-17).

وا دیارە بۆنی کەبابی کەر بە پێچەوانەی بۆنی کەبابی رەشەوڵاخ و حەیوانی سپییەوە بەلای یەهوەوە پەسەند نییە، چونکە لە تەوراتدا فەرماندەدات کە نۆبەرەکانی ئاژەڵی ئیسرائیل هەموویان هی خودان و خاوەنەکانیان ناتوانن بیانکڕنەوە، بەڵام دەتوانن نۆبەرەی کەرەکانیان بکڕنەوە یان بە مەڕێك بیگۆڕنەوە جگە لەمە دەبێ ملی جاشەکەرەکە بشکێنن "خودا رووی لە موسا کرد و وتی. هەر نۆبەرەیەك کە لە رەحمی دایکی بێتە دەرەوە مرۆۋ بێت یان ئاژەڵ هی منە هەر نۆبەرەیەکی ئاژەڵیش کە هی تۆیە نێرینەکەی هی خودایە، هەر نۆبەرەیەکی کەر بگۆڕەوە بە بەرانێك ئەگەر نەتگۆڕییەوە ملی بشکێنە. هەر نۆبەرەیەکیش لە کوڕەکانت وەکو سەرانە بدە بە من. ئەگەر کوڕەکانت پرسیاریان لێکردی ئەمە چییە پێیان بڵێ لەبەرئەوەی یەهوە دەیویست ئێمە لە میسر لە شوێنی نۆکەریی بهێنێتە دەرەوە تەواوی نۆبەرەکانی میسری کوشت بە مرۆۋ و ئاژەڵەوە، لەبەرئەوە

منیش هەموو نێرینەکان کە لە ڕەحم دێنە دەرەوە بۆ خودا سەردەبڕم. بەڵام هەر نۆبەرەیەکیش لە کوڕەکانم وەکو سەرانە دەدەم بە خودا" (سفر خروج باب سیزدهم، 11-19، باب سی و چهارم 19-20) "هەر شتێ کە پەیوەندی بە خوداوە هەبێ چ مرۆڤ و چ ئاژەڵ نە بفرۆشرێ و نە وەکو سەرانە و ئاژەڵانە بدرێ، چونکە تایبەت بە خودای لە هەموو شتێ پیرۆزترە، هەر خێرێ کە خودی خێرە کە مرۆڤ بێ ئەگەر وەکو سەرانە (فدیە) نەدرێ هەڵبەتە دەبێ بکوژرێ" (سفر لاویان، باب بیست و هفتم، 28 و 29) لە (سفر خروج)یشدا خودا بە ڕاشکاویی بە موسا دەڵێت "نۆبەرە کوڕەکانی خۆت بدە بە من و نۆبەرەی مانگا و مەڕەکانیشت حەوت ڕۆژ لای دایکیان بهێڵەرەوەو لە ڕۆژی هەشتەمدا ئەوانیش بدە بە من" (سفر خروج، باب بیست و دوم 29 و 30).

نموونەیەك لە ئیشتهای یەهوە بۆ قوربانی دەتوانرێ لە کتێبی پاشایانی تەوراتدا بەدی بکرێ: "پاشان سلیمان لەبەردەمی خودادا قوربانی کرد، و ژمارەی ئەو قوربانیانەی کە سلیمان بۆ خودای کرد بریتی بوو لە (22) هەزار ڕەشەوڵاخ و (120) هەزار حەیوانی سپی" (کتاب اول پادشاهان، باب هشتم، 62 و 63). هەر لەم بارەیەوە لە (تواریخ ایام تورات)دا هاتووە "پاشان لە مانگی سێی سالی پانزەهەمی پاشایەتی (ئاسا)دا هەموو ئیسرائیل لە ئۆرشەلیم کۆبوونەوەو لەو ڕۆژەدا (7) سەد سەر ڕەشەوڵاخ و (7) هەزار سەر حەیوانی سپی لەو تالانیانەی کە هێنابوویان بۆ خودا سەربڕی" (کتاب دوم تواریخ ایام، باب شانزدهم، 10-14).

یەهوە گەلێك جار داوا لە قەومە هەڵبژاردەکەی خۆی دەکات کە هەرچی زیاتر دیاری بۆ بێنن، بەڵام بۆ ئەوەی لەم بارەیەوە تەزویر نەکەن خۆی بە وردیی جۆری ئەو دیاریانە دەستنیشان دەکات کە بەلایەوە پەسەندن ".. خودا بە موسای وت: بە بەنی ئیسرائیل بڵێ کە هەرچی زیاتر دیاریم بۆ بێنن، ئەو دیاریانەی کە بۆ من لێیان وەردەگری ئەمانەن ئالتوون و زیوو و لاجیوەرد و ئەرخەوان، بەردی بەنرخ و بەردی قوببە ئالتوونی سینەبەند، کەتانی تەنك و پێستەی (خز)[8] پێستەی بەرانی سوورەوەکراو وموی بزن، ڕۆن بۆ چرا و دەرمان بۆ بخوردی بۆندار (سفر خروج، باب بیست و پنجم، 2-5). هەرکەسێ لە بەنی ئیسرائیل کە قوربانی سەلامەتی خۆی بۆ خودا بکات، پاشان پیوی قوربانیەکە و سنگی بهێنێ بۆ ئەوەی سنگەکە لەبەرئەوەی دیاری جوڵەیە لە دیاری خودا بجوڵێنرێتەوە، ئەوسا کاهین پیوەکە لەسەر مەزبەحەکە بسووتێنێ و سنگەکەی بجوڵێنێ، ئەو سنگە بۆ خۆی کوڕەکانی بێت، ڕانی ڕاست بۆ دیاری بەرزکردنەوەی لە قوربانی سەلامەتی خۆی بدات بە کاهین (سفر لاویان، باب هفتم، 29- 33) پاشان موسا بە پێی فەرمانی خودا دەستی خستە سەر سەری بەرانەکە و سەری بڕی و هەندێ لە خوێنەکەی گرت و دای لە نەرمایی گوێی ڕاستی هارون و هەروەها دای لە ناو لەپی دەستی ڕاستی و بەری پێی ڕاستی، باقی خوێنەکەشی ڕشت بە دەوری

مەزبەحەکەدا، پیوو چەوری و هەموو چەوری ناو سکی قوربانیەکە، سپێتی جگەرو چەوریەکەی و رانی راستی هەڵگرت و لە سەللەی نانی بەیانی کەلای خودا بوو یەك نانی بەیانی و یەك نانی رۆنی و یەك ناسکی هەڵگرت و خستنیە سەر پیوو و رانەکە و هەمووی وەکو دیاری جوڵە برد بۆ خودا پاشان سنگی بەرانەکە کە تایبەت بوو و بەشی موسا بوو بۆ دیاری جوڵە جوڵاندەوە وەکو ئەوەی کە خودا فەرمانی بە موسا کردبوو (سفر لاویان باب هشتم، 23-29).

بۆ ئەوەی هەموو ئیسرائیلییەك باش حالی بێت کە قسەکانی خودای ئەو جدییە و هەڵخەڵەتێنەر نییە، بەمناسەبەو بێمناسەبە یەهوە ئەنجامی لادان لە فەرمانەکانی بە یادی قەومە هەڵبژاردەکەی خۆی دەهێنێتەوە.

"ئەگەر گوێ لە من نەگری و هەموو فەرمان و فەرزەکانم کە پێتدەڵێم جێبەجێ نەکەی، ئەو دەمە لە شار و لە بیابان بە نەفرەت دەبی و تەشتی هەویر و میوەی خاکەکەت و گوێرەکە و بەرانی گەلەکەشت نەفرەتیان لێدەکرێ، پەتاو سیل و تاو ئیلتیهاب و گەرمی و شمشێر و بای ژەهراوی و زەردوویێت بۆ دەنێرم، ئاسمانت بەسەر سەرتەوە دەبێ بەمس و زەوی لە ژێر پێتدا دەبێت بە ئاسن و باران لەگەڵ خاك و خۆڵدا تێکەڵ دەکەم تا لە ئاسمانەوە بێتە خوارێ و لە ناوت بەرێ، تووشی ناسۆر و گەری و خوران و شێتی و کوێری و دڵە کوتێت دەکەم. ئەو ژنەی مارەی بکەی کەسێکی تر لەگەڵیدا دەخەوێ. گاکەت لەبەرچاوت سەربڕێ و کەسانی تر گۆشتەکەی بخۆن، کەرەکەت لەبەرچاوت بە تالان ببرێ، ئەژنۆو رانت و لە بنی پێتەوە هەتا تەپڵی سەرت تووشی دوومەڵێکی پیس دەکەم کە قەت چاك نەبێتەوە. تۆوێکی زۆر دەبەی بۆ کێڵگە بەڵام کوللە دەیخوات، مێوو رەز دەروێنی بەڵام شەرابی ترێکەی ناخۆی چونکە کرم ترێکەت کاول دەکات. ئەو غەریبەی لە ناوتاندایە دەبێ بەسەرتان و ئێوە دەبن بە کلکی ئەو (سفر تثنیة، باب بیست و هفتم 15-44)، دڕندەی بیابانت بۆ دەنێرم بۆ ئەوەی منالەکانت لەناوبەرێ و بێ منال بمێنێتەوە و ئاژەڵەکانت لەناو بەرن و رێگاکانت کاول بێت و دە ژن لە تەنورێ نان بکەن، گۆشتی کوڕ و کچەکانی خۆت دەخۆیت، لاشەکانتان دەدەم بەسەر لاشەی بت پەرستاندا (سفر لاویان، باب بیست و ششم، 14-32) لەبەرئەوەی گوێت بە فەرمانەکانی خودات نەداو لەو ناوە ترسناکە واتە ناوی یەهوە نەترسای" (سفر تثنیة، باب بیست و هشتم).

"یەهوە (صبایوت)[9] دەفەرموێ کە ئۆرشەلیم دەکەم بە شوێنی حەوانەوەی چەقەڵ و خواردنی خەڵکەکەی دەکەم بە (ئەفسەنتین) و ئاوی تال دەکەم بە قوڕگیاندا و لاشەی مرۆڤ وەکو گوفەکی ئاژەڵ لە بیاباندا دەکەوێ و کەس نابێ هەڵیان بگرێتەوە. هەر کەسێ عەقڵی هەیە دەبێ شانازی بکات کە من دەناسێ کە یەهوەی خودای رەحمەت و دادپەروەریی ویژدانم، بەڵام رۆژێ دێت کە خەتەنەکراو خەتەنە نەکراوەکان پێکەوە سزا دەدەم و هەموو ئەوانەشیان لەگەڵدا ئەشکەنجە

دەدەم کە قەراغی بەریان دەتاشن" (کتاب ارمیاء نبی، باب نهم، 11-26).

"یـــەهوە صـــبایـــوت خـــودای ئیســـرائیل دەفـەرموێ: ئیـدی بەڵایـەکی وا بەسـەر خـەڵکی ئۆرشەلیم دەهێنم کە گوێی هەر کەسێ بیبیستێ هـاوار بکـات. گۆشـتی کـوڕ و کچـەکانی خۆیـان دەرخـــوارد دەدەم، و هـــەر کەســـە گۆشـــتی دراوسێکەی خۆی دەخوات" (کتاب ارمیاء نبی، باب نوزدهم،9).

".. نووســـراوێ لـــە ئیلیـــای پەیامبـــەر (ئیلیـاس)ەوە بـە یـەهورام پاشـای ئیسـرائیل گەیشـت کـە یـەهوەی خـودای داودی باوکـت دەفـــــەرمووێ لەبەرئــــەوەی دانیشـــــتوانی ئۆرشـــەلیمت هەڵخەڵەتانـد کـە زینـا بکـەن، بێگومـان خـودا کوڕەکانـت و ژنەکانت و هـەموو سەروەت و سامانەکەت تووشی بەڵایەکی خراپ دەکات، لەناو سکتدا تووشی نەخۆشیەکی وات دەکات کە ریخۆڵـەکانت لە کۆمتـەوە بێنە دەرێ. خودا بەو شێوەیە کاری کرد و لەگەڵ رۆژگاردا ناو سکی یەهورام هەر رۆژە زیاتر لە کۆمیەوە هاتــە دەرێ هــەتا بــەدەردی ســەخت مــرد و قەومەکەی بخوردیان بۆ نەسوتاند" (کتاب دوم تواریخ ایام، باب بیست و یکم، 12-20).

بـــۆ تـــەواوکردنی ئـــەم فەهرەســـتە، لـــە جێگایـەکی تـری کتـێبی سـەموئیلدا هـاتووە کـە ".. دەستی خودا لەسەر خەڵکی ئەشدود قورس بـوو و هـەموویانی تووشـی ناسـۆر کـرد هـەتا ریخۆڵـەیان لـە کۆمیانـەوە هاتـە دەرەوەو ڕزا" (کتاب اول سموئیل، باب پنجم، 6).

لە کاتێکی تردا کاهینی پەرستگای سلێمان لـە ئۆرشـەلیم نوسـخەی ئەسـڵی ئـەو تەوراتـەی کەلەلایـــەن خـــودی موســـاوە نووســـراوەو (بـــە درێـــژایی چـــەندان ســـەدە خـــودی کاهینـــەکان ئاگایـان لێـی نـەبووە!) بەرێکـەوت دەدۆزێتـەوەو ئەم دۆزینەوە پڕ بایەخە لە لایەن کاهینێکەوە بە یـەهوەی خـودا رادەگـەیـەنرێ. بـەڵام کاردانـەوەی یـەهوە ئەوەیـە کـە پـەیام بـۆ پاشـاو کاهینـانی ئیسرائیل بنێرێ کـە هـەموو ئـەو بەڵایانـەیان بـۆ دەنێری کە لەو کتێبەدا نووسراوە، لەبەرئـەوەی بخوردیـان بـۆ خوداکـانی تـر سـووتاندووە و بـۆ ئـەویان نەسـووتاندووە" لـە هەژدەهـەم سـالی پاشـایەتی یوشـیادا لـە ئۆرشـەلیم، حـەلقیای کاهین لە کاتێکدا کە زیوەکانیان لە مالی خودا دەبـردە دەرێ ئـەو کتـێبی تەوراتـەی خـودای دۆزییـەوە کـە بەدەسـتی موسـا نووسـرابوو، حـەلقیا کتێبەکـەی دا بـە شـافان و شـافانیش بردی بۆ پاشاو بۆی خوێندەوەو پاشا حەلقیای کـاهین و چـەند کەسـێکی تـری نـارد بـۆ لای (خولدەی کاهینەی ژنی شـەلوم کوڕی توقهتـەی کـوڕی حەسـرەی لباسـدار) و خولـدەی کاهینـە پێـی وت خـودای ئیسـرائیل دەفـەرموێ بـەو کەسـەی تـۆی نـاردووە بـۆ لای مـن بڵێـی ئیـدی بەڵایـەکتان بەسـەر دێـنم کـە بـە خەیالیشـتاندا نـەهاتبێ، هـەموو ئـەو نەفرەتانـەی لـەم کتێبـەدا نووسـراوە بۆتـان دەنێـرم، چونکە بخوردتـان بـۆ خودایـــانی تـــر ســـووتاندووەو بـــۆ منتـــان نەسـووتاندووە" (کتـاب دوم تـواریخ ایـام، بـاب سی و پنجم، 14-25).

شـان بـە شـانی ئـەم هەڕەشـانە، یـەهوە باشـیەکانی تاعـەتی بێچەندوچـونی خۆشـی بـە قەومە هەڵبژاردەکەی رادەگەیەنێ:

"ئەگەر یەهوەی خـــودای خۆت بپـــەرستی،

بەرەکەت دەخەمە نان و ئاوتەوەو نەخۆشیت لێ دووردەخەمەوە، و لەسەر خاکەکەت بەراویتە و نەزۆك نابێت و ژمارەی رۆژەکانت تەواو دەکەم و سامی خۆم دەنێرمە بەردەمت و تەواوی دوژمنەکانت لەبەردەمتدا ملکەچ دەکەم، زەردەواڵە دەنێرمە پێشتەوە بۆ ئەوەی کەنعانیەکان و حەتیەکان راوبنێن، بەرەبەرە راویان دەنێم و دووریان دەخەمەوە بۆئەوەی ئەوەی تۆ زۆر بێ و زەوی کۆنترۆڵ بکەی، و سنوورت لە دەریای قەلزەمەوە تا دەریای فەلەستین و لە بیابانەوە هەتا رووباری فورات درێژ دەکەمەوە و دانیشتوانی ئەو ناوچانە دەسپێرم بە تۆ و لەبەردەمتدا دەبن و تێیان دەخوری (سفر خروج، باب بیست و سوم 25-31).

لە سیفەتەکانی تری یەهوە ئەوەیە کە لە رووداوە جیاوازەکاندا کە پەیوەندیان بە کوشتن و فریودان و دەستدرێژییەوە هەیە ئاسایی لایەنی بکوژ یان فریودەر دەگرێ نەك ئەو کەسەی کە بووە بە قوربانی دەسدرێژی.

کاتێ قابیل-ی کوڕی ئادەم و حەوا، براکەی لەبەرئەوە دەکوژێ کە دیارییەکەی ئەو بۆ خودا لە دیارییەکەی قابیل زیاتر پەسەند کراوە لەلایەن خوداوە، یەهوە نەك تەنها لێکۆڵینەوە لەگەڵ قابیل ناکات بەڵکو هەڕەشە دەکات هەرکەسێ قابیل بکوژێتەوە حەوت جار لەلایەن ئەوەوە تۆڵەی لێدەکرێتەوە (سفر پیدایش، باب چهارم، 15). لە کاتێکیشدا سارای ژنی ئیبراهیم، داوا لە مێردەکەی دەکات کە کوڕە گەورەکەی خۆی لەگەڵ دایکیدا دەربکات بۆ ئەوەی کوڕی کەنیزەکە نەبێتە شەریکی کوڕەکەی سارا واتە ئێسحاق، یەهوە لایەنی سارا دەگرێ "ئەو رۆژەی کە ئیسحاقیان لە شیر برییەوە ئیبراهیم میواندارییەکی گەورەی کرد، سارا کوڕەکەی هاجەری میسری بینی کە پێدەکەنێ. پاشان بە ئیبراهیمی وت ئەو کەنیزەو کوڕەکەی دەرکە، چونکە ئەگەر دەریانکەی کوڕی کەنیز لەگەڵ کوڕەکەی مندا نابێت بە شەریکە میرات. ئەمە بەلای ئیبراهیمەوە قورس بوو، بەڵام خودا بە ئیبراهیمی وت هەرچی سارا پێی وتووی گوێی لێبگرە و بە قسەی بکە.. بەرەبەیان ئیبراهیم لە خەو هەستاو نان و کوندەیەك ئاوی هێناو کردیە کۆڵی هاجەر و لەگەڵ کوڕەکەیدا دەریکردن. پاشان هاجەر لەگەڵ ئیسماعیلدا لە بیابانی (برشبع)دا سەرگەردان بوون، لەبەرئەوەی ئاوی کوندەکە تەواو بوو کوڕەکەی لە ژێر بنچکێکدا دانا و ماوەی هەڵدانی تیرێك لێی دوورکەوتەوەو لە بەرامبەری دانیشت چونکە وتی با مەرگی کوڕەکەم نەبینم، دەنگی لێهەڵبڕی و دەستی کرد بە گریان" (سفر پیدایش، باب بیست و یکم، 8-16) لە کاتێکیشدا کە یەعقوبی کوڕە بچووکی ئیسحاق، بە فرت و فێڵ بەرەکەتی پەیامبەری لە براکەی وەردەگرێ و ئیسحاق بە ترسەوە هەستدەکات کە یەعقوب بە فرت و فێڵ مافی براکەی زەوت کردووە، یەهوە هەروا لایەنی فریودەر دەگرێ نەك هی فریو خواردوو (سفر پیدایش، باب بیست و هشتم، 3 و 4).

یەکەمین پاشا کە یەهوە بۆ ئیسرائیل دایدەنێ شائولە کەلەلایەن یەهوەوە دەبێتە مەئموری لەناوبردنی تەواوی قەومی

فەلەستینی عەمالیق، بەڵام لەبەرئەوەی پاشان یەهوە هەستدەکات کە شائول هەندێ مانگا و مەڕی ئەوانی هێشتۆتەوە و لە ناوی نەبردوون لە دانانی بە پاشا پەشیمان دەبێتەوەو خۆی و هەموو کوڕەکانی دەکوژێ: "سەموئیل بە شائولی وت: خودا منی ناردووە بۆ ئەوەی بەرەکەتت بدەمێ و ببی بە پاشای قەومی ئیسرائیل. کەواتە ئێستا گوێ بۆ قسەی خودا ڕادێرە کە دەفەرموێ لەبەرئەوەی لە هاتنی ئیسرائیلدا لە میسرەوە قەومی عەمالیق بەربەرەکانی ئیسرائیلیان کرد کەواتە بڕۆ و عەمالیق تێك بشکێنە و هەرچییان هەیە بە تەواوی لەناوی بەرەو ڕەحمیان پێمەکە بەڵکو ژن و پیاو و منال و ساوای شیرە خۆرە و مانگا و مەڕ و حوشتر و کەرەکانیشیان بکوژە. پاشان قەومەکەی خۆی بانگ کرد و دووسەد هەزار پیادەو دەهەزار پیاوی لە یەهودا سان ئامادەکرد و عەمالیقەی تێکشکاند و ئەجاجی پاشای عەمالیقەی بە زیندوویی گرت تەواوی خەڵکی عەمالیقەی بە شمشێر کوشت. بەڵام مەڕو مانگا و بەرخەکانی نەکوشت.. قسەی خودا بۆ سەموئیل هاتە خوارێ و وتی، لەوە پەشیمان بوومەوە کە شائولم کرد بە پاشا لەبەرئەوەی قسەکەی منی جێبەجێ نەکردووە.. سەموئیل بە تووڕەییەوە چوو بۆ لای شائول و وتی کاتێ خودا تۆی هەڵبژارد کە ببی بە پاشای ئیسرائیل پێی نەوتی عەمالیقە و هەرچیان هەیە. بە تەواوی لەناوی بەرە؟ ئایا ملکەچی فەرمانی خودا باشترە یان گوێدان بە پیوی بەرانەکان؟ لەبەرئەوەی قسەی خودات جێبەجێ نەکرد ئەویش بۆ پاشایەتی تۆی ڕەت کردەوە. سەموئیل داوای (ئەجاج)ی پاشای عەمالیقەکانی کرد کە شائول لای خۆی بە زیندوویی هێشتبوویەوە، لەگەڵ خۆی بردی و لە (جەلجال) بە بەرچاوی خوداوە بە دەستی خۆی لەت لەتی کرد، خودا لە کارەکەی سەموئیل خۆشحال بوو، بەڵام لەوە پەشیمان ببۆوە کە شائولی کردبوو بە پاشای ئیسرائیل" (کتاب اول سموئیل، باب پانزدهم، 1-35) "خودا شائول و هەموو کوڕەکانی کوشت و لاشەکانیانی لەژێر داربەروودا شاردەوە. شائول لەبەر ئەو خیانەتەی کە لە خودای کردبوو و مەڕو مانگاکانی عەمالیقەکانی نەکوشتبوو کابرا بە پێچەوانەی قسەی خوداوە هێشتبوونییەوە (تواریخ ایام، کتاب اول، باب دهم ، 12).

"..لەبەرئەوەی قەومی ئیسرائیل لەگەڵ کچانی قەومی (موئاب)دا زینایان کرد و کڕنووشیان بۆ خوداکانی ئەوان برد، خودا رقی لە ئیسرائیل هەستاو بە موسای وت هەموو سەرکردەکانی قەومی ئیسرائیل بگرەو لەبەرهەتاو لە سێدارەیان بدە بۆ ئەوەی تووڕەیی من دامرکێتەوە. موسا بە داوەرانی ئیسرائیلی وت هەر یەکێ لە ئێوە ئەو کەسانەی خۆی بکوژێ کە roوویان لە (بعل) کردووە.. ئەوە بوو پیاوێك لە ئیسرائیل ژنێکی لەگەڵدا بوو کە لە قەومی (مدیان) بوو، هەر کە (فینحاسی کوڕی عازار-ی کوڕی هارون-ی کاهین) بینینی نێزەی هەڵگرت و کردی بە سکی هەردووکیانداو هەمان کات کولێرا لە ئیسرائیل دوورکەوتەوە. ئەوانەی پێشان بە غەزەبی یەهوە بە کولێرا مردبوون بیست و چوار هەزار کەس بوون. خودا بە موسای وت: ئیدی فینخاسی

کوڕی عازاری کوڕی هارون تووڕەیی منی لە بەرامبەر بەنی ئیسرائیلدا نەهێشت و بووە هۆی ئەوەی کە بەنی ئیسرائیل لەبەر غیرەی خۆم لەناوبەرم. بۆیە پێی بڵێ ئەم پەیمانی کاهینێتیە بۆ خۆیو بۆ منالەکانی هەتا هەتایی دەبێت، چونکە ئەو بۆ خودای خۆی بەغیرەت بوو" (سفر اعداد، باب بیست و چهارم، 1-13).

چەندان جار لە ئەنجامدانی کاری کەویستوویەتی پەشیمان دەبێتەوەو ئاراستەی دەگۆڕێ. لافاوی نوح لەبەرئەوە روودەدات کە خودا لە دروستکردنی مرۆڤ پەشیمان بۆتەوەو لە ئەنجامدا بەڵایەك دەهێنێ کە تیایدا باقی گیانەوەرەکانی تریش لەگەڵ مرۆڤدا لەناو دەچن، بەڵام هەمان خودا ماوەیەك پاش ئەوە لە ئەنجامی بۆنی ئەو کەبابەی دێتە لووتی کە هی ئەو ئاژەڵانەیە کە نوح کردونی بە قوربانی لە بۆچوونەکەی پاشگەز دەبێتەوە و بریاری درێژەپێدانی ژیانی مرۆڤ و ئاژەڵان دەدات (سفرپیدایش، باب ششم، 5-7 و باب هشتم،20-22).

داودی پەیامبەرو پاشا دەست دەکات بە سەرژمێری قەومی ئیسرائیل و دەگاتە ئەو ئەنجامەی کە ژمێردراوەکان هەزار هەزار و دوسەد (یەك ملیون و دووسەد هەزار) پیاوی شمشێربازن لە ئیسرائیل و حەفتا و چوار هەزاریش لە یەهودان، بەڵام لاویان و بنیامینیەکان لەم ژمارەیەدا لەبەرچاوناگیرێن، لەبەرئەوەی داود رقی لێیانە. ئەم مەسەلەیە بەلای خوداوە ناپەسەند دەبێت، لەبەرئەوەی بە پێچەوانەوە لاویانی خۆشدەوێت، بۆ ئەم مەبەستە خالی داود دەنێرێ بۆ لای داود بۆئەوەی لە سێ جۆر سزا لەلایەن خوداوە یەکێکیان هەڵبژێرێ: یان سێ سال لە ولاتەکەیدا قاتوقری بێت، یان تا سێ مانگی تر بە دەستی دوژمنانی بکوژرێ، یان سێ رۆژ کولێرا بۆ ئیسرائیل بێتە خوارەوە و فریشتەکانی خودا هەموو سنوورەکانی ئیسرائیل کاول بکەن، داود سزای سێیەم هەڵدەبژێرێ. لە ئەنجامدا خودا کولێرا بۆ ئیسرائیل دەنێرێ و حەفتا هەزار کەس لەناو دەچن، پاشان فریشتەکانی خۆی بە شمشێرەوە رەوانە دەکات بۆئەوەی باقی خەڵکی ئۆرشەلیم لەناوبەرن، بەڵام لەناکاو پەشیمان دەبێتەوەو فریشتەکان بانگدەکاتەوە بۆ لای خۆی بەبێئەوەی گوناهباری سەرەکی واتە داود لەو نێوەدا هیچ زیانێکی بەرکەوتبێ. (کتاب دوم تواریخ ایام، باب بیست و یکم، 5-15).

حەزقیای پەیامبەر نەخۆش دەکەوێ و لە سەرەمەرگدا دەبێ، یەهوە (ئەشعیای کوڕی ئاموصی پەیامبەر) دەنێرێ بۆ لای کە پێی بڵێ خودا دەفەرموێ خۆت ئامادە بکە چونکە بەم زوانە دەمری. حەزقیا رووی بەلای دیوارەکەدا وەردەگێرێ و هۆن هۆن دەگری، قسەی خودا بۆ ئەشعیا دێتە خوارەوە و دەڵێ بە پێشەوای قەومی من حەزقیا بڵێ ئێستا ئامادەنیت بۆ مردن و گریایت، پانزە سالی تر دەخەمە سەر تەمەنت. ئێستا یەکدانە هەنجیر بێنە و بیخەرە سەر دومەڵەکەت بۆئەوەی چاك بیتەوە (کتاب دوم پادشاهان، باب بیستم، 1-8).

یەهورامی کوڕی ئەخاب پاشای ئیسرائیل داوا لە ئەلیەشعی پەیامبەر دەکات کە بۆ

سەرکەوتنی لە شەڕدا لەبەردەمی خودادا دوعا بکات، ئەلیەشع دەڵێت سوێند بە ژیانی یەهوە کە ئێستا لە حوزوریدا وەستاوم ئەگەر ڕێزی (یەهو شافات)ی پاشای یەهودام نەگرتایە ڕووم لە تۆ نەدەکرد، بەڵام ئێستا گۆرانیبێژێکم بۆ بێنن، چونکە گۆرانیبێژ دێت و عود لێدەدات و خودا دڵخۆش دەبێت و فەرمان بە ئەلیەشعی پەیامبەری خۆی دەدات بە یەهورام بڵێ خودا دەفەرموێ لەم دۆڵەدا سەنگەر لێبدەن بۆئەوەی دوژمنان نەتوانن بێنە پێشەوە (کتاب دوم پادشاهان، باب سوم، 13-17).

ئەخاب پاشای ئیسرائیل بە لەخشتەبردنی لەلایەن ئیزابیلی ژنیەوە کە بە پێچەوانەی خواستی یەهوەوە ناچاری دەکات ڕەزێك داگیر بکات خودا تووڕە دەکات، یەهوە لە ڕێگەی ئلیاسی پەیامبەرەوە پەیامی بۆ دەنێرێ کە بە تەواوی لەناوی دەبات و تەواوی پیاوانی خانەدانی ئەو چ ئازاد و چ بەندین دەیانکوژێ و فەرمان دەدات سەگەل خوێنی خۆی بلێسنەوەو ئیزابێلی خێزانیشی لای حەساری یەزرەعیل بخۆن، ئەخاب کە ئەمە دەبیستێ جبەکەی هەڵدەکات و پەلاس لەبەردەکات و ڕۆژ و دەگرێ و لەسەر زەوی دەخەوێ. لەم کاتەدا کەلامی خودا بۆ ئلیاس دێتە خوارەوە وە کە بینیت ئەخاب چۆن لە من ترسا و خاکی بووە؟ کەواتە لەبەرئەوەی لە حوزوری مندا خاکی بۆتەوە، چیتر بەڵای بەسەر ناهێنم، بەڵام لە ڕۆژگاری پاشایەتی کوڕەکەیدا بەڵا بەسەر کوڕەکەی دێنم (کتاب اول پادشاهان، باب بیست و یکم، 21-29).

"لەبەرئەوەی پاشایەتی (ڕەحبعام) سەقامگیر بوو ئەو و تەواوی ئیسرائیل وازیان لە شەرعی خودا هێنا، یەهوە شیشق پاشای میسری هێنایە سەر ئۆرشەلیم بە (1.200) عەرەبانەو (60000)سوار و خەڵکێکی زۆرەوە لە میسری و لوبی و سکی و حەبەشیەکان، و بە شەمعیای پەیامبەری وت کە بە ناوی ئەوەوە بە ڕەحبعام و سەردارانی یەهود بڵێت کە من بە دەستی شیشق لەناوتان دەبەم. ئەوسا ڕەحبعامو سەردارانی ئیسرائیل تەوازوعیان نیشاندا، خودا بە شەمعیای وت لەبەرئەوەی خاکێتی خۆیان نیشاندا لەناویان نابەم بەڵام دەیانکەم بە بەندەی شیشق بۆ ئەوەی قەدری بەندەیی من بزانن (کتاب دوم تواریخ ایام، باب دوازدهم، 1-8).

لە کاتێکی تردا خودا ڕۆڵی جاسووسێك یان کارمەندێکی ئیستخبارات دەبینێ: "لەوکاتەدا ئینای کوڕی یەربعام پاشا نەخۆشکەوت، و یەربعام بە ژنەکەی خۆی وت" هەستەو دەموچاوی خۆت بگۆڕە بۆئەوەی نەتناسنەوە کە تۆ ژنی یەربعامی، بچۆ بۆ لای ئەخیای پەیامبەر و دە نان و کولیچە و گۆزەیەك هەنگوینی بۆ بەرە بۆ ئەوەی لەوە ئاگادارت بکاتەوە کە کوڕەکەمان چی بەسەر دێت. پاشان ژنەکەی وایکرد و هەستا بە ڕوخساری گۆڕاوەوە چوو بۆ (شیلوە) و گەیشتە مالی ئەخیا و ئەخیا نەیدەتوانی ببینێ، چونکە لە پیریدا بەرچاوی تاریك ببوو. بەڵام خودا بە نهێنی بە گوێی ئەخیادا چرپاندی کە ئێستا ژنەکەی یەربعام دێت تا دەربارەی کوڕەکەی کە نەخۆشە لێت بپرسێت، لەبەرئەوەی کە دێت

خـۆی گۆڕیـووه و سـاختەی کـردووه بۆئـەوەی نەیناسـیتەوه. کەواتـه کـه هـات ئـاوای پێبڵـێ. ئـەخیا هـەر کـه گـوێی لـه تەپـەی پێـی ژنەکـەی یەربعام بوو که دەهاتە ژووری، پێی وت ژنەکەی یـەربعام وەرە ژوورەوە، بۆچی روخساری خـۆت گۆڕیـووه؟ ئێسـتا لـه زمانی خـوداوه بـه یـەربعام بڵــێ لەبەرئــەوەی رووت لــه خودایــانی تــر وەرنـەگێڕا و لـەو ڕێگەیـەوه منـت تـووڕه کـرد منیش بەلاّ بۆ هەموو بنەماڵەی یەربعام دەنێرم و هـەموویان فرێـدەدەم وەکـو شـیاکه چـۆن فـرێ دەدرێ. فەرمانـدەدەم هەرکەسـێ لـه بنەماڵـەی یــەربعام لــه شــاردا بمــرێ ســەگەل بیخــۆن هەرکامیشیان له بیاباندا بمرێ مەلان لاشەکەی بخـۆن. کوڕەکەشـت هـەر کـه گەڕایتـەوەو پێـت خستە ماڵەوه دەمرێت. پاشان ژنەکەی یـەربعام هەستاو بـەرەو مـاڵ کەوتـەڕێ، هـەر کـه گەیشـتە ماڵــەوە یەکســەر کوڕەکــەی مــرد (کتــاب اول پادشاهان، باب چواردهم، 1-17)[10].

# جانتا ونبوەگەی واڵتەر بنیامین

ئەحمەد ئەخوەت

لە فارسییەوە: مستەفا زاهیدی

واڵتەر بنیامین لە سالی 1933ەوە ، واتە لە دوای بە دەسەلاَت گەیشتنی نازیەکان بە زۆری ژیانی لە پاریس بردەسەر، سالی 1940 کە ئالمانیەکان فەرانسەیان داگیر کرد، هەولیدا لەم شارە بڕواتە دەرو هۆرکایمەر ڤیزای ئەمریکای بۆ وەرگرت. بنیامین لە دوایین رۆژەکاندا بە هاوکاری رێنوێنێك بە ناوی خاتوو ئەلیزا فیتکۆو لە گەڵ ژمارەیەکی تردا لە رێگای کوێستانییەوە بەرەو ئیسپانیا وەرێ کەوت و لە رێگا لە گوندی سەر سنووری (پۆرت-بۆ) مالئاوایی لە ژیان کرد. لیزا فیتیکۆ نۆڤەمبەری 1980 بیرەوەرییەکانی خۆی لە دوایین رۆژەکانی ژیانی بنیامین تا ئەو کاتەی لە ئەوو هاوسەفەرەکانی لە سەر گردێ کە دەیخواردە سەر پۆرت-بۆ بەجێهێشتووە ، لە ژێر ناوی "بەسەرهاتی بنیامینی پیر" بلاو کردەوە.

خاتوو لیزا فیتیکۆ لە راپۆرتەکەی خۆیدا ئاماژە بە جانتایەکی رەش دەکات. هەڵبەت بنیامین پێشتر بەشی سەرەکی "پرۆژەی پاساژەکان" واتە" گەلاَلەکان و دەسنووسەکانی" سپاردبوو بە هاورێ پاریسییەکانی ژۆرژباتای و پیەرمیساك تا لە رێگای ئەوانەوە بگاتە دەست تیودۆر ئادۆرنۆ. هێشتا هۆکاری مردنی بنیامین نادیارە. بەلاّم روانگەی زاڵ ئەوەیە کە خۆی کوشتووە. ئەم وتارە کە شان بە شانی ئەم گریمانەیە باس لە ئەگەری کوشتنی ئەو دەکات، بە مانای دەرکردنی حوکمێکی رەها نییە دەربارەی بنیامین. بەڵکوو تەنها بە مانای خستنە رووی دوو گریمانەیە کە دووهەمیان تازە دەرکەوتوە. رۆلف تیدمەن، کۆکەرەوەو ئیدیتۆری " کۆمەڵە بەرهەمەکانی" بنیامین بەسەرهاتی دوایین

ڕۆژهکــــــانو هـــــــهروهها چارهنووســــــــی دهسنووسهکانی" پاساژهکانی"ی به تهواوهتی باس کردوه.

دهربارهی گریمانهی کوشتنی بنیامین به دهستی مهئموورهکانی ستالین دهبێ ئهم خاڵه له بهرچاو بگرین که بنیامین له کاتی ژیانیدا، به هیچ شێوهیهك کهسایهتییهکی هێند ناودارو (مهترسیدار نهدههاته) ئهژمار (بۆ ڕووسهکان). لانــی کـــهم لـــه کتێبـــی " ڕۆژژمێرییـــهکانی مۆسکۆدا"ڕووسیهی ستالینی پهسهند دهکات. ئهم کتێبه بهرههمی سهفهری ئهوه بۆ مۆسکۆ له ساڵی 1926 لهگهڵ ئاسییه لاسیس:بۆ ساتیێ: ،چرکهیهك ههست دهکهی که لهم دونیایهدا تهنهایتو بۆ ههمیشه تهنها دهمێنیتهوه.

## واڵتر بنیامین

باس له جانتا کۆن و ڕهشهکهی واڵتر بنیامین دهکهین. ئهو جانتایهی که له دوایین ڕۆژهکانداو ئهو کاتهی له فهرانسهوه بهرهو ئیسپانیا بهڕێ کهوت پێی بووو بۆ ساتێکیش لێی دوور نهکهوتهوه، جانتایهك که ڕۆژێك دوای مهرگی( له یهکهم سهعاتهکانی بهرهبهیانی 27ی سێپتامبری 1940 له شاری پۆرت –بۆ له سنووری فهرانسه ئیسپانیا)دا دیارنهما. چی لهم جانتایهدا بوو که ئهوهنده بۆ بنیامین گرینگ بوو که به هاوسهفهرهکانی دهوت ئهمه له ژیانی من گرینگتره، جانتایهك که نهیتوانی له کێوهکانی پیرنهوه ڕهتی بکاو بیگهیهنێته ولاّتی سپانیاو له سهری گیانی له دهست دا. تا ئێستاش به تهواوهتی هۆکاری مردنی بنیامین دهرنهکهوتوهو نازانین بیرمهندی 48 ساڵهی قوتابخانهی فرانکفۆرت چۆن تێدا چوو. تا ساڵی 1991 دهیانگوت بنیامین به دهستی هێزهکانی پۆلیسی سپانیا گیراوهو به ناچاری خۆی کوشتووه. چونکه دهترسا بیگهڕێننهوه بۆ فهرانسهی داگیرکراوو بیدهنه دهست گشتاپۆ.

ستیفن شوارتز نووسهری ئاڵمانی له وتاری" مردنی ڕازئاوی واڵتر بنیامین" گریمانهی خۆکوژی به دروستکراوی دهزگای ئهمنییهتی ستالین دهزانێو لای وایه بنیامین به دهستی هێزهکانی سهر به ستالین کوژراوه. بۆ ئهوهی بزانین چی لهو جانتایهدا بوو که بوو به هۆی مهرگی خاوهنهکهی دهبێ بهم دوو گریمانهدا بچینهوه. چارهنووسی بنیامینی خۆشهویست و جانتا کۆنهکهی بهم دوو تیۆرییهوه بهنده.

## تیۆری خۆکوژی

له ساڵی 1930ه، هێزه فاشیستیو ڕاستگهراکان له ئهورووپا گهشهدهسێنو دیمۆکراتهکان له ئۆرووپا له بهرامبهر هێزهکانی وهفادار به هیتلهر چۆك دادهنو دهسهلاّتیان پی دهسپێرن. به دهسهلاّت گهیشتنی هیتلهرو نازییهکان له ئالمان ژمارهیهکی زۆر له ڕوناکبیرانو لهوانه واڵتر بنیامین دوور خرانهوه. ئهو ساڵی 1933 له بهرلینهوه بهرهو پاریس کهوته ڕێو پهنای برده ئهم شاره. ئهو شارهی که خۆشی دهویستو شهقامهکانی به" ولاّتی ڕاستهقینهی" خۆی دهزانی. ژیان له تاراوگهدا به ههژاری دهستی پێکرد. بنیامین له ڕێگای وهرگێڕانی دهقه ئالمانییهکانهوه، بلاّوکردنهوهی وتارو یارمهتییهکی کهم که

لەلایــەن چــالاکانی" ئەنجومــەنی لێکۆڵینــەوە کۆمەڵایەتییەکانــەوە" کــە خۆشــیان لــە تاراوگــە بوون، ژیانی بە سەر دەبرد.

لــە گــەڵ ژمارەیــەکی زۆر لــە بیرمەنــدان و هونەرمەندان لە نزیکەوە ئاشنا بوو. بەڵێ ئەو تا ئـەو کاتـە لـە فەرانسـە مایـەوە کـە حکوومـەتی فەرانسە لە شەڕدا شکستی خواردو حکومـەتی فیشـی دەرکـەوت، دوای شکسـتی فەرانسـە لـە شەڕدا کەوتە بیری ئەوەی کە لـەوێیش هـەڵبێت. ســەرەتا رۆشــتە مارســەی. ئــادۆرنۆ ڤیــزای تــەزوێری ئــەمریکای بــە شــێوەیەکی گــەرەنتی کراو بۆ نارد. بەم ڤیزایـەوە لەگـەڵ کۆمـەڵێك لـە کۆچبەران کـە ژمارەیەکیشـیان جوولەکـە بـوون بەرەو ئیسپانیا بە رێ کـەوت. شـەوێ لـە گوندی پـۆرت–بـۆ لـە کوێسـتانی پیرنیـە لـە سـنووری فەرانسـە و ئیسـپانیا مانـەوە. لـەوێ بـۆ دوایـین جار لەگەڵ پۆلیسی فەرانسە رووبەڕوو بۆوە.

ئەوان ئیزنی ئەوەیان نەدا کە کۆچبەرەکان بـە زووی ئـەوێ جـێ بێڵن و وەك دەڵـێن کەسـێك لــەوان کۆچــبەرەکانی بــەوە ترســاندوە کــە دەیانگێڕنـەوە بـۆ پـاریس. رەنگـە ئەمـە گاڵتـە بووبـێ، یـان رەنگـە ئـەو کەسـە خـۆی فاشیسـت یــان سادیســت بووبــێ. گرووپەکــەیان نــاردە هۆتێلـێ ..( ئەو شەوە) بنیامین بـە مـۆرفین خـۆی کوشت. رۆژی دواتـر_ رەنگـە لـە ژێـر کاریگـەری خۆکوشــتنەکەی ئــەودا_ ئیزنیــان دا هــەموو گرووپەکە ئەوێ بەجێبهێڵن. ئـەوان پـۆت–بۆیـان جێهێشــتو تــەنها بنیــامین مایــەوە. لــە گۆڕستانێکدا کە چەن ساڵ لـەوەوپێش ریکلـەی هاوڕێی بە" هاوڕێی مەرگ و بەرد"ی نـاو نـابوو. هانا ئارنت چەن مانگ دواتـر سـەردانی ئـەوێی کرد. قەبرێکی نەدۆزییەوە کە ناوی بنیامینی لە سەر بێت. بەڵام بۆ گرشووم شوولمی نووسی:" گۆڕســتانەکە دیمەنێکــە لەســەر بــەردێ، لــە خــوارەوەی دەریــای ناوەڕاســتەوەیە. یــەکێ لــە جوانترین دیمەنەکانـە کـە لـە ژیانمـدا دیوومـە". راپۆرتـێ کـە خوێندتانـەوەو بابـەتی لـەم چەشـنە ژمارەیــان کــەم نییــە. وتــەکانی یــەکێ لــە هاوڕێکانی بنیامین ژنێ بە ناوی هەنی گۆڕلەند، ژنێ کە دواتر لەگەڵی ئاشنا دەبین ئەم راپۆرتانە پشت راست دەکاتەوە.

بێگومـان خۆکـوژی یـەکێ لـە دڵەڕاوکـەکانی بنیـامین بـوو و لـە چـەن شـوێن لـە دەفتـەری بیرەوەرییەکانیدا باسی کردبوو، هـەر ئـەم شـتە بوو بە هۆی ئەوەی کە کەم کەس گومان بکات لە وتــەکانی گۆڕلەنــدو ئــەم کــارەی بنیــامین بــە شتێکی سروشتی بۆ ئەو بزانن.

هەرچــەن هاوڕێکــانی بنیــامین ، گرشــووم شـۆلم و هانـا ئارنـت ، بـەبێ ئـەوەی بیانـەوێ دەوریـان هـەبوو لـە خولقـانی ئـەم وەهمـەدا کـە گۆیا ئەو خۆی کوشتوەو بەستێنی گریمانـەی خۆکوژیان ئامادە کرد. بۆ وێنە شۆلم دەنووسێ کە بنیامین بەر لە ساڵی 1940یش چەن جار ویستوویەتی خۆی بکوژێ. ناوەڕاستی ئووتی 1931 بنیامین دەستی دایە نووسینی دەفتـەری بیرەوەری و یەکەم لاپەڕەکەی وا نووسیبوو: لە هەڤدەی ئووتـەوە تـا ئـەو رۆژەی دەمرم، کـە زۆر دوور نییــە، لــەم دەفتــەرەدا دەنووســم. ئــەو رۆژانـەش لـە ئـەو پـەڕی خراپـی بـاری رۆحـی و دەروونیـدا بـوو. جیـا لـە ژنەکـەی و کوڕەکـەی دەژیـا و پێوەنـدی خۆشەویستیشـی لـە گـەڵ ئاسیە لاسیس نەمابوو2.ئاشکرایە کە ئەمانە نابن بە هـۆی خۆکـوژی کەسێك و رەنگە بشزانن کــە بنیــامین لــە چ هەلوومــەرجێکی نالــەباردا

دەژیا.بەتایبەت ئەوەی کە فاشیستەکان تا دەهات بە هێز دەبوون و بەدەر لەمانەش ئەم پرسیارەش هەر بە بێ وەڵام مایەوە کە ئاخۆ دڵەڕاوکەی خۆ کوژی دەبێ بەهۆی ئەوەی کە کەسێك هەر دەست بداتە خۆ کوژی؟ مەگەر جیاواز لەوەیە کە ئەوانەی بەردەوام باس لە خۆکوژی دەکەن توانای ئەم کارەیان نییە؟

## 2- تیۆری کوشتن

ئێستا گوێ لە وتەکانی ستیفن شوارتز دەگرین کە گریمانەی خۆ کوژی رەت دەکاتەوەو بۆ ماوەی چەن ساڵ بە شوێن ئەوەوە بوو بیسەلمێنێ کە بنیامین بە دەستی "ك.گ.ب شورەوی" کوژراوە. زانیارییەکانی ئەم بەشە هەمووی لە وتارێکی ئەو وەرگێراوە کە پێشتر باسمان لێکرد بە ناو" مەرگی گوماناوی والتر بنیامین". شوارتز دەڵێ:" لە 14ی ژووئنی 1940دا کە پاریس لە لایەن ئەرتەشی نازییەوە داگیر کرا 2 میلیۆن کەس کە لە ناویاندا رووناکبیرانی دژە فاشیست دەبینرا بەرەو باشووری فەرانسە هەڵهاتن، کەسانێکی وەك مارسل دووشان، مارك شاگال، والتر بنیامین، هانا ئارنت، ئاندرە برتۆن و ماکس ئەرنست."

ئەمانە لە دوو لاوە لە مەترسیدا بوون: یەکەم لە لایەن فاشیستەکانی ئاڵمانی و دووهەم لە لایەن دەزگا ئەمنیەکانی شورەویەوە کە بە پشتیوانی حکوومەتی ڤیشی و بەستنی پەیمانێك لە نێوان ئاڵمان و سۆڤیەتدا بە ئاسانی دەهاتنە فەرانسە بۆ ئەوەی ئەو کەسانە بناسن کە دژ بە سۆڤیەتن و لە ترسی فاشیسم پەنایان هێناوەتە فەرانسەو بەو شێوە دوای ناسینیان لە بەینیان ببەن. چ یەك گرتنێکی رەش بوو. پێوەندی نێوان فاشیستەکان و کۆمۆنیستەکان" لە راستیدا ستالینیستەکان" ئەمەش لە رۆژگارێکی وەها سەختدا. والتر بنیامینی بێچارە چی لە دەست دەهات؟ ئەویش وەك هەمووان سەرەتا رۆشتە مارسەی و دواتر بەرەو کێوەکانی پیرنە بەرێ کەوت تا لەوێوە پەنا بباتە وڵاتی ئیسپانیا.

بنیامین لای وابوو هەڵاتن بۆ ئیسپانیا سادەترین و باشترین رێگەبوو. لە سەردەمی شەری ناوخۆی ئیسپانیادا شۆڕشگێرە ئیسپانیاییەکان کە مەترسیان لەسەر بوو هەر لەم رێگاوە پەنایان دەهێنایە فەرانسەو ئەم دوو وڵاتە حەشارگەیەکی باش بوون بۆ هەڵاتوانی یەکتر. هەر چەن والتر بنیامین لەم ماوەدا نووسەرێکی زۆر ناودار نەبووو کارە گرینگەکانی( لەوانە کتێبی پاساژەکان) هێشتا بلاو نەکرابوونەوەو ئەویش لەو نووسەرانەیە کە دوای مەرگی ناوی دەرکرد(و ئەوەی سەیر بوو رووناکبیرەکان ئەویان زۆرتر وەك شۆڕشگێرێکی کۆمۆنیست دەناسی نەك دیمۆکراتێکی عارف) بەڵام هاورێگەلێکی راستگۆی هەبوو کە بەباشی بەهای ئەویان دەزانی و ئامادەبوون یارمەتی بدەن بەوەی لە فەرانسە کە ببوو بە شوێنی کوشتنی مرۆڤە رووناکبیرەکان هەڵبێت.

(بۆ وێنە هانا ئارێنت و تئۆدۆر ئادۆرنۆ کە هەردووکیان ئەو کات لە ئەمریکا دەژیان و بنیامین دەسنووسی دوایی بەرهەمی خۆی (هەندێ تێز دەربارەی فەلسەفەی مێژووی) دوو مانگ پێشتر پێیان دابوو کە لەگەڵ خۆیان ببەن بۆ ئەمریکا) پاسپۆرتی وڵاتی ئەمریکایان بۆ

وەرگرتبووو هاوڕێکەی تری گێرشۆم شۆڵم کە لە فەلەستین دەژیا هانی دەدا بەوەی کە بێتە ولاتی بەڵێندراو. بەلام بنیامین کە داگیرکردنی فەرانسەی بە شتێکی کورت ماوە دەزانی پێی خۆش نەبوو کە ولاتە خۆشەویستەکەی جێبهێڵێ و زۆر دوور بکەوێتەوە و دەیویست بە شێوەیەکی کاتی بڕواتە ولاتی ئیسپانیا و هەر کە شەڕی نازییەکان کۆتایی پێهات بگەڕێتەوە بۆ ولاتەکەی. یەکێکی تر لە رووداوە گرینگەکان شکڵگرتنی کۆمیتەی نەجاتی ئۆرژانسی بوو کە لە ژێر چاودێری بزووتنەوەی بەرگری فەرانسەدا کاری دەکرد و ئەرکەکەی یارمەتی بەهەلاتنی ئەو کەسانە بوو لە مەترسی گرتنا بن لە لایەن نازییەکانەوە. هانس یەکێك لە هاوڕێکانی بنیامین ئەندامی ئەم کۆمیتەیە بوو. هانس چەپگەرایەکی ئاڵمانی بوو کە دوور خرابۆوە بۆ ئیسپانیا. هانس بۆچوونەکەی بنیامین( لە مەڕ دوور نەکەوتنەوە لە فەرانسە)ی پەسەند کرد و بڕیار بووو لیزا فیکتۆ ( ژنی هانس) گرووپێکی بچووك پێکهاتوو لە 3 ژن و منداڵێکی بچووك(  منالی هانس و فیکتۆ) و بنیامین لە ڕێگای کێوەکانی پیرنەوە بگەیەنێتە ئیسپانیا. هیچ زانیارییەك لە 2 ژنی ناو گرووپەکە لە بەردەستدا نییە و کەسی سێهەم هێنی گۆرلەند بوو، ژنێکی گومانلێکراوی چەپگەرا کە روون نییە چۆن پەیوەست بووە بەم گرووپە بچووکەوە. ئەو کەسەی کە تا دوایین ساتەکان لە بنیامین دوور نەکەوتەوەو هەموو زانیارییەکانی تایبەت بە خۆکوژی بنیامین ( لە دیدی شوارتزەوە) دروست کراوی ئەون. ئارکادی مێردی هێنی چەن سال دوای ئەم رووداوە لایەن گشتاپۆوە ئێعدام کراو هێنی

ماوەیەك دوای مەرگی بنیامین لەگەل ئەریك فرۆمدا زەماوەندی کرد و 7 سال دواتر سالی 1952 مرد.

سەیر لەوەدایە کە هێنی بۆ ماوەیەکی زۆر هاوڕێی نزیکی ئۆتۆ کاتێزی ئاڵمانی بوو، هاوڕێی نزیکی بنیامین کە دواتر دەرکەوت سەر بە (ك.گ.ب) بووە. سەیری کایەی جیهان بکەن دواتر، سالی 1953 ڕێکخراوی ئەمنیەتی شوورەوی بە تاوانی سیخوڕی کردن بۆ بەریتانیا ! لە شاری پراگ دای لە دار. بۆ یەکەم جار ڕێکەوتی 16ی مارسی 1980 باس لە جانتای ون بووی والتر بنیامین کرا. لەم کاتەدا شێمین ئێبرامێسکی مامۆستای خوێندنەوە، یەهوودییەکان نامەیەکی بۆ گێرشۆم شۆڵم نوسی و پێی وت کە ژنێ بە ناوی لیزا فیکتۆ ئەرکی پەڕاندنەوەی بنیامینی لە سەر شان بووە لە فەرانسەوە بەرەو سپانیا و کۆمەڵێك زانیاری سەیری هەیە دەربارەی بنیامین و ، باس لە جانتایەك دەکات کە لەو ڕۆژدانەدا بە دەست بنیامینەوە بووەو دواتر ون بووە.

شۆلم لە چەند پێوەندی تەلەفۆنییدا لەگەل لیزا کۆمەڵێك زانیاری گرنگی بەدەست هێنا و بڕیاردرا لیزا ڕاپۆرتێ لەم بارەوە بنووسێ، بابەتی کە سالی 1982 لە بلاوکراوەی مێرکۆردا بلاوبۆوە. بەرهەمێك کە هەڵگری زۆر زانیاری گرینگ بوو دەربارەی والتر بنیامین و ئەم سەردەمە زۆر قەیراناوییە. فیکتۆ لە ڕاپۆرتەکەدا نووسیبووی: " ڕۆژی 23ی ی سێپتامبری 1940 لە بەندەری مارسەیەوە بەرەوە کێوەکانی پیرنە لە سنووری ئیسپانیا وەڕێ کەوتن. بنیامین شەوێك لە جەنگەڵدا ون دەبێ و ئەندامانی گرووپەکە بەیانییەکەی

دەیدۆزنــەوە". دەڵــێ:" جانتایــەكی رەش بــە دەست بنیامینەوە بوو كە بە زەحمەت لە گەڵ خۆیدا دەیهێنا". بۆ ساتێكیش لە خۆی دووری نەدەخستەوە. ئەو كاتەی فیكتۆ پێی دەڵێ جانتاكەی بدا بەو كە بۆی هەڵگرێ ، وەڵام دەداتەوە:" نا هەموو ژیانمو دەسنووسی كتێبە تازەكەم لێرەدایە، نابێ ون بێت. دەزانی ئەم جانتایە گرینگترین شتی ژیانمە... قەت... قەت! نامهەوێ ون بێت. هەرچی بریارە روو بدات با روو بدات بەلاَم دەبێ ئەمدەسنووسانە سالم بمێننەوە. هەندێ كەسو لەوانە هانا ئارێنت لە سەر ئەو باوەرەن دەسنووسی درێژەی چەن تێزێك دەربارەی فەلسەفەی مێژوو لەو جانتایەدا بووە بۆیە ئەوەندە بۆی گرینگ بووە، واتە كۆمەڵێك لە وتە رەخنەگرانەكانی بنیامین دەربارەی كۆمۆنیسمی رووسیو ئەوەی كە بۆچی نایهەوێ نزیكایەتی ئەم رەوتە بكاتو جیاوازییەكی زۆری هەیە لەگەڵ ئەم چەشنە بیر كردنەوەدا. ئەم وتانە بۆ ئەو كاتە بوێرییەكی زۆری دەویستو هاورێكانی( ئەندامانی قوتابخانەی فرانكفۆرت)و دوژمنانی هێرشیان دەكردە سەرو لە خۆیان دوریان دەخستەوە. بەلاَم شوارتز بۆچوونێكی تری هەیەو لای وایە كە دەسنووسەكان هیچ نییە جگە لە لیستی ئەو كەسانەی كە سیخوریان بۆ (ك.گ.ب) دەكرد! ئەو كەسانەی كە زۆر ئاسان دەیانتوانی دزە بكەنە ناو رێكخراوە كۆمۆنیستییەكانی ئورووپاوەو نەیارانی بۆچوونەكانی ستالینی بناسنو بیانكوژن. شوارتز لای وایە بنیامین كۆمەڵێك زانیاری گرینگی دەربارەی هاورێی رابردووی خۆی كاتێرز بەدەست هێنابوو و نیگەرانی بنیامین شتێكی سروشتی بوو چونكە زۆر باش دەیزانی دەستی داوەتە چ كارێكی پر مەترسی، كارێك كە سەرەنجام دەبێ بە هۆی مەرگی.

بەلاَم شوارتێز هیچكات بە شێوەیەكی ئاشكرا ناڵێت كە كاتێرز فەرمانی كوشتنی بنیامینی دەركردووەو بنیامین لە سەدا سەد بە دەست هێنی گۆرلەند كوژراوەو كەسێكی تر جگە لەو دەستی نەبوە لە كوشتنیدا. ئەو فیلْی( من ناونیشانەكەی دەدەمو تۆ ناوی ببە) بە كار دەهێنێ. هەموو ئەو ناونیشانانەی ئەو دەیدات بۆ ئەم دوو كەسە دەگەرێتەوە، ئەو دوو كەسەی ئەوە بۆ چەن ساڵ دەچێ مردوونو ناتوانن بەرگری لە خۆیان بكەن. بەلاَم هەموو زانیارییەكانی شوارتێز بەڵگەدارن، بەلاَم نازانرێ بۆ هەندێ جار ئەنجامەكانی تا رادەیەك ئاڵۆزو سیاسییانەیە.

ئەگەر راپۆرتی پۆلیسی سەر سنوور دەربارەی مەرگی بنیامین نەبوایە گومانمان دەكرد لەوەی كە جانتایەك بوونی بووبێتو بە شتێكمان دەزانی دروستكراوی زەینی فیكتۆ بێت، چونكە گۆرلەند هیچ باسی لەو جانتایە نەكردوە( سروشتییە كە باسی لێنەكات چونكە بە وتەی فیكتۆ جانتاكەی لای ئەو بووە). رۆژی 30 ئۆكتۆبەری 1940 ماكس هۆركهایمەر هاورێی نزیكی بنیامین كە هەواڵی مەرگی بنیامین پێدەگات نامەیەك بۆ پۆلیسی سەر سنوور دەنووسێو داوای راپۆرتێك دەربارەی چۆنییەتی مەرگی بنیامینو ئەو شتانەی كە لێی بە جێ ماوە دەكات.

بەپێی راپۆرتی پزیشكی یاسایی بنیامین بە هۆی خوێنرێژی مێشكییەوە مردوەو كەرەسە تایبەتەكانی لە كاتی مەرگیدا بریتی بوون لە :

"جانتایەکی چەرمین تایبەت بە بازرگانەکان، کاتژمێرێکی پیاوانە، پیپێك، 6 وێنە، وێنەیەکی رادیۆلۆژی، چاویلکەیەکی پزیشکی و کۆمەڵێك دەسنووس کە زانیارییەکی وەها دەربارەی ناوەرۆکەکەیان لەبەردەستدا نییە." تا ئێرە دەردەکەوێ کە جانتاکە ون نەبووە بەڵام روون نییە ئاخۆ شتێکی لێ ون بووە یان نە؟ وا دیارە هێنی یەکەم جار لەگەڵ خۆی دەیبات بەڵام دواتر دەیداتەوە بە پۆلیس. بەڵام ئەو( نامەی خۆکوژی) بنیامین نادات بە دەست پۆلیسەوە بەڵکوو لە بەستەیەکدا بۆ ئادۆرنۆی ناردو ئادۆرنۆ بە خوێندنەوەی بەوە گەیشت کە بە راست هاوڕێکەی خۆی کوشتوەو وا دیارە هەموو کەس بە شوێن ئادۆرنۆدا باوەڕیان بە خۆ کوشتنی بنیامین کردوە. هەروەها هێنی لە راپۆرتێکی جیاوازدا دەربارەی دوایین دیداری لەگەڵ بنیامین هەمووشتێکی روون کردەوە، بەڵام ئەو نامەیەی بۆ ئادۆرنۆ نەنووسیبوو بەڵکوو بۆ مێردەکەی خۆی ئارکادی نارد کە یەکێك بوو لە چالاکانی بزووتنەوەی بەرگری لە فەرانسە. لەم نامەوە ئەوە دەردەکەوێ ئەوان رۆژی 25ی سێپتامبر گەیشتوونەتە شاری کەناری پۆرت-بۆ و بۆ ماوەیەك دەڕۆنە هۆتێلێکەوە، خاوەنی هۆتێلەکە کە گومانیان لێدەکات پۆلیس ئاگادار دەکاتەوەو پۆلیس دەیانگرێت.

پۆلیسی سەر سنوور هەڕەشەیان لێدەکات کە دەیاندات بە دەست بەرپرسانی فەرانسەوە، بەڵام ئەمشەو دەتوانن لە هۆتێل بمێننەوە! وا دیارە ئەمە فێڵێکی هەمیشەیی پۆلیسی سەر سنوور بووە بۆ ترساندنی هەڵاتووەکان بەوەی کە دەیاندەنەوە بە دەست بەرپرسانەوە، پارەیەکی زۆریان لێ سەندوون. بەڵام ئەندامانی ئەم گرووپە کە لەم شتە ئاگادار نەبوون زۆر ترسابوون، بنیامین کە بە وتەی هێنی مەرگی خۆی نزیك دەدی بڕیار دەدات خۆی بکوژێ بەڵام نەدرێ بەدەست گشتاپۆوە. هێنی دەڵێت:" من رۆژی دواتر ( رۆژی 26ی سێپتامبر) بنیامینم دیت. وتی شەوی رابردوو بە رادەیەکی زۆر مۆرفینی بەکارهێناوە. حاڵی زۆر خراپ بووو دوو نامەی دا بە من، یەکیان بۆ خۆم و ئەویتریان بۆ ئادۆرنۆ، وتی ناوەرۆکی نامەکان بە زەینم بسپێرم و نامەکان نەهێڵمەوە.

دواتر کەوت و لە سەر خۆی چوو. دوو سەعات دواتر مرد. نامەی بنیامین بۆ ئادۆرنۆ دەخوێنینەوە( هەڵبەت بەو شێوەیەی سەرەتا لە زەینی هێنی دا تۆمار و دواتر لە سەر کارت پۆستاڵێك نووسرا، بە زمانی فەرانسە رێکەوتی 25ی سێپتامبری 1940):" لە هەلومەرجێکدا کە هیچ رێگایەکی هەڵهاتن نییە، هیچ کارێکی ترم لە دەست نایەت جگە لەوەی کۆتایی بە ژیانی خۆم بێنم. لەم گوندە بچووکەدا کە کەوتۆتە پیرنەوە ژیانم کۆتایی پێدێت، شوێنێ کە کەس نامناسێت. داوات لێدەکەم پەیامەکەم بگەیەنە بە هاوڕێکەم ئادۆرنۆ پێی بڵێی کە لە کۆتایی ژیانمدا لە چ دۆخێکدا بووم. ئیتر هیچ هەلێکم نییە بەوەی کە نامەیەکی تر بنووسم".
نامەیەکی سەیرە، بەشی یەکەم بۆ ئادۆرنۆ نووسراوە، بەڵام بەشی دووهەمەکەی( داوات لێدەکەم کە ... ") بە دڵنیاییەوە بۆ ئادۆرنۆ نەنووسراوە بەڵکوو لەگەڵ هێنیدا قسەی کردوە. دیار نییە چۆن وەها شتێك دەبێ ببێت. جگە لەمەش ستیفێن شوارتز کۆمەڵێ رەخنە لە نامەکەو هەروەها بەکارهێنانی مۆرفین دەگرێت.

سەرەتا لە مۆرفینەوە دەست پێدەکەین. زۆر باش رەخنە لەوە دەگرێت کە چۆن کاتێك بنیامین دەڕوات بۆ لای هێنی و پێی دەڵێت شەوی رابوردو (وەتا نزیکەی دە سەعات لەوەوبەر) برێکی زۆر مۆرفینی بەکارهێناوەو هێشتا هەر هیچی لێنەهاتوە. لە کاتێکدا کە مۆرفین (ئەگەر برەکەی زۆر بێت) لە ماوەی یەك دوو سەعاتدا کاری خۆی دەکات و مرۆڤ دەخات. سەیرە بنیامین دوای وەسیەتنامەکەی دەکەوێت و بێهۆش دەبێت. بێجگە لەمە کەڵك وەرگرتن لە مۆرفین کەی دەبێ بە هۆی خوێنرێژی مێشك. ئێستا دەگەین بە نامەی شۆارتێز. ئەو دەڵێت:" بنیامین لە نامەکەدا بە پۆرت-بۆ دەڵێت گوندێك لە کێوەکانی پیرنە ئەمە لە حالێکدایە ئەویٚ- تەنانەت لە ساڵی 1940یشدا- شارێکی کەناری بووە نەك گوندێکی بچووك. هەروەها زۆر سەیرە چۆنە بنیامینێ کە ئاڵمانییە بۆ هاوڕێ ئاڵمانییەکەی بە زمانی فەرانسە پەیام دەنێری؟! جگە لەمانەش ئەم نامە لە هەموو شت دەچێ لە نامەی خۆ کوژی نەبێت. شوارتز لای وابوو کە هەموو ئەم رەخنانە بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە هەموو شت دروست کراوە نەك بنیامین نووسیبێتی بەڵکو درووست کراوی هێنییە.

ئەی نامەکەی بنیامین (ئەگەر وەها نامەیەك بوونی بووبێ) چی پێهاتووەو ئەمە تەنها هێنی گۆرلەند دەیزانێ کە ئەویش 52 ساڵ پێشتر مردبوو..

ئێستا کە خەریکم بە نووسراوەکانم دەربارەی وتارەکەی ستیفن شۆارتزدا دەچمەوە نەوەك شتێ مابێتەوە کە نەوترابێت دەبینم ئەم بابەتە داکەوتووە: لیزا فیکتۆ دەڵێت چەن ساڵ دوای مەرگی بنیامین هێنیم دیت و لێم پرسی سەرئەنجام جانتاکە چی پێهات؟ هەر لە شوێنی پۆلیسی سەر سنوور مایەوە؟ وتی نە، لە پۆلیسم وەرگرتەوە. نە ئەو کاتەی کە سنوورم شکاند، جاری دووهەم کە تەنها رۆیشتم بۆ سپانیا. سواری شەمەندەفەر بووم بۆ ئەوەی لە بارشلۆنەوە بڕۆم بۆ مادرید، بە داخەوە جانتاکە لە شەمەندەفەرەکەدا جێما..

رەنگە باوەڕ نەکەن بەوەی ئێستا جانتاکەی بنیامین لە مووزەی پێلزپێر هاوسدایە لە شاری ئاستین تێگزاس، مۆزەیەك کە کەوتۆتەوە چواڕێیانی شەقامی 22ی رۆژئاوایی و شەقامی سێن گابریەل. سەیر ئەوەیە ئەم مۆزەیە کۆمەڵێ شتی ئەنتیکەو ناوازەی تێدایە ، لە کووپی قاوە خواردنی واڵت دیزنو دەرزی تایبەت بە دەرزی ماو تسی تۆنگ وە بگرە تا دەگاتە قنچکە جگەرەکانی کێرلین مۆنرۆو میخائیل باختین. هەروەها چەقۆکەی چارلز دیکێنزو جانتاکەی واڵتر بنیامین. لە ژێر رەسمی جانتاکەدا نوسراوە:" جانتای واڵتر بنیامین کە لە ساڵی 1940وە بۆ 1990 ون ببوو." جانتایەك کە جگە لەوەی رواڵەتەکەی وەك جانتای ئەو سەردەمە ناچێ بەڵکو هیچ شتێکیشی تێدا نییە. نە کتێبی تێدایە نە نامە، نە دەسنووس. هیچ شتێکی تێدا نییە. خاڵی خاڵی.

**سەرچاوە:**

http://www.sharghnewspaper.com/830517/idea.htm#s94932

# ئاسانگیری و فرەییخوازی

رامین جەهانبەگلوو
لە فارسییەوە: سامان کۆنەپۆشی

"ئاسانگیری – لێکبوردن" بەرامبەرێکی کوردییە کە ئەمڕۆکە بۆ دوو وشەی فەرەنسی *Tolerance* و ئینگلیزی *toleration* بە کاری دەبەین. ئەم دوو وشەیەش لە چەمکی لاتینی *tolerantia* وەرگیراون کە خۆی لە کرداری لاتینی *tolerare* وە، بە واتای تەحەموولکردن و لەگەڵ بوون (بودن)دا دێت.

لە راستیدا *tolerant* بە کەسێك دەگوترێ کە توانای قەبووڵکردن و دەرك و تێگەیشتنی باوەڕو هەڵسوکەوتی نەیارەکەی خۆی هەبێت.

پێم وایە، لێرەدا واتای دەرك و تێگەیشتن (بە ئینگلیزی *understanding* یان بە فەرەنسی *comprehension*) چەند قاتێك لە واتای قەبووڵکردن گرنگترە.

دەرك و تێگەیشتنی شتێك یان کەسێك، واتە دانانی ئەو وەك بابەتی هزر و بیرکردنەوە. واتە بە دەربڕینێك ناسینی مانایی ئەو. بە بۆچوونی من کاتێك لە چەمکی "ئاسانگیری" دەدوێین، دەبێ لەسەر وشەی ناسین یان دووبارە ناسی جەخت بکەینەوە.

هەموو بناغە و بنەمایەکی فەلسەفیی چەمکی "لێکبوردن"، دۆزی دووبارە ناسیی ئەوی دیکە"یە وەك واقعییەتێکی ئەنتۆلۆژی(هایدنناسی)

واتە لە ڕووی ئەنتۆلۆژییەوە بە فەرمی کردنی تاکتێکی دیکە، وەك ئەویتر.

هەروا کە دەبینن چەمکی "لێکبوردن" بەر لەوەی کە ئاماژە بێ بۆ هەر چەشنە بارودۆخێکی کولتووری یان کۆمەلأیەتی و سیاسی، خاوەن نێوەرۆکێکی فرەیخوازە. فرەییخوازی بەشێك لە مانای فەلسەفیی چەمکی "لێکبوردن" پێکدێنێ.

چوارچـێوەی ئـەم ئـەنتۆلۆژیا فرەیخـوازە لەمـەدا کـورت دەکرێتـەوە کـە بـە وتـەی هانـا ئارێنت، هەر تاکێك هوشیارە بەوەی کە لەسەر ئـەم ئەسـتێرە خاکییـەدا، مرۆڤـەکان نـەك مرۆڤ، دەژین.

بە دەربڕینێکـی دیکـە، ژیـان و بـوونی مـرۆڤ خـۆی لـە خۆیـدا شـتێکی بـە کۆمـەڵ و پلۆراڵـە. فرەییخــوازی نێــوەرۆکی بنچــینەیی ژیــانی مرۆڤ پێکدێنێ.

کەواتە پرۆسەی بە کۆمەڵایەتی بوونی مرۆڤ یەکسانە بە هوشیاربوون بە بوونی ئەویتر.

لە هەر شوێنێکدا کە "من"ێك لە گۆڕێدا بێ، "ئـەویتر"ێکـیش لـە گۆڕێدایـە. "ئـەویتر" ئـەو کەسـەیە کـە "بێجگـە لـە مـن"ە. ئێسـتا لـە هـەر شوێن و کاتێکدا کە بابەتی "بێجگە لە من" لـە گۆڕێدا بیّ، دۆزی جیاوازی لە گۆڕێدایە، چونکە "من" جیاوازە لە "بێجگە من".

ئـەم بناغـە و بنـەمای جیاوازییـە، بنـەمای ئــەنتۆلۆژی فرەییخــوازە کــە لــە کــاتی هەڵســـــوکەوت و ڕووبــــەڕوو بوونــــــەوەی بیروبۆچـــوون و ئامانجـــە جۆراوجۆرەکانـــدا دەردەکەوێ.

لەوێوە کە بیرو بۆچوون و ئامانجەکانی ژیان لێك جیاوازن، بۆیە هیچ کات ئامانجێك ناتوانێ لــە پلــەی حەقیقــەتی رەهــادا دیاریکـــەری بەختـەوەری مرۆڤایـەتی بێت. ئەگـەر بـەم جـۆرە بـێ، لـە لـۆژیکی فرەییخـوازی بـەهایی، دوور دەکەوینـەوە، و دۆزی "لێکبـوردن"یـش لـە نێـو دەچـێ و لـەبیر دەکـرێ. چونکە "لێکبـوردن" لـە چوارچـێوەی بـارودۆخێکی ئەنتۆلۆژیـدا کــە بـاوەڕی بـە مـۆنیزم و بـاوەڕی بـە یەکانـەکی و هاوئاهــەنگی ئامانجــە مرۆییــەکان هــەبێ، پێك نایەت.

ئـەوەی کـە ئامانجـە مرۆییـەکان جیـاوازن و هەرکام بە شێوەیەك بارودۆخی مرۆڤ لە جیهاندا وێنا دەکەن، شتێکە بە ڕای من، دەلالەت لە سەر ئـەو وتەیـەی کانـت دەکـا کـە نـاتوانین لـەداری خواروخێچــی مرۆڤایــەتی شــتێکی ڕێــك و سەڕاست دروست بکـەین، چـونکە تەنانـەت لـە جیهـانێکی ئایدیالـدا کـە لـە خـەڵکێکی تـەواو باش و ئاقڵ و ڕووناکبیر پێکهاتبێ، ناتوانین لە بــــواری چارەنووســــی مرۆڤایەتیــــدا، بــــە وەڵامگەلێکی ڕەهاو بێ ئەولاولا بگەین.

کەواتــەدەبێ قــەبووڵی بکــەین کــە مێــژوو شــوێنی فرەیــی بــەهاکان و ئامانجــەکان و ڕووبەڕووبوونەوەی ئەوانە لەگەڵ یەکتردا.

کـاتێ ئـەم ئامـانج و بەهاگەلـە ڕووبـەڕووی یــەکتر دەبنــەوە، لــە بــاری فەلســەفی و کۆمەڵایەتییەوە سێ بارودۆخ دروست دەبێ:

1- یـان ئـەوەی کـە ئامـانج یـان بەهایـەك، بەسەر ئامانج و بەهاکانی دیکەدا سەردەکەوێ و زاڵ دەبێ و لە نێویان دەبا، و لـە ڕەوشـێکی لـەم چەشـنەدا لـە بـارودۆخی ئـەنتۆلۆژی فرەیخـواز دێینــە دەرێ و دەچــینە نێــو ســنووری چەقبەسـتوویی و تـاك بێـژی و مۆنیزمـەوە، کـە لێرەدا بە ناچار ڕێگاچارەی توندوتیـژی دەبێتـە جێگرەوەی لێکبوردن.

2- دۆخــی دووەم، دۆخێکــە کــە تیایــدا ئامانجەکان و بەهاکان دەکەونە پاڵ یەکتر، بەڵام بـە ناچـار ڕووبـەڕووی یـەکتر نابنـەوە. لێـرەدا دەچینە نێو بارودخێکی "خەمساردی"یەوە، کە بناغە و بنەمای تاکگەریی خۆپەرستانەیە.

ئەگەر لە دۆخی یەکەمدا جیاوازییەك بوونی نیە، لەم دۆخی دووەمەدا جیاوازییەك دەبینین هاوکات لەگەڵ خەمساردیدا. لێرەشدا فرەیخوازی بە شێوەی چالاك و زیندوو لە گۆڕێدا نییە. جیاوازی خەمسارد.

3- دۆخی سێیەم، دۆخێکە کە تیایدا بەهاکان و ئامانجەکان لێك جیاوازن. بەڵام هاوکات بە نیسبەت یەکترەوە خەمسارد نین.

لێرەدا بارودۆخێکی دیالۆگیانە دروست دەبێ، کە وەدیهێنەری لێکبوردنە، چونکە لێکبوردن لە تەك وتووێژدا بیچم دەگرێ، نەك بە خەمساردی و یان چەقبەستن و تاك بێژی فەرماندەرانە.

لە راستیدا دەتوانین بڵێین کە لێکبوردن پارادێمیکە بەپێی میکانیزمەکانی، بەهاو ئامانجە جیاواز و جۆراوجۆرەکان پێکەوە دەچنە نێو باس و وتوێژ، و بەربەرەکانێیەکی تەندروست لە نێوان هزرەکان و هۆکارە جۆراوجۆرەکاندا دروست دەبێ.

دەتوانین دەرکەوتنی ئەم پێکەوە ژیانە لە بوونی لێکتێگەیشتنێکی ناکۆکیئامێزدا بەدی بکەین کە گەرەنتی فرەییخوازی لە کۆمەڵدا دەکات. ئەم لێکتێگەیشتنە ناکۆکیئامێزانە، پێویستی بە پەرژاندنی چەمکی لێکبوردن، وەك بنەمایەکی دینامیکی لە کۆمەڵگادا هەیە.

کەواتە لێکبوردن تەنیا بە بارودۆخێك دەگوترێ کە تیایدا ناکۆکی لە نێوان باوەڕەکان و هزرە جۆراوجۆرەکاندا بوونی هەبێ، بەڵام هاوکات لە نێوان هەموو تاکەکانی کۆمەڵدا رێککەوتنێك هەیە کە دەبێ لە نێو دڵی ئەم ناکۆکیەدا بارودۆخێکی وتووێژیانە بوونی هەبێت.

بەڵام ئەم جۆراوجۆرییە و فرەیی بیروباوەڕە، هاوکاتە لەگەڵ دوو بنەمای گرنگدا:

1-بە بێ چەمکی ئیرادەی ئازاد، وەرگرتنی بەرپرسیارێتی و لێکبوردنخوازی هیچ واتایەکی نیە. واتە ئەگەر ئەم گریمانە قەبوڵبکەین کە هەموو کردارەکانی مرۆڤەکان پێشتر دیاریکراون، ئەوکات لێکبوردن و لێکبوردنخوازی ناڕەواو وێناناکرێت.

2-ڕێزدانان بۆ ئۆتۆنۆمی تاکەکەسی، بە واتای باوەڕ بە توانای ئەقڵانی تاك لە خولقاندن و داهێنانی سامانی دیموکراتیك و فەیی خوازی کۆمەڵگادا.

ئەگەر کردەوەی لێکبوردن ئەنجامدەدرێ، لەبەرئەوەیە کە من و ئەویتر سەرنج دەدەینە باوەڕ و بۆچوونەکانی یەکتر. ئەگەر ئەم سەرنجدانە لە گۆڕێدا نەبێ، رێزیش بوونی نابێ و لەوێدا کە رێزی بەرامبەر بوونی نەبێ، لێکبوردن ناتوانێ وەك بنەمایەك بیچم بگرێت.

مەبەستی من لە سەرنجدان، پێکهێنانی هەستی بەرپرسیارێتی هاووڵاتییە، واتە سەرنجێك کە تاکێك وەك هاووڵاتی دەیداتە تاکێکی دیکە وەك هاووڵاتی. بەبێ ئەم هەستی بەرپرسیارێتییە، لێکبوردن خاوەن هیچ نێوەرۆکێك نییە، چونکە مەشقکردنی لێکبوردن هاوکاتە لە تەك مەشقکردنی بەرپرسیارێتیدا، و هەردوو ئەم کردار و مەشقکردنانەش، بناغە و بنەمای مەشقکردنی فرەییخوازی بەهایی و سیاسین.

ئەگەر بگەڕێنەوە بۆ بنەچەی واتای وشەی بەرپرسیارێتی لە زمانی ئینگلیزی یان فەرەنسیدا، دەبینین کە بەرپرس بوون (*responsible*)، یان (*responsible*)، بە واتای وەلامدەربوونە، (*etre capable de reponse*).

بەلام وەلامدەر بوون لە هەمبەر چ کەسێکدا؟

لە راستیدا، هەر تاکێك دەبێ لە هەمبەر دوو کەسدا وەلامدەر بێ. لە پەلی یەکەمدا، بەرامبەر ویژدانی خۆی و لە پەلی دووەمدا بەرامبەر بە ویژدانی ئەویتر، بۆچی؟ چونکە مرۆڤ هەم بەرپرسی ئەو شتەیە کە هەیە، واتە مرۆڤ بوون، هەم بەرپرسی ئەو شتەی کە دەیکا، واتە مێژوو. کەواتە هەمیشە بەرپرسی خۆی و بەرپرسی مرۆڤەکانی دیکەیە.

هەر بۆیە بەرپرسیارێتی شتێکی تاکگەریانەو خۆپەرستانە نیە، بەلکوو بارودۆخێکی مرۆڤ دۆستانەیە. بەرپرس بوون واتە گەرەنتیکار بوون. مرۆڤ بەرپرسی کەسێکە، کە گەرەنتیکاری ئازادی و ئۆتۆنۆمی کەسێکی دیکەیە. ئەم گەرەنتیە بەشێکە لە جەوهەری فرەییخوازی.

هۆکاری ئەم گەرەنتیکردنە، لە شکان هاتوویی فرەییخوازییە. ئەگەر شتێك لە شکان نەهاتووبێ، پێویستییەکی بە گەرەنتیکار نیە.

بە وتەی پۆل ریکۆر " بابەتی بەرپرسیارێتی ئەو شتەیە کە خۆی لە خۆیدا قابیلی لە نێوچوونە". چونکە قابیلی نەمان و لە نێوچوونە، ئێمە بەرپرسین کە رزگاری بکەین.

بەرپرس بوونی ئێمە لە هەمبەر ئەویتردا و هەروەها لە هەمبەر خودی لێکبوردندا، لەبەر شکان هاتوویی لێکبوردنە.

لێکبوردن دیاردەیەکی لەشکان هاتووە. کە لە رەوشێکدا کە بەشێوەیەکی دروست و ورد مەشق نەکرێ، لە نێو دەچێت. ئەم لەشکان هاتووییەی لێکبوردن پێمان دەلێ کە، لێکبوردن تەنیا هەلبژاردنێکی رووناکبیرانە نییە، بەلکو پێویستییەکە بۆ هەر چەشنە کردارو کردارێکی کۆمەلایەتی.

لێکبوردن یەکێك لە شێوەکان یان بە دەربڕینێکی باشتر، باشترین شێوەیە بۆ ژیانکردن لە هەقیقەتدا و بۆ هەقیقەت، چونکە لەوێدا کە لێکبوردن پێکهێنەری باس و وتووێژە، هیچ کات درۆ ناتوانێ بەسەر هەقیقەتدا سەرکەوێ و زال بێ.

لێرەدا دەکەومە بیری ئەم وتەیەی تامس جیفرسۆن کە دەیگوت: "هەقیقەت بەهێزەو هەموو کات دەتوانێ بەرەنگاری رکەبەرەکەی خۆی واتە درۆ بێتەوە، بە مەرجێك کە چەکە سروشتیەکانی، واتە باس و وتووێژی ئازادی لێ وەرنەگرینەوە".

رەنگە هەر لەبەر ئەمەش بێ کە جیفرسۆن لە یاداشتە رۆژانەکانی خۆیدا، لە سالی 1776، لەگەل ئەم تیۆریەی جۆن لۆکدا دژایەتی دەکا کە دەلێ: "دەبێ لە تەك دوژمنانی لێکبوردندا، هەلبکەین."، و دەلێ: "جۆن لۆك رێگایەکی دوور و درێژی بڕی، بەلام لە شوێنێکدا راوەستا، بەلام ئێمە درێژە بەو رێگایە دەدەین".

رامان لەم وتەیەی جیفرسۆن دەتوانێ شێوەیەك بێ بۆ ئەوەی کە تێبگەین کە لێکبوردن دیاردەیەکە هەموو کات لە هەمبەر لێکبوردن وەرنەگریدا دروست دەبێ.

چــونكه ئــەو شــتەی كــە پێویســتی بــە مەشـقكردنی لێكبوردنـە، ئـەو شـتەیە كـە ئێمـە قبـوڵی ناكـەین و تەنانـەت تەحـەمولی ناكـەین. چونكە ئەو شتەی تەحەمولی دەكەین، كە دژی باوەڕی ئێمە نییەو لێكبوردن هەڵگرە. بەڵام ئەو شـتەی كـە قبـوڵی ناكـەین و دژایـەتیمان هەیـە لەگەڵیـدا، شـتێكە كـە دەبـێ بكەوێتـە بـەر لێكبوردن خوازییەوە.

لێكبـوردن دژایـەتی و جیـاوازی هزرەكـان شـیاو دەكـات، لـە كاتێكـدا كـە بنـەمای دژایـەتیكردن و جیـاوازی هزرەكـان، لێكبـوردن وەك دیاردەیـەكی پێویسـت نیشـان دەدەن. لـەم سۆنگەیەوە، داكۆكیكردن لـە هـزری لێكبـوردن، بـە واتـای دوژمنایـەتی لەگـەڵ دەمـارگرژان و دژبـەرانی لێكبوردنـدا نییـە، بـەڵكوو خـەباتێكی فیكـری و فەلسـەفییە دژی تـاك بێـژی و چەقبەسـتوویی، كـە خـۆی بـە تـەنیا پەنجەرەیـەك دەزانـێ كـە دەتـوانین لـەوێوە جەوهەری ژیان ببینین.

لـە كاتێكـدا كـە بەوتـەی ئیزایـا بێـرلین، فرەییخـوازی فێرمـان دەكـا كـە "دەتـوانین لـە پەنجەرەگـەلێكی جۆراوجـۆرەوە چـاو لـە ژیـان بكـەین، كـە هیچیان بـە پێویسـت روونـتر یـان تـاریكتر و بـە لاڕێـدا بـەرتر، لـەویتر نیـە. "قبـوڵكردنی ئـەم وتەیـەی بێـرلین، بـە واتـای بنەمایـەكی رووبەڕووبوونـەوەی رۆژانەیـە، كـە رەوشی یەك بە یەكی ئێمە دەگرێتەوە.

**سەرچاوە:**

كتێبی "موج چهارم"

## نەجیبترین کتێبی وەرز

# گفتوگۆی راس لەگەڵ میلان کۆندێرا

لە ئینگلیزییەوە: محەمەد ئسلامی
لە فارسیەوە: سەروەر عومەر

ئەم هەڤپەیڤینە بەرهەمی دوو دیدارە کە لە دوای خوێندنەوەی وەرگێڕانی "کتێبی پێکەنین و لەبیرچوونەوە"(1) لەگەڵ میلان کۆندێرا ئەنجاممدا. دیداری یەکەم کاتێك بوو ئەو بۆ یەکەمین جار بۆ لەندەن هاتبوو و دیداری دووەم وەختێك ئەو بۆ یەکەمین جار بۆ ئەمریکا هاتبوو. دەستپێکی ئەم گەشتانە لە فەرەنساوە بوو، ولاتێك کە ئەوو هاوسەرەکەی لە ساڵی 1975ەوە وەك کۆچبەر تیایدا ژیاون. کۆندێرا هەنووکە لە پاریس وانە ئەڵێتەوە. لە کاتی گفتوگۆکەدا بەشێوەیەکی پەراگەندە زمانی فەرەنسی بەکارئەهێنا، بەلأم زیاتر بە زمانی چیکی ئەدواو هاوسەرەکەی ڤێرا(2) رۆڵی وەرگێڕی ئەبینی. دەقی کۆتایی هەڤپەیڤینەکە کە بە زمانی چیکی بوو لەلایەن پیتەر کاسیەوە(3) بۆ ئینگلیزی وەرگێڕدراوە.

**راس: ئایا پێتوایە لەنێوچوونی دونیا نزیکە؟**

کۆندێرا: پەیوەندی بەوەوە هەیە کە مەبەستی تۆ لە نزیك چیبێت؟

**راس: سبەی یا دوو سبەی.**

کۆندێرا: ئەم هەستە کە دونیا بەرەو لەناوچوون ئەڕوات هەستێکی زۆر کۆنە.

**راس: کەواتە پێویست ناکات نیگەرانی هیچ شتێك بین.**

کۆندێرا: بە پێچەوانەوە، ئەگەر ترسێك سالأنێك لە زەینی مرۆڤایەتیدا بوونی هەبووە دەبێت ترسێکی راستەقینە بێت.

**راس: بە هەر حاڵ بەرای من تێکرای چیرۆکەکانی دواهەمین کتێبتان لەسەر بنەمای ئەم نیگەرانییە دارشتووە، تەنانەت چیرۆکە کۆمیدیەکانیش.**

کۆندێرا: ئەگەر کاتێك منداڵ بووم کەسێك بە منی بوتایە رۆژێك خەڵکی ولأتەکەی ئێوە

لەسەر زەوی نامێنن من ئەم قسەیەم بە بێ مانا وەرئـەگرت. ئەسـڵەن وێنـاکردنی شـتێکی لـەم جـۆرە بـۆ مـن ئەسـتەمە. مـرۆڤ ئـەزانێت کـە بوونـەوەرێکی روو لـە نێـو چـوونە بـەڵام وا بـیر ئەکاتـەوە کـە خـەڵکی وڵاتەکەی جۆرە ژیانێکی هەتاهـــــەتاییان هەیـــــــە. بـــــەڵام دوای هێرشـــی 1968ی روســـیا هـــەر تـــاکێکی چـیکی ئـەو نیگەرانییـەی هـەبوو کـە ئـەکرێت رۆژێـــك خـــەڵکی چـــیك بـــە تـــەواوەتی لـــە ئەوروپادا بسڕدرێنەوە، هەر بەو شێوەیەی کە بـــە درێـــژایی پێـــنج دەیـــەی رابـــردوو چـــل ملیـۆن ئـۆکرانی لەسـەر زەوی لـە نێـوبران بـێ ئەوەی دونیا بچووکترین گرنگیان پێبدات، یا لیتوانییـــەکان تـــۆ ئـــەزانی لـــە ســـەدەی هەڤدەدا لیتوانیا یەکێك لە بەهێزترین وڵاتەکانی ئـەوروپا بـووە؟ هەنووکـە روسـەکان خـەڵکی لیتوانییـان وەك پاشـەکەوت هـەڵگرتووە و بـە وێنـــەی هـــۆزێکی نیوەناچـــڵ لـــە گەڵیانـــدا هەڵســـوکەوت ئەکـــەن. ئـــەوان لەســـەردانی گەشـــتیارەکان بێبـــەش کـــراون، بـــۆ ئـــەوەی بێگانـەکان لـە بـاری ژیـان و گـوزەرانی ئـەوان ئاگـادار نـەبن. مـن نـازانم ئاینـدە چ شـتێك بـۆ خـەڵکی وڵاتەکـەی مـن بـە دیـاری ئـەهێنێت. بـە دڵنیاییـەوە روسـەکان هـەر کارێـك لـە دەسـتیان بێت ئەیکەن تا چیك لە روسیا و شارستانییەتی روسـدا بتوێننـەوە. کـەس نازانێـت سـەرکەوتوو ئەبن یان نا. بەڵام ئەگەری هەیە و تێگەیشتنی بەر لـەوەختی ئـەوەی کـە وەها ئەگـەرێك بـوونی هەیـە، ئـەتوانێت هەسـتی کەسـێك سـەبارەت بـە ژیـان بگـۆڕێـت. ئـەم رۆژانـە مـن ئـەوروپا لـەرزۆك ئەبینم. لەرزۆك و روو لە نەمان.

**راس: ئایـا چارەنووســی ئـەوروپای رۆژهــەڵات و ئەوروپای رۆژئاوا دوو پرسی تەواو جودایە؟**

کۆنـــدێرا: ئـــەوروپای رۆژهـــەڵات وەك چەمکێکی مێژوویی – کلتوری واتە روسیا، بە مێژووییـەکی تارادەیـەك روون کـە لـە دونیـای بیزانسـدا هـەڵگیراوە. بوهمیا، پۆڵەنداو مەجەر رێـك وەك نەمسا هیچکات بەشێك نـەبوون لـە ئەوروپای رۆژهەڵات، سەرەتا لە شارستانییەتی رۆژئاوادا بوون. لەگەڵ گوتیکەکان، رێنیسانس و ریفۆرمـــەکانی شارســـتانییەتی رۆژئـــاوادا هـاوڕێ بـوون. گـەورەترین رەوتـە کەلتورییـە مۆدێرنـەکان لـە ئـەوروپای ناوەندییـەوە دەستی پێکـرد: دەروونشـیکاری، ئیگزیستێنسـیالیزم، مـــۆزیکی دوازدە رەنگـــی و شـــێوەی تـــازەی رۆمانەکانی کافکا و موسیل. بە پاشکۆ کردنی ئەوروپای ناوەنـدی بـۆ شارستانییەتی روسـیە، دوای جـەنگ بوویـە هـۆی ئـەوەی کـەلتوری رۆژئـاوایی نێوەنـدی سـەرەکی قورسـایی خـۆی لەدەسـت بـدات. ئەمـە گـرنگترین کارەسـاتە لـە مێژووی رۆژئاوا لە سەدەی ئامادەدا و ناتوانین ئـەم راسـتیە،کە کۆتـایی ئـەوروپای نێوەنـدی نیشـانەیەك بـوو بـۆ کۆتـایی تێکـڕای ئـەوروپا، لەبەرچاونەگرین.

**راس: لـە بـەهاری پـراگ رۆمـانی "گاڵتـە"[(4)] و چیرۆکەکانی "عیشقە پێکەنیناوییەکان"[(5)] بـە تـیراژی 150.000 دانە چاپ کران. دوای هێرشی رووسیا تۆ لە پلەی مامۆستایەتی لابرایت و تێکڕای کتێبەکانت لـە کتێبخانەکانـدا کۆکرانـەوە. سـاڵی داهـاتوو تـۆ و هاوسەرەکەت چەند کتێب و جل و بـەرگتان خستە ســندووقی دواوەی ئۆتومبیلـــەوەو بـــەرەو فەرەنســا بەرێکەوتن، ئەو جێگایەی کە تیایدا بوویتە یەکێك لە پڕ**

**خوێنەرترین نووسەری بێگانە. وەك كۆچبەرێك چ هەستێكت هەیە؟**

كۆندێرا: ژیان لە ولاّتە جیاوازەكاندا بۆ نووسەرێك تایبەتمەندییەكی گەورەیە. تۆ تەنها كاتێك ئەتوانیت لە دونیا تێبگەی كە لە گۆشەی جیاوازەوە تەماشای بكەیت. دواین كتێبی من كە لە فەرەنسا نووسرا لە فەزایەكی جوگرافیایی تایبەتدا دەگێڕدرێتەوە؟ ئەو رووداوانەی لە پراگدا روو ئەدەن لە چاوی كەسێكی خەڵكی ئەورووپای رۆژئاواوە بینراون، لە كاتێكدا ئەوەی لە فەرەنسا روو ئەدات لە چاوی پراگییەكەوە بینراوە. لە لایەكەوە ولاّتی زادگای من لە قۆناغێكی 50 ساڵیدا شتگەلێكی زۆری ئەزموون كردووە، دیموكراسی، فاشیزم، شۆڕش، ترسی ستالینی، داگیركاری ئەڵمانییەكان و رووسەكان، وەدەرنانی بە كۆمەڵ و مەرگی رۆژئاوا لەسەر زەوینی خۆیدا. بەمپێیە چیك لە ژێر پەستانی قورسایی مێژوودا لە پلیشانەوەدایە و بە گومانێكی گەورەوە لە دونیا ئەڕوانێت. لەلایەكی دیكەوە فەرەنسا چەندین سەدە نێوەندی جیهان بووەو ئەمڕۆكە بەدەست كەمی رووداوە مێژووییە گەورەكانەوە ئەناڵێنێت. لەبەرئەوەیە كە لە بارە ئایدۆلۆژییە زێدەڕۆییەكاندا خۆشحاڵی دەرئەبڕێت. ئەمە چاوەڕوانییەكی ئیحساسی و دەروون پەرێشانییە بۆ كارێكی گەورە كە نە لە هەنووكە و نە لە داهاتوودا روونادات.

**راس: ئایا ئێوە لە فەرەنسا وەك نامۆیەك ئەژین یا لە رووی كەلتورییەوە خۆتان گونجاندووە؟**

كۆندێرا: من زۆر حەزم لە كەلتووری فەرەنسییەو قەرزداریم، بە تایبەتی ئەدەبیاتە دێرینەكەی. رۆبێلیا[6] خۆشەویسترین نووسەرە لای من لەگەڵ دیدەرۆ. من عاشقی "*Fataliste Jackquasle*"م، و ئەوەندەش لارنس ستێرنم[7] خۆش ئەوێ. ئەوانە گەورەترین نووسەری ئەو جۆرە لە رۆمانن بە درێژایی سەردەمەكان. نووسینەكانیان سەرگەرمكارەو لێوانلێوە لە بەختەوەری و چێژێك كە هەنووكە لە ئەدەبیاتی فەرەنسادا نەخشی بەستووە و بەبێ ئەو، هەموو شتێك لە هونەردا ناسنامەی خۆی لە دەست ئەدات. ستێرن و دیدەرۆ رۆمان وەك كایەیەكی گەورە باش ئەناسن. ئەوان تەنزی رۆمانئاسایان دۆزیوەتەوە. من هەندێك جار تیۆرەگەلێك دەبیستم لەسەر ئەو بنەمایەی كە تواناییەكانی رۆمان ئیدی تەواو بووە، بەلاّم هەستی من تەواو پێچەوانەیە. لە رەهەندە مێژووەكەیدا رۆمان زۆرێك لە تواناییەكانی لەدەستداوە. بۆ نموونە ئەو هۆكارانەی بۆ پێشكەوتنی رۆمان لە ستێرن و دیدرۆدا شاراوەتەوە لەلایەن هیچ جێنشینێكەوە سوودی لێوەرنەگیراوە.

**راس: دواین كتێبی تۆ بە رۆمان ناونەبراوەو تۆ لە دەقەكەدا باست لەوە كردووە ئەم كتێبە رۆمانێكە بەلاّم لە فۆرمێكی جیاوازدا. دواجار ئەم كتێبە رۆمانە یان نا؟**

كۆندێرا: تا ئەو جێگایەی من وەك خۆم هەستی پێئەكەم ئەم كتێبە رۆمانێكە، بەلاّم من نامەوێت ئەم رایە بەسەر كەسدا بسەپێنم. ئازادییەكی زۆر لە پێكهاتەی رۆمانئاسادا شاراوەتەوە. ئێمە نابێت پێكهاتەیەكی كلێشەیی وەك گەوهەرێكی نەگۆڕی رۆمان بزانین.

**راس: بەڵام بەهەرحاڵ شتێك هەیە کە ڕۆمانێك دەکاتە ڕۆمان و ئەوەش هۆکارێکە کە ئەو ئازادییە سنووردار ئەکات.**

کۆندێرا: ڕۆمان دەقێکی دروستکراوی هەمئاهەنگە کە بەرەمەبنای وازی بە کەسێتییە دروستکراوەکان دەنووسرێت. ئەمانە تەنها هۆکاری سنووردارکردنن، لە زەینی مندا، مەبەست لە ووشەی دروستکردنی حەزی ڕۆماننووسە بۆ سەر قاڵ بوون بە بابەتەوە لە گۆشەی جیاواز و ڕەسا(کامل) بوونی ئەو بابەتەیە. توانای دروستکراو بوونی ڕۆمان ئەتوانێت وتاری تەنز، گێڕانەوەی ڕۆمانئاسا، پارچە ئۆتۆبیۆگرافییەکان، ڕاستەقینە مێژووییەکان، فڕینی خەیاڵ و بە کورتی هەموو شتێك وەك گشتێك پێکەوە هاوئاهەنگ بکات و وەك مۆزیکێکی پۆلی فۆنیك بێنێتە دەنگ، یەکجۆر بوونی چیرۆکێك پێویست ناکا لە فۆرمی چیرۆکەوە بێتە دەرەوە بەڵکو ئەکرێت لە ناوەرۆکی چیرۆکەکەوە بەرهەم بێت. لە دواین کتێبی مندا ناوەرۆکی لەم جۆرە بوونی هەیە: پێکەنین و لەبیرچوونەوە.

**راس: هەمیشە پێکەنین لە تۆ نزیك بووە. کتێبەکانی تۆ لە ڕێگەی گاڵتەو تەشەرەوە ئەبێتە هۆی پێکەنین. کەسێتییەکانی تۆ کاتێك ئەگەنە نارەحەتی کە لە بەرامبەر دونیایەکدا ڕابوەستن کە هەستی تەنز و هێنانەپێکەنینی لەدەست دابێت.**

کۆندێرا: من لە قۆناغی ترسی ستالینیدا بەهای خەندەم بۆ دەرکەوت. من ئەو کاتە بیست ساڵە بووم. ئەمتوانی کەسێك بناسم کە لایەنگری ستالین نەبوو. پێویست نەبوو لەو بترسم، چونکە لە ڕێگەی زەردەخەنەکەیەوە ئەمتوانی بیناسم. قسە خۆشی نیشانەیەك بوو بۆ ناسینی کەسەکان. لەو کاتەوە من لە دونیایەك ئەترسم کە هەستی خەندە تیایدا لەناوچووبێت.

**راس: بەڵام لە دواین کتێبی تۆدا بابەتێکی دیکەش لەئارادایە لە چیرۆکێکی کورتدا خەندەی فریشتەکانت لەگەڵ خەندەی شەیتاندا بەراورد کردووە. شەیتان پێئەکەنێت لەبەرئەوەی بەڕای ئەو دونیای خودا بێمانایە، فریشتەکان پێئەکەنن چونکە هەموو شتێك لە دونیای خودادا ماناو چەمکێکی هەیە.**

کۆندێرا: بەڵێ، مرۆڤ بۆ پیشاندانی دوو ڕەفتاری میتافیزیکی جیاواز لە ڕواڵەتێکی فزیۆلۆژیکی هاوشێوە سوود وەرئەگرێت. کڵاوی کەسێك ئەکەوێتە سەر تابوتی نێو گۆڕێکی تازە هەڵکەندراو، پرسەی ماتەمینی مانای خۆی لەدەست ئەدات و پێکەنین دێتە ئاراوە. دوو عاشق و مەعشوق دەست لە دەستی یەکدا ڕائەکەن و پێئەکەنن، خەندەی ئەوان بەهۆی نوکتەو گاڵتەوە نییە، خەندەیەکی ڕاستەقینەیە کە فریشتەکانیش چێژی خۆیان هەر بەهۆی ئەم خەندەیەوە دەرئەبڕن، هەردوو خەندەکە بە چێژەکانی ژیانەوە پەیوەستن. بەڵام پرسێکی دووانەیی ئاشکرا ئەکەن: خەندەی سەرنجڕاکێشی هەوادارانی فریشتەکان کە ئەوەندە لە گرنگی دونیاییان دڵنیان کە ئامادەن هەر کەسێك کە لە چێژەکەیدا لەگەڵیاندا هاوبەش نەبێت بدەن لە دار و خەندەکەی دیکە کە لە لایەنی بەرامبەردا ڕاوەستاوە بانگەشەی ئەوە دەکات کە هەموو شتێك بێمانا بووە تەنانەت پرسەکان پێکەنیناوین و بێدەنگی بە کۆمەڵ تەنها پانتۆمیمێکی خەندەدارە. ژیانی

مــرۆڤ بــەهۆی دوو درزەوە ســنووردار بــووە: دەمــارگیری لەلایەکــەوەو گومــانخوازی تــەواو لەلایەکی دیکەوە.

**راس: ئــەوەی ئێــستا تــۆ نــاوی ئــەنێیت خەنــدەی فریشــتەکان زاراوەیــەکی تازەیــە بــۆ "هەڵســوکەوتی شاعیرانە لە ژیاندا" کە لــە رۆمانــەکانی پێشــووترتاندا بەکارئەهێنن. تۆ لــە یــەکێك لــە کتێبــەکانتا ناوچــەی ترسی ستالینیت بە پادشایەتی پیاوی لەداردراو و شاعیر وەسف کرد.**

کۆنــدێرا: دکتاتۆریـــەت نـــەوەك تـــەنیا دۆزەخ نییــە بــەڵکو خــەونی بەهەشــتە لــە خـــەونی دێـــرینی جیهانـــدا، جێیـــەك کـــە مرۆڤـەکان پێکـەوە بەیـەك ئـیرادە و بیروبـاوەڕی هاوبـــەش و بـــەبێ هـــیچ شـــاردنەوەیەك لـــە یـەکتر ئـەژین. ئاندریـە بریتـۆنیش[8] وەختێـك باسـی مـاڵی شووشـەیی ئـەکرد و حـەزی ئـەکرد لەوێــدا بــژی هــەر خــەونی بــەم بەهەشــتەوە ئـــەبینی، ئەگـــەر دکتاتۆریـــەت ســـوودی لەو نموونانـە وەرنەگرتایـە کـە لـە ناخی ئێمـەدا هەیـە و رەگێکـی قـووڵی لـە ئایینـەکانـدا هەیـە هیچکات نەیدەتوانی ئەوەندەی خەڵك بەرەو لای خــۆی راکێشــێت، بــە تایبــەتی لــە ســاڵەکانی ســـەرەتای ئامادەبوونیـــدا. کاتێـــك خـــەونی بەهەشت دەست بـە هاتنـە دی ئـەکات، خـەڵکی لەگەڵ کەسێکدا کە ئەبێتە رێگری هاتنـەدی ئـەم خەونــە رووبــەڕوو ئەبنــەوە و یاســادانەرانی بەهەشــت ئــەبێت لــە گۆشــەیەکی بەهەشــتدا زینـدانێك دروسـتبکەن. بـە درێـژایی کـات ئـەم زیندانە گەورەتر و تەواوتر ئەبێت و لە کاتێکدا ئـەو بەهەشـتەی بـەوەوە پەیوەسـتە بچـووکتر و زەبونتر ئەبێت.

**راس: لــە کتێبەکــەی تــۆدا ئیلــوار[9]، شــاعیری گەورەی فەرەنسی، لە کاتی شیعر وتنـدا لـە بـەرزایی بەهەشت و زیندانی سیاسی لە سیبریاوە ئـەفرێت. ئایـا ئەم بەشە لە مێژوو کە لە کتێبەکەی خۆتـا هێناوتەتـەوە بەڵگەنامەیە؟**

کۆندێرا: پاول ئێدوارد دوای جەنگ وازی لـە سوریالیزم هێناو بوو بە گەورەترین دیمەنی ئەو شتەی من بـە "شیعری تاکڕەوی" نـاوی ئەبـەم. ئەو بۆ برایـەتی، ئاشـتی، دادپـەروەری، دوارۆژی باشـــتر، پێکـــەوەبوون و دژی دڵتـــەنگی بـــۆ بێگونـــاهی و دژی رەش بـــینی شـــیعری وت، وەختێـــك لـــە ســـاڵی 1950دا یاســـادانەرانی بەهەشـــت هـــاوڕێی پراگـــی ئـــەلوار، زالـــۆیس کالاندرا[10] یـان – کـە سوریالیستیش بوو – بـە لـــە ســـێدارەدان ســـزادا، ئـــەلوار هەســـتە هاوڕێیەتییەکانی خۆی سەرکوت کرد و تەنها لە پێناوی ئامانجە تاکەکەسییەکاندا، بەشێوەیەکی گشــتی پشــتیوانی لــە ســێدارەدانی هــاوڕێ کالانــدرای کــرد. پیــاوی لــە داردراو مــرد لــە کاتێکدا شاعیر شیعر ئەڵێت.

نــەوەك بــە تــەنها شــاعیر، قۆنــاغی ترســی ستالینی قۆناغی ورێنەی گشتی بوو. هەنووکە ئەمـە بـە تـەواوەتی لـە یـاد چۆتەوە بـەڵام ئەمـە بنـەڕەتی بابەتەکەیە. خـەڵکی حـەز ئەکەن بڵێن: شــۆڕش جوانــە، تــەنها ترســێك کــە لــەوەوە سەرچاوە ئـەگرێ شـەیتانییە، بەڵام ئەمـە راست نییـە. نەهامــەتی و مەینــەتی لــە جوانیدایــە. دۆزەخ لـە پێشـەوە لـە خـەونی بەهەشـتدایە و ئەگـەر ئەمانـەوێت لـەوەها دۆزەخێك تێبگـەین. ئـەبێت ئـەو بەهەشـتەی لێیـەوە سەرچـاوەی گرتووە تاقی بکەینەوە.

**راس: یەکێك لە تایبەتمەندییەکانی پەخشانی ئێوە بەردەوام بابەتە تاکەکەسی و گشتییەکانە، بەلاّم لەولایەنەوە نا کە چیرۆکە تاکەکەسییەکان لە بەرامبەر دەستەیەکی سیاسیدا روو ئەدەن یاخود ئەوەی کە رووداوە سیاسییەکان سنوورەکانی ژیانی تایبەتی پێشێل ئەکەن، بەڵکو ئێوە بەشێوەیەکی بەردەوام ئەوە پیشان ئەدەن کە رووداوە سیاسییەکان بەهۆی هەمان ئەو یاسایانەوە بەرێوە ئەچن کە رووداوە تاکەکەسییەکانی پێبەرێوە ئەچێت. بەم پێیە پەخشانی ئێوە جۆرێك دەروونشیکاری سیاسەتمەدارانەیە.**

کۆندێرا: میتافیزیکی مرۆڤ لە ناوچەی تاکەکەسی و گشتیدا بەیەك شێوەیە. سەرنجی ناوەرۆکی کتێبەکەی دیکە واتە لەبیرچوونەوە بدە. گەورەترین کێشەی تاکەکەسی مرۆڤ مەرگە، لەبەرئەوەی لەودا خۆی لە دەست ئەدات. بەلاّم ئەو خودە چییە؟ ئەمە دەرئەنجامی هەر ئەو شتەیە کە ئێمە بەیادی ئەهێنینەوە. بەم پێیە ئەوەی ئێمە لە مەرگ ئەترسێنێت لەدەستدانی رابردوو نییە. لەبیرچوونەوە جۆرێك مەرگە کە لە ژیاندا هەیە. کێشەی پاڵەوانە ژنەکانی من هەرئەوەیە. ئەو بە توندی هەوڵ ئەدات یادەوەرییەکانی هاوسەرە دڵخوازەکەی کە لە باری لەنێوچووندایە بپارێزێت. بەلاّم لەبیرچوونەوە کێشەی گەورەی سیاسەتمەدارەکانیشە. کاتێك هێزێکی گەورەتر ئەیەوێت وڵاتێکی بچوکتر داگیر بکات سوود لە میتۆدی لەبیرچونەوەی رێکخراو وەرئەگرێت. ئەم میتۆدە هەنووکە لە بوهمیا لەباری پەیرەو کردندایە. دوازدە ساڵە هیچ کتێبێك لە ئەدەبیاتی هاوچەرخی چیك بلاّونەکراوەتەوە. نووسینەکانی دووسەد نووسەری چیکی یاساغ کراون، لەوانە نووسینەکانی کافکا. دووسەدو چل و پێنج مێژووزان لە پۆستەکانیان دەرکراون. مێژوو دووبارە نووسراوەتەوە. مۆنۆمێنتەکانیان نابود کردووە. نەتەوەیەك کە ئاگایی دەربارەی رابردووی لەدەست بدات بەهێواشی خۆشی لەدەست ئەدات. بەم پێیە هەلومەرجی سیاسی پرسی میتافیزیکی لە بیر چوونەوە کە ئێمە لەگەڵیدا رووبەرووین تەواو رۆشن کردۆتەوە. هەموو رۆژێك بێئەوەی پێبزانین سیاسەتمەداران میتافیزیکی ژیانی تایبەتی رۆشن ئەکەنەوەو ژیانی تاکەکەسیش میتافیزیکی سیاسەت رۆشن ئەکاتەوە.

**راس: لە بەشی شەشەمی کتێبە جیاوازەکەتدا، ژنە پاڵەوانی چیرۆکەکە ئەگاتە دوورگەیەك کە لەوێدا تەنها منداڵ هەیە. لە کۆتاییدا منداڵەکان تا سنوری مەرگ ئازاری ئەدەن. ئایا ئەمە خەونێکە؟ شوبهاندنێکە یا چیرۆکێك؟**

کۆندێرا: هیچ شتێك بۆ من بە ئەندازەی شوبهاندن نامۆ نییە. چیرۆك نووسەر ئەینووسێت تا تێزێك بگەیەنێت. رووداوەکانی چیرۆك چ راستەقینە چ خەیاڵی ئەبێت لە خودی خۆیاندا دیار بن و خوێنەر ئەبێت بەهۆی هێزی ئەوەوە بە ئاسانی فریو بدرێت. من هەمیشە ئەم وێنەیە دێت بە زەینمدا و لە قۆناغێك لە قۆناغەکانی ژیانمدا، بەردەوام لە خەونەکانمدا دووبارە ئەبوویەوە: کەسێك خۆی لە دونیای منداڵاندا ئەبینێتەوە ناتوانێت لێی هەڵبێت و لە ناکاو دونیای منداڵی کە هەمیشە ئەیپەرستین و بۆی دڵتەنگ ئەبین ئەبێتە دڵەڕاوکێیەکی تەواو عەیار، وەك تەڵەیەك. ئەم چیرۆکە شوبهاندنێك نییە، بەلاّم کتێبەکەی من پۆلی فۆنێکە کە

چیرۆکە جیاوازەکان بەشێوەیەکی تەواو یەکدی روون ئەکەنەوە. بابەتی سەرەکی لە چیرۆکدا تاکڕەوییە، کە خەڵکی لە یادەوەرییان جیا ئەکاتەوەو ئەیانکاتە تاقمێك منداڵ. هەموو دکتاتۆرەکان ئەم کارە ئەکەن. رەنگە چاخی تەکنەلۆژی ئێمە ئەم کارە لەگەڵ بەشێك لە ئایندەی بکات و بە بێباکییەکەی سەبارەت بە رابردوو و نەبوونی راستگۆیی لە ئەندێشەدا. کۆمەڵگای گەنج و بێ بەزەییدا کەسێکی بە تەمەن گەورە بە یادەوەری و بە زمانی چژزودارییەوە، وەك پاڵەوانی ژنی چیرۆکەکە وا هەست ئەکات لە دوورگەی منداڵەکاندایە.

**راس: لە تەواوی چیرۆکەکانتا، لە راستیدا لە تەواوی بەشە تاکەکانی دوایین کتێبی ئێوەدا، کرانەوەی گرێی چیرۆك لە دیمەنی ئاوێزان بوونە سێکسییەکاندا روونەدات، تەنانەت ئەو بەشەش کە ناوی پاکیزەی "دایك"ی هەیە، شتێك نییە بێجگە لە دیمەنێکی سێکسی سێ لایەنەی دوور و درێژ لەگەڵ پێشوتار و پاش وتارێك. پەیوەندی سێکسی لای تۆ وەك رۆمان نووسێك چ مانایەکی هەیە؟**

کۆندێرا: ئەم رۆژانە بابەتە سێکسییەکان ئیدی یاساغ نین، وەسفی پەتی و دانپیانانی سێکسی پەتی بێزارکەر بووە. ئەوەی لارنسی دێرین چۆن دێتە بەرچاو یا تەنانەت هێنری میلەر[11] بە شیعرە رووتەکانییەوە! هەندێك لە دەقە ئیرۆتیکەکانی جۆرج باتێل[12] کاریگەرییەکی قووڵیان لەسەر من دانا، رەنگە لەبەر ئەوە بێت کە ئەوانە سۆزداری نین بەڵکو فەلسەفین. قسەی ئێوە راستە، بۆ من هەموو شتێك لە دیمەنە گەورە شەهوانییەکاندا کۆتایی دێت. من هەست ئەکەم کە دیمەنێکی عیشقبازی رووناکییەکی بەهێز بەرهەم ئەهێنێت، کە لە ناکاو ناسنامەی کەسەکان رۆشن، جێکەوتی ژیانیان کورت و پاشان ئەنجام گیری ئەکات. هۆگۆ لەگەڵ تامینا عیشقبازی ئەکات، لە بارێکدا کە تامینا هەوڵ ئەدات بیر لەو گەشتانە بکاتەوە کە لەگەڵ هاوسەرە مردووەکەیدا هەیبووە، ئەم دیمەنە شەهوانییە نێوەندی چیرۆکە کە تیایدا تەواوی ناوەرۆکەکانی چیرۆکەکە پێك دەگەن و قووڵترین رازەکانی چیرۆکەکە لەوێدا شاراوەتەوە.

**راس: بەشی حەوتەم، بەشی کۆتایی کتێبەکە، لە راستیدا دەربارەی هیچ شتێك قسە ناکات جگە لە بابەتە سێکسییەکان. بۆچی ئەم بەشە لەجیاتی بەشێکی دیکە کۆتایی بە کتێبەکە ئەهێنێت، بۆ نموونە بەشی شەشەم کە زۆر دراماتیکترە و لەوێدا پاڵەوانە ژنەکە ئەمرێت.**

کۆندێرا: تامینا ئەمرێت. ئەگەر لە چاوی خوازە "ئیستعاری"یەوە تەماشای بکەین ئەو لە نێوان خەندەی فریشتەکاندا ئەمرێت. لەلایەکی دیکەوە لە بەشی کۆتاییدا خەندەی جۆری بەرامبەر ئامادەیە، ئەو جۆرە خەندەیەی وەختێك هەموو شتەکان مانای خۆیان لە دەست ئەدەن ئەبیسترێت.

هێڵێکی گریمانەیی دیاریکراو بوونی هەیە کە لە دوای ئەوەوە هەموو شتێك بێ مانا و پێکەنیناوی دێتە بەرچاو. کەسەکە لە خۆی ئەپرسێت: ئایا بێ مانا نییە کە بەیانی لە خەو هەستم؟ بڕۆم بۆ سەر کار؟ بۆ بەدەستهێنانی شتێك هەوڵ بدەم؟ پەیوەست بم بە گەلێکەوە تەنها لەبەرئەوەی لەوێدا هاتوومەتە دونیاوە؟ مرۆڤ لە نزیکی ئەم سنوورەدا ئەژی و بە

سـانایی ئـەکرێت خـۆی لـە لاکـەی دیکـەدا ببینێتـەوە. ئـەم سـنوورە لـە هـەموو شـوێنێك بـوونی هەیـە، لـە تـەواوی لایەنـەکانی ژیـانی مـرۆڤو تەنانـەت لـە قـووڵترین بیۆلۆژیکترینیانـدا: غـەریزەی سێکسـی. تـەواو لەبەرئـەوەی کـە ئەمـە قـووڵترین لایـەنی ژیـانی مرۆڤـە، پرسـیارێك کـە بـۆ ئـارەزووی سێکسـی دێتـە ئاراوە قـووڵترین پرسـیارە. هـەر لەبەرئەوەیـە کـە کتـێبی جیاوازییـەکانی مـن نەیـدەتوانی لەگـەڵ هـیچ جیاوازییەکـدا تـەواو ببێت مەگەر ئەمە.

**راس: ئایا ئەوە بەرزترین شوێنێکە کە لە رەشبینیدا پێی گەیشتوویت؟**

کۆنـدێرا: مـن لەگـەڵ ووشـەکانی رەشـبین و گەشبین بە پارێزەوە ئیش ئەکەم. رۆمانێك هـیچ شتێك راناگەیـەنێت، رۆمان ئەگـەڕێت و پرسـیار ئـەکات. مـن نـازانم ئایـا نەتەوەکـەم لـە نێـو ئەچـێتو نـازانم ئایـا کەسـایەتییەکانی مـن دروسـتن یـان نـا مـن ئامـانج دروسـت ئەکـەم، یەکێك لە بەرامبـەر یـەکێکی دیکە دائەنێم و لـەم رێگایـەوە پرسـیار ئەکـەم. کـەودەنی خـەڵك لەوەدایـە کـە بـۆ هـەموو شـتێك پرسـیارێکیان هەیـە. وەختێك دۆن کیشـۆت[13] هاتـە دونیـاوە، دونیا لـە بەرامبـەر چاوانیدا بوویـە رازێك. ئەمـە میراتی یەکەمین رۆمانی ئەورووپاییە بۆ تـەواوی مێـژووی رۆمـانی لەوەبـەدواوە. رۆمـان نـووس خوێنـەر فێـر ئـەکات وەك پرسـیارێك لـە دونیـا رابمێنێـت. لـەم رەفتـارەدا ژیـری و ئـارامگرتن هەیـە. لـە دونیـای تـازەدا کـە بەڵگەنەویسـتە پیرۆزەکـان دروسـت بـووە رۆمـان مـردووە. دونیاییـە تاکڕەوەکـان چ ئـاینی چ مارکسیسـتی یـا هـەر شـتێکی دیکـەی دونیـایی سـەر بـە وەڵامەکانن لەجیاتی پرسیارەکان. لەم دونیایەدا رۆمـان هـیچ جێگایـەکی نییـە. بەهـەرحاڵ بـەڕای مـن خـەڵکی ئەمڕۆکـە لـە سەرانسـەری جیهانـدا پێیان باشترە داوەری بکەن تا ئەوەی کە تێبگـەن و وەڵام بدەنەوە تا ئـەوەی کـە پرسیاربکەن. بەم پێیـە دەنگـی رۆمـان لـە نێـو بەڵگەنەویسـتە کەودەن و پڕ هەراو هۆریا مرۆییەکاندا بە گران دێتە بەر گوێ.

## پەراوێزەکان:

1- *Book of Laughter and Forgetting*
2- *Vera*
3- *Kussi peter*
4- *The Joke*
5- *Laughable Loves*
6- *Rebelais*
7- *Sterne*
8- *Andre Breton*
9- *Eluard*
10- *Zalvis Kalandra*
11- *Miller Henry*
12- *George Bataille*
13- *Don Quixote*

## سەرچاوە:

سایتی *parswebgate*

# مرۆڤە ناودارەكان

ئۆرهان پامۆك

لە فارسییەوە: یاسین عومەر

ئەگەر چیرۆكێك نەبێت گوێی بۆ رابگریت یان شتێك نەبێت تەماشای بكەیت، ئەوا ژیان ناخۆش و وەڕسكەرە. كە منداڵ بووم ئەگەر لە پەنجەرەی ماڵەكەمانەوە تەماشای شەقام و ڕێبوارەكان، یاخود تەماشای باڵەخانەكانمان نەكردایە، ئەوا گوێمان لە ڕادیۆ دەگرت كە سەگێكی چینیی بچكۆلانە لەسەری خەوی هەتاهەتایی لێ كەوت بوو. ئەو كاتانە، لەساڵی 1958دا، لە توركیا تەلەفزیۆن نەبوو. بەڵام ئێمە هەرگیز بەسەر خۆماندا نەدەهێنا كە تەلەفزیۆنمان نیە، بە گەشبینییەوە دەمانوت: "هێشتا نەگەیشتووە". سەبارەت بەو فیلمە ئەفسانەییانەی هۆلیوودیش كە چەند ساڵی دەخایاند تا دەگەیشتنە ئەستنەبوڵ هەر هەمان شتمان دەوت.

خەڵكی وا ڕاهاتبوون لە پەنجەرەوە تەماشای دەرەوە بكەن، كاتێك كە دواجار تەلەفزیۆن گەیشتە ئەستەنبوڵ، جۆرێك تەماشای تەلەفزیۆنیان دەكرد وەك بڵێی تەماشای دەرەوە دەكەن. باوكم، مامم و نەنكم، بێئەوەی تەماشای یەكتر بكەن لەبەردەم تەلەفزیۆندا قسەیان دەكردو ئەو شتانەی دەیانبینی بۆ یەكتریان باس دەكرد، ڕێك وەك ئەو كاتانەی كە لە پەنجەرەوە سەرقاڵی تەماشاكردنی دەرەوە بوون.

بۆ نمونە پورم، لەكاتی تەماشاكردنی ئەو بەفرەی كە بەیانی باریبوو، دەیوت: "ئاوا بباریێت، پێموایە باشی تێ بكات."

من كە لە پەنجەرەیەكەوە تەماشای هێڵەكانی ترامواوم دەكرد دەموت: "ئەو حەڵوافرۆشە دیسان هاتۆتەوە بۆ نیشانتاشی"

ڕۆژانی یەكشەموان لەگەڵ مام و پورەكانمدا، كە وەك ئێمە لە قاتەكانی

ژێــرەوەی باڵەخانەکانــدا دەژیــان، دەچــووینە قــاتی ســـەرەوەی باڵەخانەکـــەی نــەنکم، تــا خواردنیـــان دەهێنـــا، مـــن لـــە پەنجـــەرەوە تەماشـای دەرەوەم دەکـرد. لـە ئامـادەبوون لـە کـۆڕی پـڕ ژاوەژاوی خزمانـدا ئەوەنـدەم زەوق هـەبوو ژوری دانیشـتنەکە _کـە چلچـرایەکی کریســـتاڵ لەســـەر مێـــزی نانخواردنەکـــە ڕوناکییەکی کـزی لێ بـەرز دەبـۆوە_ لەبەرچاوم ڕونـــاك دەبـــۆوە. ژوری دانیشـــتنی نـــەنکم هەمیشـــە نیمچـــە تاریـــك بـــوو، وەکـــو ژوری دانیشـتنی هـەموو قاتـەکانی دیکـە، بـەڕای مـن لەوانیش تاریکتر بوو. ڕەنگە هۆکەی ئەوە بوو بێـت کـە تـۆڕو پەردەگـەلێکی ئەسـتوریان بـە دەرگـــا هەمیشـــە داخراوەکـــەی باڵکۆنەکـــەدا هەڵواسـیبوو و سـێبەرێکی ترسـناکی لەسـەر ژوورەکـە دادەنـا، ڕەنگیشـە هۆکـەی ئـەوە بـوو بێـت ژوره قەرەباڵغـەکان پـڕ بـوون لـە کەلوپـەلی ناو ماڵ کە بۆنی گڵیان لێدەهات و پڕ بوون لە ســـنوقی کـــۆنی داریـــن و دیـــواری نـــاوبڕی بەسـەدەف ڕازاوە و مێزگـەلی گـەورەی داربـەڕو کە قاچەکانی پەنجەیی و جوان بوون، هـەروەها پیانۆیـەکی ڕۆیاڵی بچوك کـە سـەر قەباغەکـەی پڕ بوو لە چوارچێوەی ڕەسم.

ڕۆژێکـــی یەکشـــەممە، لـــەپاش نـــانی نیــوەڕۆ، مــامم لــە یــەکێ لــەو ژورانــەی کــە دەرگاکـــەی بەســـەر ژوری نانخواردنەکـــەدا دەکرایـــەوە، خـــەریك بـــوو جگـــەرەی دەکێشــا، بــەدەنگی بــەرز وتــی: "دوو دانــە بلیتـــی چـــوونەژورەوەی یـــاری تـــۆپی پـــێم هەیـە، بـەڵام نامـەوێت بچـم. چـۆنە باوکتـان هەردوکتان بەرێت؟"

بـرا گەورەکـەم لـە یـەکێك لـە ژورەکانـەوە وتـــی: "بـــەڵێ باوکـــە، ئێمـــە بـــەرە بـــۆ تەماشاکردنی یاری تۆپی پێ!"

باوکم پرسی: "ئەی بۆ خۆت نایانبەیت؟"

دایکم وەڵامی دایەوە: "من دەمەوێت بڕۆم بۆ سەردانی دایکم."

براکـەم وتـی: "ئێمـە نامانـەوێت بچـین بـۆ ماڵی نەنە."

مـــامم وتـــی: "دەتوانیـــت ئوتومبیلەکـــە ببەیت."

براکەم: "توخوا، تکات لێدەکەم."

بێدەنگییـــەکی درێژخایـــەن و ئازاربـــەخش باڵی بەسـەر دۆخەکـەدا کێشا، وەك بڵێی باوکم هەسـتی بـەوە کردبێـت کـە هـەموو کەسـەکانی نێـو ژورەکـە بیر لـە چـی دەکەنـەوە. دواجـار بـە مامی وت: "زۆر باشە سویچەکانم بدەرێ."

پاش کەمێك، لە قاتەکەی خۆمان، تا دایکم گۆرەویـە ئەسـتوورو نەخشێنراوەکەمان لـە پـێ بکات و ناچارمان بکات دوو بلوز بەسەر یەکدا لەبـــەر بکـــەین، بـــاوکم بـــە نـــاو ڕاڕەوە دوورودرێژەکـەدا دەهـات و دەچـوو و جگـەرەی دەکێشــا. ئوتومبیلــە دۆجــە (1952) کــاڵ و جوانەکـەی مـامم لەبـەردەم مزگـەوتی تەشـویقیە ڕاگـیرا بـوو. بـاوکم ڕێگـەی دا هـەردوکمان لـە پێشـەوە دانیشـین. مەکینـەی ئوتومبیلەکـە بـە یەکەمین سلف هەڵبوو.

لەبـــەردەم دەرگـــای چـــوونەژورەوەی وەرزشـگاکەدا نـەڕیز هـەبوو نـەهیچ. بـاوکم بـەو پیـــاوەی وت کـــە لـــە تەنیشـــت دەرگـــای چـوونەژوەرەکەدا وەسـتا بـوو: "ئـەم بلیتـە بـۆ هەردوکیانـە، یـەکێکیان هەشـت ساڵە و ئـەوی

تریشیان دە ساڵە." بەترس و لەرزەوە چووینە ژوورەوە، نیگەران بووین نەکا سەرنجی کارمەندی بلیتەکە رابکێشین. لە نێو جێگەکاندا گەلێك شوێنی بەتاڵ هەبوو. چووین و دانیشتین.

تیپەکانی تر لە ناو زەوییە قوراویەکەدا بوون و من چێژم لە تەماشاکردنی ئەو یاریکەرانە وەردەگرت کە بە شۆرتی سپییەوە بۆ دواوە و بۆ پێشەوە رایاندەکرد و خۆیان گەرم دەکرد. براکەم یەکێکیانی پیشان دام و وتی" "سەیرکە ئەوە حەمە چکۆلە. لە تیپی لاوانەوە هێناویانە."

"خۆم دەزانم، زۆر سوپاس."

ماوەیەك لە دوای دەستپێکردنی یارییەکە وەرزشگا هەمووی بەچەشنێکی سەیرو نهێنیئامێز بێدەنگ بوو بوو، هەستم لای یاریکەرەکان نەما و بیّئامانج بیرم کەوتە جموجۆڵ، چۆنە هەموو یاریکەرەکان جلەکانیان وەك یەك وایە کەچی هەر یەکەو ناوی خۆی لەسەر سنگی نووسراوە؟ کاتێك بۆ ئەم لاو ئەو لا رایاندەکرد، تەماشای ناوەکانیانم دەکرد. تا دەهات شۆرتەکانیان قوراویتر دەبوو. کەمێك دواتر، دوکەڵکێشی کەشتییەکم بینی کە زۆر بە خاوی دەرۆیشت و لەکاتی پەرینەوە لە بسفۆر لە پشت سەکۆی دانیشتنەکانی وەرزشگاکەوە رەت دەبوو. تا کاتی پشووی پاش جێمی یەکەم هیچ گۆڵێکیان نەکرد، باوکم بابۆڵەیەك نۆك و لەفەیەك پەنیری تواوەی بۆ کرین.

وتم: "بابە، من ناتوانم نانەکەم تەواو بکەم." و ئەو نانەی لە دەستما مابووەوە پیشانم دا.

وتی: "هەر لەویا لەسەر زەوییەکە دایبنێ، کەس پێی نازانێت."

لەکاتی پشووی نێوان دوو جێمەکەدا، هەستاین و راوەستاین و تۆزێك بۆ ئەم لاو ئەو لا رۆشتین، ئێمەش وەکو ئەوانی دیکە، هەوڵمان دەدا خۆمان گەرم بهێڵینەوە. من و براکەم، رێك وەکو باوکم، دەستمان خستە نێو گیرفانی پانتۆڵەکانمانەوە و پشت لە یاریگاکە راوەستاین. سەیری تەماشاکەرەکانمان دەکرد لەپڕ پیاوێك لەنێو خەڵکەکەوە بانگی باوکمی کرد. باوکم دەستی بە گوێچکەیەوە گرت و ئاماژەی کرد کە لەو غەڵبەغەڵبەدا گوێی لە هیچ شتێك نییە.

ئێمەی پیشان داو وتی: "ئێستا ناتوانم بێم، مناڵەکانم لەگەڵدایە."

ئەو پیاوەی لە نێو خەڵکەکەوە بانگی باوکمی کرد بوو ملپێچێکی وەنەوشەیی لەمل پێچابوو. چەند ریزێك هاتەخوارەوە" بەسەر پشتی کورسییەکاندا تێدەپەری و پالی بەخەڵکەوە دەنا و لەسەر رێگاکەی خۆی وەلایدەنان تا خۆی بگەیەنێتە ئێمە.

پاش ئەوەی لەگەڵ باوکمدا باوەشیان بەیەکدا کردو ئەو هەردوو رومەتی باوکمی ماچ کرد، پرسی: "ئەمانە منداڵی تۆن؟ تۆ منداڵی وا گەورەت هەیە؟ باوەڕ ناکەم."

باوکم وەڵامی نەدایەوە.

کابرا کە بە گومانەوە سەیری ئێمەی دەکرد وتی: "چۆن شتی وا دەبێت؟ یانی تۆ لە دوای قوتابخانەوە یەکسەر ژنت هێنا؟"

باوکم بێئەوەی تەماشای بکات وتی: "بەڵێ." دیسان ماوەیەکی دیکە قسەیان کرد. ئەو پیاوەی کە ملپێچێکی وەنەوشەیی لەملی پێچابوو دەنکێ چواله بایەمی بەتوێکڵی کردە دەستی هەر یەکەمانەوە. دوای ڕۆشتنی ئەو باوکم بێدەنگ لەسەر جێگاکەی دانیشتبوو.

کە تیپەکان بە شۆرتی خاوێنەوە بۆ یاریکردن گەڕابوونەوە، باوکم وتی: "یەلاّ، وەرن با بڕۆینەوە بۆ ماڵەوە، هەردوکتان سەرماتانە."

براکەم وتی: "من سەرمام نیە."

باوکم دیسان پێداگری کردەوە: "چۆن، سەرماتانە، عەلی سەرمایەتی، دەی بەڕێکەون."

لەکاتی ڕۆشتندا بەر ئەژنۆی خەڵك دەکەوتین و پێمان بە قاچیاندا دەنا، پێمان بەو لەفەی پەنیرەدا نا کە من لەسەر زەویەکە دامنابوو. کاتێ بە پێپلیکانەکاندا سەر دەکەوتین، گوێمان لە دەنگی شاوری داوەرەکە بوو کە دەستپێکردنی جێمی دووەمی ڕادەگەیاند.

براکەم لێی پرسیم: "مەگەر تۆ سەرماتە؟ ئەی بۆ نەتوت سەرمات نیە؟"

وەلاّمم نەدایەوە.

براکەم وتی: "ئەی بێ ئەقڵ."

باوکم وتی: "دەتوانن لە ماڵەوە لە ڕادیۆدا گوێ لە جێمی دووەم بگرن."

براکەم وتی: "ئەم یارییە لە ڕادیۆوە پەخش ناکەنەوە."

باوکم وتی: "لە گەڕانەوەدا لە مەیدانی تەقسیمەوە دەتانبەمەوە."

بێدەنگ بووین. کە لە مەیدانەکە تێپەڕین، وەکو پێشبینیمان دەکرد، باوکمان ئوتومبیلەکەی لەپاڵ کوشکی دەرەوەی گۆڕەپانەکەدا ڕاگرت و وتی: "دەرگاکان بۆ هیچ کەسێك ناکەنەوە. ئێستا دەگەڕێمەوە."

دابەزی، هێشتا دەرگاکانی لە دەرەوە دانەخستبوو کە لەناوەوە قفڵەکانمان دادایەوە، بەلاّم باوکم نەچوو بۆ بەردەم کوشکی شەرتبەندییەکە. بە ڕاکردن بە شەقامی بەردفرۆشدا سەرەوخوار بۆوە و چووە ئەوبەری شەقامەکەو خۆی کرد بە کۆگایەکدا کە لە پشت جامخانەکەیەوە پۆستەری کەشتی و مۆدێلی گەورەی پلاستیکی فڕۆکەو وێنەی کەناری دەریا دانرا بوو.

پرسیم: "ئەوە باوکم بۆ کوێ دەچێت؟"

براکەم وتی: "کە گەیشتینە ماڵێ، یاری سەرو ژێر بکەین؟"

کە باوکم گەڕایەوە، براکەم خەریك بوو یاری بەدەسکی گێڕەکە دەکرد. بەخێرایی تا نشانتاشی ڕۆشتین. باوکم دیسان ئوتومبیلەکەی لەبەردەم مزگەوتەکەدا ڕاگرتەوە. کاتێ بەپاڵ دوکانەکەی عەلادیندا ڕەتدەبووین، باوکم وتی: "چۆنە شتێك بۆ ئێوە بکڕم؟ بەلاّم بنێشتی مرۆڤە ناودارەکان نا، کەوتینە هەڵبەزو دابەزو وتمان: "توخوا باوکە گیان، توخوا بنێشتی ناودارانمان بۆ بکڕە."

باوکم بۆ هەر یەکێکمان دە بنێشتی کڕی کە وێنەی کەسە ناودارەکانی لە ناودا پێچرا

بوو. کە گەیشتینەماڵەوە، لە ئەسانسۆرەکەدا لەدڵی خۆمدا وتم وەختە لە خۆشیدا میز بکەم بەخۆمدا. ناو باڵەخانەکە گەرم بووو هێشتا دایکمان نەگەڕابۆوە. بەخێرایی بنێشتەکانمان هەڵبچڕیو کاغەزەکانمان فڕێدایە سەر زەوی. من دوو دانە مارشاڵ فەوزی چاکماك، یەك چارلی چاپلن، یەك حەمید کەپلانی زۆرانباز، یەك مۆتسارت، یەك دوگل، دوو ئەتاتورك، و یەك ژمارە 21، گرتاگاربۆم دەستکەوت کە براکەم نەیبوو. بەتێکڕا 173 وێنەی کەسانی ناودارم هەبوو، بەڵام هێشتا 27 دانەم مابوو کە سێتەکەم تەواو بێت. براکەم چوار دانە مارشال فەوزی چاکماك، پێنج دانە ئەتاتورك، یەك ئەدیسۆنی بوو بەنسیب. هەریەکەمان سەرو بنێشتمان نایە دەممانو دەستمان کرد بەخوێندنەوەی شەرحی پشتەوەی وێنەکان: بە براوەی خاوەنشانسیٚ کە هەموو سەد وێنەی مرۆڤە ناودارەکان کۆبکاتەوە تۆپێکی فۆتباڵی چەرم وەك دیاری پێشکەش دەکرێت. براکەم کە 165 وێنەی کۆکردبۆوە و بەسەفتەکراوی لە ناو دەستیدا ڕایگرتبوو، وتی: "وەرە ڕەسم ڕەسمێنە بکەین."

"نایکەم."

وتی: "من دوانزە دانە لە مارشاڵ چاکمەکەکانم دەگۆڕمەوە بە یەك گرتا گاربۆ. جا ئەوکات تۆ بەسەر یەکەوە 184 دانە وێنەت هەیە."

"شتی وا ناکەم."

"ئاخر تۆ دوو دانە گرتا گاربۆت هەیە."

هیچم نەوت.

براکەم وتی: "بەیانی کە لە قوتابخانە کوتایانین، چاك ئازارت دێت، بەگریانەوە نەیەیت بۆ لای من، باشە؟"

"باشە، نایەم."

پاش ئەوەی کە بێدەنگ نانی ئێوارەمان خوارد، گوێمان لەبەرنامەی وەرزش گرتو تێگەیشتین کە یارییەکە دوو بە دوو تەواو بووە. کاتێك کە دایکم هاتە ژورەکەمانەوە تا بمانخاتە ناو نوێنەکەمانەوەو براکەم خەریك بوو جانتای قوتابخانەی ئەپێچایەوە، ڕامکرد بۆ ژوری دانیشتنەکە. باوکم لە پەنجەرەکەوە چاوی بڕیبووە دەرەوە.

وتم: "باوکە نامەوێت بەیانی بچم بۆ قوتابخانە."

"بۆچی؟"

وتم: "بڕیارە بەیانی بمانکوتن. منیش بە کوتان تام لێدێتو هەناسەم دەگیرێت. دایکم ئاگادارە.

باوکم هیچی نەوت، تەنیا سەیرێکی کردم. ڕامکردو لە ناو چەکمجەکەدا قەڵەمو کاغەزێکم بۆ هێنا.

کاغەزەکەی خستە سەر کتێبەکەی کیرکەگۆر کە هەمیشە خەریك بوو دەیخوێندەوەو قەتیش تەواو نەدەبوو"

پرسی: "دڵنیایت کە دایکت ئاگادارە؟"

پاشان وتی: "دەچیت بۆ قوتابخانە بەڵام خۆت ناکوتی، من ئەمە دەنوسم."

یاداشتەکەی ئیمزا کرد. فوی لە مەرەکەبەکە کرد، کاغەزەکەم قەد کردو خستمە گیرفانمەوە. بە ڕاکردن گەڕامەوە بۆ ژوری نوستنەکەمان، یاداشتەکەم خستە ناو

جانتاکـــەم، پاشـــان دەســـتم کـــرد بـــە هەڵبەزو دابەز.

دایکم وتی: "هێمن بە، دە ئیتر بنوو."

لـە قوتابخانـە، هـەر یەکسـەر لـە دوای نـانی نیـــوەڕۆ هـــەموو قوتابیـــەکان بـــە دوو ڕیـــز ڕاوەســتان و گەڕاینــەوە بــۆ لای کافتریایــەکی بۆگـــەن تـــا دەرزی کوتانمـــان لێبـــدەن. هەنـــدێك دەگریـــان، ئـــەوانی دیکـــەش بەرلـــەوەی بگەنـــە لای کـــابرای دەرزی لێـدەر غەڵبەغـەڵبیان بـوو. هـەر کـە بـۆنی یۆدەکـەی قـاتی خـوارەوەم بـەر لـوت کـەوت یەکسـەر لێـدانی دڵـم خێـرا بـوو. لـە ڕیزەکـە هاتمـــە دەرەوەو چـــووم بـــۆ لای ئـــەو مامۆسـتایەی کـە لەسـەر نەردەوانەکـە وەسـتا بـوو. قوتابیـەکان بـە هـەراو قیـژەی بـەرزەوە بـە تەنیشتماندا ڕەت دەبوون.

مامۆستا وتی: "بەڵێ، ئیشێکت هەبوو؟"

ئـەو یاداشـتەی کـە بـاوکم نوسـیبووی لـە گیرفـانم دەرهێنـا و دام پێـی. بـە گرژییـەوە خوێندییەوەو وتـی: "ئاخر خۆ باوکت دکتۆر نیـە." پـاش سـاتێك بیریکـردەوەو درێـژەی بەقسەکەی دا: "بڕۆ قاتی سەرەوە، لە دووەمی ئەلف چاوەڕوان بە."

لە قاتی سەرەوە لە دووەمی ئەلف، شـەش حـەوت کوڕیژگـەی وەك مـن هـەبوون کـە لـە کوتـان عـەفوکرابوون، یـەکێکیان بەترسـەوە لـە پەنجرەکـەوە سـەیری دەرەوەی دەکـرد. لـە ڕاڕەوەکەشەوە دەنگەدەنگی بێکۆتایی گریان و فەرتەنـە دەهاتـە گـوێ. کـوڕێکی قەڵـەوی چـاویلکە لـە چـاو ناوکـە گوڵەبـەڕۆژەی دەتروکان و تەماشای کتێبی کارتۆنی کینـۆی دەکـرد. دەرگـا کرایـەوەو سـەیفی بـەگ، یاریدەدەری بەڕێوەبەر هاتە ژوورەوە.

وتـی: "مەبەسـتم ئـەوە نیـە سـوکایەتی بـەو خوێندکارانـە بکـەم کـە بەڕاسـتی نەخۆشـن، قسـەکەی مـن ڕو لەوانەیـە کـە خۆیـان نـەخۆش خستووە. ڕۆژێك دێت هەمووتان بانگ دەکرێن خزمـەتی وڵاتەکـەتان بکـەن، و ڕەنگـە تەنانـەت گیـانی خۆشـتانی لـەپێناودا بـەخت بکـەن، ئەگـەر ئەوانـەی کـە ئـەمڕۆ خۆیـان لـە کوتانەکـە دزیوەتـەوە لـەو ڕۆژەدا عـوزرێکی ڕەوایـان نـەبێت، خیانـەتیان کـردووە. ئێـوە دەبێـت خەجاڵـەتی بکێشـن!" ئێمـە بێـدەنگ بـووین. هەروا کە تەماشای وێنەکەی ئەتاتورکم دەکرد فرمێسك لە چاوانمەوە هاتە خوارەوە.

ماوەیەك دواتر، بێ دەنگە دەنگ گەڕاینـەوە پۆلـەکانمان، ئـەو منداڵانـەی کـە خۆیـان کوتـا بـوو لـچ و لێویـان شـۆڕ بووبـۆوە. هەنـدێکیان قۆڵی کراسەکانیان هـەڵکردبوو، ئەوانی تـریش فرمێسـك زابـووە چـاویان، هـەموو پاڵیـان بەیەکترییەوە دەنا و شانیان لە یەکتر دەکوتا.

مامۆسـتاکەمان دەیـوت: "ئەوانـەی ماڵیـان نزیکـە دەتـوانن بڕۆنـەوە. ئەوانـەیش کـە بەدوایاندا دێن دەبێت تـا زەنگـی کۆتـایی لێـرە چاوەڕێ بن. مەکێشن بە قۆڵی یەکتردا! سبەی مەکتەب نیە."

هوهومـان کێشـا، لـە قـاتی خـوارەوە، لەبـەردەم دەرگـای سـەرەکیی قوتابخانـە، هەنـدێك لـە قوتابییـەکان کـە خـەریك بـوون دەچـوونە دەرەوە قـۆڵی کراسـەکانیان هـەڵکردبوو و پەڵـەی یۆدەکـەی سـەر قۆڵیـان پیشانی حیلمی ئەفەندی دەرگاوان دەدا.

هەرئەوەندەی جانتا بەدەست لە قوتابخانە هاتمە دەرەوەو پێم نایە سەر شەقامەکە دەستم کرد بە ڕاکردن. گالیسکەیەك کە ئەسپێك ڕایدەکێشا لەبەردەم دوکانی قاراپێتدا شۆستەکەی گرتبوو. بەنێو ئوتومبیلەکاندا ڕامکرد و خۆم گەیاندە ئەوبەری شەقامەکە، ماڵی ئێمەش لەوبەری شەقامەکەوە بوو. بەڕاکردن بەبەردەم کوتاڵفرۆشی حائیری و گوڵفرۆشیەکەی سالحدا تێپەڕیم. حازم ئەفەندی خزمەتکارمان دەرگای باڵەخانەکەی بۆ کردمەوە. پرسی: "بەم ساتەوەختە چی دەکەیت لەماڵەوە؟"

وتم: "ئەمرۆ کوتاییانین، پاشان ئیزنیان داین."

"براکەت لە کوێیە؟ بە تەنها هاتیەوە؟"

"خۆم لە هێڵەکانی تراموا پەڕیمەوە. بەیانی قوتابخانە نیە."

ئەو وتی: "دایکت لەماڵەوە نیە. بۆ ناچیت بۆ سەرەوە بۆ ماڵی نەنکت؟"

وتم: "نەخۆشم. ئەمەوێت بچم بۆ ماڵی خۆمان، دەرگاکەم بۆ بکەرەوە."

حازم کلیلەکەی لە بزماری سەر دیوارەکە کردەوەو چووینە ناو ئەسانسۆرەکەوە، تا گەیشتینە قاتی سەرەوە دوکەڵی جگەرەکەی ناو ئەسانسۆرەکەی پڕ کردو چاوانمی کزاندەوە. دەرگای ئەسانسۆرەکەی بۆ کردمەوەو وتی: "یاری بە گڵۆپەکان مەکە." و دەرگاکەی لەدوای خۆیەوە داخست و ڕۆشت. هەرچەندە کەس لە ماڵەوە نەبوو هاوارم کرد: "کەس لە ماڵەوە نیە؟ من هاتومەتەوە ماڵێ، من هاتوومەتەوە ماڵێ!" جانتاکەم دانا و چەکمەجەی مێزی سەعیکردنی براکەم کردەوەو دەستم کرد بە هەڵگێڕو داگێڕ کردنی ئەلبومی ئەو بلیتە سینەماییانەی کە هیچ کات ئامادە نەبوو نیشانم بدات. پاشان ئەلبومی ئەو وێنە ڕۆژنامەییانەیم هەڵگرت کە هی تۆپی پێ بوون و لە ڕۆژنامەکانی دەکردەوەو پێوەی دەلکاند. وەختێك هەروا نوقمی تەماشاکردن بووم گوێم لە دەنگی سوڕانی کلیل لە نێو کێلونی دەرگای باڵەخانەکەدا بوو، لە ترسا بەندی دڵم پسا. بە دەنگی پێکانیدا زانیم کە دایکم نیە. باوکم بوو. بلیتەکان و ئەلبومەکەم بە وردی لە شوێنی خۆیان دانایەوە تا نەڵێت تێکمداون بەسەر یەکدا.

باوکم چووە ژووری نوستنەکەی، دەرگای کەنتۆرەکەی کردەوەو تەماشای ناوی کرد.

"ئا تۆ لە ماڵەوەیت؟"

هەروەك نەریتی منداڵانی مەکتەب وتم: "نەخێر، لە پاریسم."

"ئەمرۆ نەچوویت بۆ مەکتەب؟"

"ئەمرۆ ڕۆژی کوتان بوو."

"براکەت لە کوێیە؟ زۆر باشە بێدەنگە دەنگ برۆ لە ژورەکەت دانیشە."

بەقسەیم کرد. ناوچەوانم نا بە چوارچێوەی پەنجەرەکەوە. تەماشای دەرەوەم کرد. لەو دەنگ و هەرایەی نابویەوە تێگەیشتم خەریکە یەکێ لە جانتاکانی سەر کەنتۆرەکە دادەگرێتە خوارێ. پاشان گەڕایەوە بۆ ژوورەکەی. چاکەت و پانتۆڵە سپۆرتەکانی لە کەنتۆرەکە دەرهێنا" دەنگی ئاسنیی عەلاقەی جلەکانم بۆ جیا دەکرایەوە. چەکمەجەی

کراس و گۆرەوییەکانی کردەوەو دایخستەوە. گوێم لێبوو هەموویانی کردە ناو جانتاکەوە. ڕێکوپێک دەچووە گەرماو و دەهاتە دەرەوە. جانتاکەی داخست و شریتەکەیشی توند کرد، پاشان هات بۆ لای من لە ژوورەکەم.

"خەریکی چیت؟"

"لە پەنجەرەکەوە تەماشای دەرەوە دەکەم."

باوکم وتی: " وەرە ئێرە بزانم."

لە سەر ئەژنۆکانی داینیشاندم و دوو بە دوو تەماشای دەرەوەمان کرد. شنەبایەك لوتکەی ئەو دارسەروە بەرزانەی دەلەراندەوە کە لە نێوان ئێمەو باڵەخانە بەرزەکەی بەرامبەرماندا بوو. حەزم لە بۆنی باوکم بوو."

وتی: "من دەڕۆم بۆ شوێنێکی زۆر دوور." ماچی کردم و وتی: "هیچ شتێك بە دایکت مەڵێ، خۆم دوایی پێی دەڵێم."

"بە فڕۆکە؟"

وەڵامی دایەوە: "بەڵێ، دەڕۆم بۆ پاریس. هیچ بە کەس مەڵێ." ئەسکەناسێکی دوو لیرەو نیوی لە گیرفانی دەرهێناو دایمێ و وتی: "دەربارەی ئەمیش هیچ بە کەس مەڵێ." دوبارە ماچی کردمەوەو وتی: "ئەوەشیان پێ مەڵێ کە منت لێرە بینیوە.."

یەکسەر پارەکەم خستە گیرفانمەوە. کاتێ لەسەر ئەژنۆکانی دایگرتم و جانتاکەی هەڵگرت، وتم: "بابە، مەڕۆ."

باوکم دوبارە ماچی کردمەوەو ڕۆشت.

لە پەنجەرەکەوە تەماشایم کرد. چووە فرۆشگاکەی عەلادین. پاشان هاواری لە تەکسییەك کرد. بەر لەوەی بنوشتێتەوەو سواری تەکسییەکە ببێت، دیسان تەماشای باڵەخانەکەی کردەوەو دەستی بۆ ڕاوەشاندم، منیش دەستم بۆ ئەو ڕاوەشاندو لەبەرچاوم دیار نەما.

سەیری شەقامە چۆڵەکەم کرد. ترامواییەك تێپەڕی و دوای ئەویش عەرەبانەیەکی ئاوفرۆش کە ئەسپە پیرەکەی ڕایدەکێشا. زەنگم لێدا تا حازم ئەفەندی بێت.

کاتێ هات، پرسی: "تۆ زەنگت لێدا؟ پێم نەوتی یاری بە زەنگەکە مەکە؟"

وتم: "ئەم دوو لیرەو نیوە بگرەو بڕۆ بۆ فرۆشگاکەی عەلادین و دە دانە بنێشتی مرۆڤە ناودارەکانم بۆ بکڕە. بیرت نەچێت پەنجا قروشی باقیاتەکەیشی بهێنیتەوە."

ئەو پرسی: "ئەم پارەیە باوکت داویتی؟ خۆ دایکت توڕە نابێت، ها؟"

وەڵامم نەدایەوە، لەپەنجەرەکەوە تەماشایم کرد کە چووە ناو فرۆشگەکەوە. چەند خولەکێك دواتر هاتە دەرەوەو لە ڕێگەی گەڕانەوەدا ڕوی بەرەوی خزمەتکاری باڵەخانەکانی ئەوبەری شەقامەکەی مەڕمەڕەدا تەقییەوە و وەستاو پێکەوە قسەیان کرد.

کاتێ گەڕایەوە، باقیاتی پارەکەی دایەوە بەمن. یەکسەر بنێشتەکانم هەڵپچڕی: سێ دانە مارشاڵ فەوزی چاکماکی تر، یەك ئەتاتورك، و یەك لیندبێرگ، لیۆناردۆ داڤنچی، سوڵتان سەلیمی گەورە، چەرچل و ژەنراڵ فرانکۆ، یەك ژمارە $21$ی تر، گرتا گاربۆ، کە براکەم نەیبوو. ئێستا کۆی وێنەکانی من $183$ دانە بوون، بەڵام هێشتا $26$ دانەی کەم بوو تا پێڕەکەم تەواو ببێت.

یەکـەمین جـارم بـوو سـەیری ژمـارە 91 م دەکـرد، وێنـەی لینبێـرگ، کـە لەبـەردەم فرۆکەیەکدا وەستا بـوو کـە بەهۆیـەوە بەسـەر ئۆقیانوسی ئەتڵەسیدا فڕی بوو" لە پڕ دەنگی سـوڕانی کلـیلم لـە کێلـونی دەرگاکـەدا هاتـە گـوێ. دایکـم بـوو! دەسـتبەجێ کاغـەزی بنێشـتەکانم لەسـەر زەوییەکـە کۆکردەوەو لامبردن.

وتم: "کوتایـانین. مـن زوو گەڕامـەوە. لوقاحی تیفۆئید، تیفۆس، گزاز."

"براکەت کوا؟"

وتم: "هێشـتا پۆلەکـەی ئـەوانیان نەکوتابوو. ئێمەیان ناردەوە ماڵێ. من خۆم لە شەقامەکە پەڕیمەوە."

"ئازارت هەیە؟"

هیچم نەوت.

زۆری نەخایانـد براکـەم هاتـەوە ماڵـەوە. ئـازاری هـەبوو" لەسـەر لای ڕاسـت لەسـەر سیسـەمەکە ڕاکشـاو بـە نیوچـەوانی گـرژەوە نووسـت. کـاتێ لـە خـەو هەسـتا، ئاسمـان تاڕادەیەك تاریك بوو بوو. وتـی: "دایە دەستم زۆر دێشێت."

دایکم کە خەریکی ئوتوکردن بوو هـەر لـە ژووری دانیشـتنەوە وتـی: "تـا شـەو تـات لێـدێت، عـەلی شـوێنی کوتانەکـەی تـۆش دێشێت؟ ڕاکشێ و ئارام بگرە." بێجوڵە ڕاکشا بووین و ئیسراحەتمان دەکرد. براکەم، لەپاش ئەوەی کە سەرخەوێکی شکاند، هەستایە سەر قـنگ و لاپـەڕەی وەرزشـی ڕۆژنامەکـەی خوێندەوەو پێی وتم کە ڕۆژی پێشتر لەبەر من نەمانتوانیبوو چوار دانە گۆڵ ببینین.

وتم: "ئەگـەر ئێمـە نەهاتینایەتـە دەرێ، ڕەنگە گۆڵیان هەر نەکردایە."

"چیی؟"

براکـەم، پـاش سـەرخەوێکی دیکـە، پێشـنیاری بـۆ کـردم کـە شـەش دانـە مارشـاڵ چاکماك، چوار دانـە ئـەتاتورك، و سێ وێنـەی دیکـە کـە خـۆم هـەمبوون بـە یـەك گرتـابۆ بگۆڕێتەوە.

ڕازی نەبووم.

ئـەو کـات پرسـی: "دەمـەوێ یـاری "سـەرو ژێر" بکەین؟"

"باشە، وەرە یاری بکەین."

یارییەکـەمان بـەم چەشـنە بـوو. دەستـەیەك وێنـەی مرۆڤـە ناودارەکـان لـە هـەر دوو دەستماندا دادەناو دەمانپرسی: "سەرەوە یان ژێـرەوە؟" ئەگـەر لایـەنی بەرامبـەر بیوتایـە: "ژێرەوە: وێنـەی ژێرەوەی دەستە وێنەکـەمان دەردەهێنـا" گریمـان ژمـارە 78، ڕیتـا هیـۆرس بـوو. و گریمـان ژمـارە 18، دانتێـی شـاعیر، لەسەرەوەی دەستە وێنەکە بوو، لەم حاڵەتەدا ئـەو دو "ژێـر"ە بـراوە بـوون چونکە ژمارەکـەی بـەرزتر بـوو و ناچـار دەبـووین یـەکێ لـەو وێنانـەی کە زۆر حەزمان لێی نەبوو بدەین بە ئـەو. تـا شـەو خـەریکی ئـاڵوێرکردنی وێنـەکانی مارشـاڵ فەوزی چاکماکمان بووین. کـاتی نـانی ئێـوارە، دایکـم وتـی: یـەکێکتان بچێت سەرێك لەسەرەوە بدات ڕەنگە باوکتـان هاتبێتـەوە." هـەر دوکمـان چـووینە قـاتی سـەرەوە بـاوکمی لـێ نـەبوو. مـامم و نـەنکم خـەریك بـوون جگـەرەیان دەکێشا. گوێمـان لـە ڕادیـۆ گـرت و ڕۆژنامـەمان خوێنـدەوە. کـاتێ

نەنکم و مامم چوون لە سەر مێزی نان خواردن دانیشتن گەڕاینەوە قاتی خوارەوە. دایکم وتی: "لە کوێ بوون؟ خۆ لە سەرەوە هیچتان نەخوارد؟ باشتر وایە تا باوکتان دێتەوە شۆربای نیسکێنەتان بدەمێ هێواش هێواش بیخۆن بۆ ئەوەی خۆتانی پێوە خەریک بکەن."

براکەم پرسی: "نانی برژاومان نیە؟"

کاتێ بێدەنگ شۆرباکەمانمان دەخوارد دایکم سەیری دەکردین. بەو جۆرەی کە سەری ڕاست ڕاگرتبووو تەماشای چاوانی ئێمەی دەکرد دیار بوو گوێقولاخی دەنگی زەنگی ئەسانسۆرەکەیە. کە شۆرباکەمان تەواو بوو، سەیری ناو مەنجەڵەکەی کردو وتی: "هی ترتان دەوێت؟ ڕەنگە واباشتر بێت کە منیش تا سارد نەبۆتەوە شۆرباکەم بخۆم." کەچی لەبری ئەوەی شۆرباکەی بخوات بەرەو لای ئەو پەنجەرەیە چوو کە بەسەر گۆڕەپانی نشانتاشی دا دەیڕوانیو بێدەنگ لە خوارەوە ڕاما. پاشان گەڕایەوە سەر مێزەکەو سەرقاڵ بوو بە خواردنی شۆرباکەیەوە. منو براکەم خەریک بووین باسی یاریی تۆپی پێکەی دوێنێمان دەکرد کە لەپڕا دایکم وتی: "وسس! ئەرێ دەنگی ئەسانسۆر نیە؟"

بەوردی گوێمان هەڵخست، دەنگی ئەسانسۆر نەبوو. تراموایەک تێپەڕی، و مێز و ئاوی ناو پەرداخەکانو دۆلکەکەی تۆزێک لەرانەوە. کاتێک خەریک بووین پرتەقاڵمان دەخوارد، بەڕاستی گوێمان لەدەنگی ئەسانسۆرەکە بوو. نزیک بۆوە نزیک بۆوە بەڵام لە قاتی ئێمە تێپەڕیو بەرەو قاتەکەی نەنکم لە دوایین قات چوو.

دایکم وتی: "چوو بۆ قاتی سەرەوە."

کە شێو تەواو بوو، دایکم وتی: "دەورییەکانتان بەرن بۆ چێشتخانەکە، بەڵام ئەوەکەی باوکتان واز لێبێنن با لەوێ بێت." منو براکەم مێزەکەمان کۆکردەوە. قاپە بەتاڵەکەی باوکم لە سەر مێزەکە مایەوە.

دایکم بەرەو لای ئەو پەنجەرەیە چوو کە بەسەر بنکەی پۆلیسخانەدا دەکرایەوەو سەیری دەرەوەی کرد. پاشان لەپڕ وەکو ئەوەی بڕیاری دابێت قاپو کەوچکو چەقۆو چەتاڵەکەی باوکمی کۆکردەوەو بردی بۆ چێشتخانەکە. قاپەکانی نەشت، وتی: "من دەچم بۆ ماڵی نەنکتان، لەگەڵ یەکتری شەڕ نەکەن."

منو براکەم خولێکی تر یاری سەرو ژێرمان دەست پێکرد.

من یارییەکەم دەست پێکردو وتم: "ژێر". براکەم یەکەم وێنەی سەر کۆمەڵە وێنەکەی پیشاندام و وتی: "زۆرانبازی بەناوبانگی جیهان، ژمارە 34." پاشان تەماشای ژێرەوەی وێنەکانی کرد. وتی: "ئەتاتورک، ژمارە 50. دۆڕانت. یەکێ ڕەت بکە با بێت.

بە تووڕەییەوە وتم: "من ئیتر یاری ناکەم. ئەچمە سەرەوە بۆ لای دایکم."

"دایکم زۆر تووڕە دەبێت."

"تۆ دەترسیت بەتەنها لێرە بمێنیتەوە، ترسنۆک!"

دەرگای ئاپارتمانەکەی نەنکم وەکو هەمیشە کراوە بوو. شێویان تەواو کردبوو، بەکری چێشتکەر خەریک بوو قاپوقاچاخەکانی دەشت، مامم و نەنکیشم

بەرامبەر یەك دانیشت بوون. دایکم لەکەنار ئەو پەنجەرەیە وەستا بوو کە بەسەر گۆڕەپانی نیشانتاشیدا دەیڕوانی.

بێئەوەی چاو لە سەر پەنجەرەکە هەڵبگرێت، وتی: "وەرە ئێرە." بەخێرایی جێی خۆم لە بۆشایی نێوان دایکم و پەنجەرەکەدا کردەوە کە دەتوت بە تایبەتی بۆ منیان دانابوو. پاڵم پێوەداو وەکو ئەو چاوم بڕییە گۆڕەپانی نیشانتاشی. دایکم دەستی خستە سەر ناوچەوانم و دەستی هێنا بە قژما.

بەهێواشی وتی: "دەزانم باوکت هاتۆتەوە بۆ ماڵ و تۆ لە دەوروبەری نیوەڕۆدا بینیوتە."

"بەڵێ."

"ئەزیزم، باوکت پێی نەوتی دەچێت بۆ کوێ؟"

وتم: "نەخێر، ئەسکەناسێکی دوو لیرە و نیوی دامێ."

جامخانەی تاریکی فرۆشگەکانی سەر شەقامەکەی ژێرمان، چرای ئوتومبیلەکان، شوێنی چۆڵی پۆلیسی هاتوچۆکە لە شوێنە هەمیشەییەکەیدا، شۆستە تەڕەکان، قسەی ئەو تابلۆ ڕاگەیاندنانەی کە بە درەختەکاندا هەڵواسرا بوون، هەموویان زۆر خەماوی بوون و سەرودڵی پیاویان دەگرت. کاتێك باران دایکرد، دایکم هێشتا بەهێوری دەستی بە قژما دەهێنا.

ئەو ڕادیۆیەی کە هەمیشە لە نێوان مامم و نەنکمدا بوو و هەمیشە داگیرسا بوو، ئێستا کوژابوووەوە، ئەمەش منی ترساند. تۆزێك دواتر، نەنکم وتی: "کچی شیرینم، لەوێ مەوەستە. تکایە وەرە ئێرە و دانیشە."

لەم بەینەدا، براکەیشم هاتبووە قاتی سەرەوە.

مامم وتی: "ئێوە هەردوکتان بچن بۆ چێشتخانەکە." پاشان هاواری کرد: "بەکر، تۆپێکیان بۆ دروست بکە تا لە ڕاڕەوەکەدا تۆپتۆپێنی پێ بکەن."

لە چێشتخانەکە، بەکر لە شتنی قاپ و قاچاغەکان بووبوۆوە، وتی: "دە دانیشن." پاشان ڕۆشت و لە باڵکۆنە بچوکەکەی نەنکم کە چواردەورەکەیان بە شوشە داپۆشیبوو چەند پەڕە ڕۆژنامەی هێنا و لولی کردن و بەشێوەی تۆپێکی لێکردن. تۆپەکە هێندەی مشتی لێهات، وتی: "ئەمە چۆنە؟"

براکەم وتی: "تۆزێك گەورەتر."

بەکر چەند پەڕە ڕۆژنامەی تری بە دەوردا پێچا کە تا دەهات گەورەتر دەبوو. لە کەڵینی دەرگا نیوە کراوەکەوە، دەمبینی دایکم بەرامبەر نەنك و مامم دانیشتووە. بەکر دەزوییەك کە لە چەکمەجەکەدا دەریهێنابوو هێنای و بە توندی لە تۆپە لە ڕۆژنامە دروستکراوەکەیەوە پێچا، تۆپەکەی بەتەواوی خڕ کردەوە و پاشان دەزووەکەی گرێ دا. بۆ ئەوەی گوێچکە دەرپەڕیوەکانی ڕۆژنامەکەی ساف بکات، تۆپەکەی بە پەڕۆ کۆنەیەکی تەڕ تەڕکرد. براکەم نەیدەتوانی لەوە زیاتر خۆی بگرێت تۆپەکەی لە دەست فڕاند.

"ئەی خوایە گیان، خۆ ئەڵێی بەردە ئەوەندە ڕەقە."

بەکر وتی: "پەنجەت بخەرە ئێرە."

براکەم بەوردی پەنجەی خستە سەر گرێی دەزووەکە و بەکریش دوایین گرێی لە

دەزووەکــە دا. پاشــان هەڵیــدا بــۆ ئاسمــانو ئێمەش دەستمان کرد بە شوت لێدان.

بەکر وتـی: "بڕۆنـە ڕاڕەوەکـە. لێـرە هـەموو شتەکان دەشکێنن."

تــا ماوەیــەکی زۆر بــە گــەرمیو شــۆرو شەوقەوە یاریمان دەکرد، من خۆم وا دەهاتە پــێش چــاو کــە یــاریزانی هێرشــبەری لای چــەپی یانــەی فەنــەری باخچــەمو دەتــوانم وەکــو ئــەوان گێلــە بــە حەریفــەکانم بکــەم و تۆپەکەیان لێ تێپەڕێنم.

کـاتێ کـە هـەوڵم دەدا پـێش بکـەوم، بـەر قــۆڵی برینــداری براکــەم کــەوتم، ئــەویش لێـی دام، بـەلام هەسـتم بـە هـیچ نـەکرد، لـە ئارەقــەدا شــەلاڵ بــووینو تۆپەکــەش خــەریك بـوو ئـیتر لەکـەڵك دەکـەوت. پێـنج بـە سـێ لـە پــێش ئــەوەوە بــووم کــە بەتونــدی بــەر قــــۆڵی کەوتمــــەوە. براکــــەم کــــەوت بەزەویـداو دەسـتی بـە گریـان کـرد، هـەر لـەو شوێنەی کە کەوتبوو وتـی: "بۆستە با دەستم چاك بێتەوە، دەتکوژم."

لە ژوری نوستنەکە خۆم شاردەوە. نەنکم، دایکــمو مـــامم چـــوو بـــوون بـــۆ ژووری خوێندنــەوە. نــەنکم لای تەلەفۆنەکــەوە بــوو خەریك بوو ژمارەی وەردەگرت.

هــەر بــەو ئــاوازە ســاردو ســڕەی کــە بــە دایکمی وتبوو (کچە ئازیزەکەم" وتـی: "ئـەلو، ئــازیزم، فڕۆکەخانــەی یشــیلکۆیە؟" باشــە، ئازیزەکـەم، دەمـەوێت سـەبارەت بـە موسـافرێك لـە یـەکێ لـە گەشـتەکانی ئـەمڕۆی ئـەورووپادا پرسیار بکـەم." نـاوی بـاوکمی وتو چاوەڕوان مـا" لــەم حاڵــەدا، وایــەری تەلەفۆنەکــەی بــە دەوری پەنجـەی خۆیدا دەپێچا، بە مـاممی وت بڕۆ جگەرەکەمم بۆ بهێنە."

کاتێ مـامم لـە ژوورەکـە چووە دەرێ، نـەنکم بــەئارامی بیســتەری تەلەفۆنەکــەی لەســەر گوێچــکەی خــۆی هــەڵگرت، بــەدایکمی وت: "کچە شیرینەکەم، بڵێ بزانم، ئەگەر ئافرەتێکی دیکە لە ناودا بوایە تۆ دەتزانی، وانییە؟"

وەڵامەکـەی دایکمـم گـوێ لێ نـەبوو. نـەنکم بــە جۆرێــك ســەیری ئــەوی دەکــرد دەتــوت ئەسڵەن هیچـی نـەوتووە. ئـەو کەسـەی کـە لـەو سەری هێڵەکەوە بوو شتێکی وتو نەنکم ڕوی کـرد بـە لای مامـدا کـە بـە پاکەتـە جگـەرەو تەپڵــەکی جگەرەکــەوە گــەڕابۆوەو وتــی: "وەڵامم نادەنەوە"

بێگومــان دایکــم لــە ســیمای مامــەوە تێگەیشـتبوو کـە مـن لـە ژووری دانیشـتنەکەم. دەســتم گــرتمو ڕایکێشــامە دەرەوە بــۆ نــاو ڕاڕەوەکە. دەستی هێنا هـەر لـە گەردنمـەوە تـا خــوارەوەی پشــتم، بێگومــان بینــی چــەندێك ئـارەقم کردبـۆوە، بـەلام دەتـوت بەلایـەوە گـرنگ نیە کە سەرمام ببێت.

براکەم وتی: "دایکە دەستم دێشێت."

"ئێســــتا دەڕۆینــــە خــــــوارەوەو ئێوە دەخەوێنم."

لـە خـوارەوە، لـە قـاتی خۆمـان سـێ کەسـی بەبێـدەنگی بـەم لاو ئـەولادا دەڕۆیشـتین. بـەر لــەوەی بچــمە نــاو جێگاکەمــەوە، بەبیجامــەوە چــووم بــۆ چێشــتخانەکە تــا پــەرداخێك ئــاو بخۆمـەوە، پاشـان چـووم بـۆ ژووری دانیشـتن. دایکــم خــەریك بــوو لەبــەردەم پەنجەرەکــەدا جگەرەی دەکێشا. کە گوێی لەدەنگم بوو وتـی:

"ئاوا بەپێی پەتی مەگەڕێ، سەرمات دەبێت، براکەت نوستووە؟"

"نووستووە. دایکە دەمەوێت شتێکت پێ بڵێم."

ئارامم گرت تا جێی خۆم لەنێوان دایکم و پەنجەرەکەدا بکەمەوە. کاتێ دایکم چووە دواوە و جێگەی بۆ کردمەوە، خۆم چەپاندە ماوەی نێوان ئەو و پەنجەرەکەو وتم: "باوکم چووە بۆ پاریس. دەزانیت کام جانتایەی بردووە؟"

دایکم هیچی نەوت. لە بێدەنگیی شەودا، تەماشای شەقامە بە باران تەڕبووەکەمان دەکرد.

ماڵی نەنکم لە دایکمەوە، ڕێك بەرامبەر مزگەوتی شیشلی بوو، نزیکی دوایین وێستگەی تراماوکە بوو بەر لە دوایین هێڵ. ئەمڕۆ مەیدانی شیشلی پڕە لە وێستگەی کۆستەرو پاصی مەسڵەحەو چەندین فرۆشگەی چەند قاتی داپۆشراو بە جۆرەها بەش و نیشانەو باڵەخانەی بەرزو ناڕێك و ناشیرینی فەرمانگەو بینای سەربازیی و کارمەندانی ساندەویچ بەدەست کە لە سەعاتەکانی نانی نیوەڕۆدا وەکو مێرولە لە شۆستەکاندا دێن و دەچن. ئەو سەردەمانە، گۆڕەپانی بەردڕێژ گەورە و هێمن بوو کە تا ماڵی ئێمە بە پێ یەك چارەك سەعات بوو. دەستی دایکمانمان گرتبووو بە ژێر دار تووو زەیزەفونەکاندا دەڕۆیشتین، دەتوت گەیشتووینەتە قەراغی شار.

خانوو بەردە چوار قاتەکەی نەنکم لە پاکەتی شقارتەیەك دەچوو کە لەسەر سەر وەستا بێت. لایەکی ڕووەو خۆرئاوا بوو، بە ئاراستەی ئەستەنبوڵی کۆن" لاکەی تریشی ڕووەو خۆر هەڵات بوو، ڕووەو باخە تووەکان و یەکەمین بەرزاییەکانی ئاسیا لەولایەی بسفۆڕ. نەنکم لەدوای مردنی مێردەکەی، لەپاش ئەوەی کە هەر سێ کچەکەی دابوو بە شوو، هێواش هێواش ڕاهاتبوو کە لە یەکێ لە ژوورەکانی ئەم ماڵەدا بژی کە لە سەرەوە تا خوارەوە مێزو سندوق و پیانۆ و یەك خەروار ئەساسی کۆنەو شڕو وڕ بوو. یەکێ لە پورەکانم کە گەورەترین خوشکی دایکم بوو، چێشتی بۆ نەنکم لێدەناو یان خۆی چێشتەکەی بۆ دەبرد یان قاپە خواردنەکەی بە شۆفێرێکدا بۆ دەنارد. نەنکم ئامادە نەبوو تەنانەت پێ بخاتە ژورەکانی تریش، کە توێژاڵێکی ئەستور لە خۆڵ و تەونی جاڵجاڵۆکە هەموو شوێنێکیانی داپۆشی بوو، ڕێکیان بخات، چ جای ئەوەی دوو قات بچێتە خوارەوەو چێشت بۆ خۆی لێبنێت. ئەویش، ڕێك وەکو دایکی خۆی کە دوایین ساڵەکانی تەمەنی بە تەنهایی لە ماڵێکی دارینی شیپڕێودا گوزەراند بوو، پاش تووش بوون بەم نەخۆشییە کوشندەو سەیرەی تەنهایی ڕێگەی نەدەدا کەیبانو یان خزمەتکارێك پێ بنێتە ئەوماڵەوە. هەر کاتێك دەچووینە سەردانی، دایکم ماوەیەکی زۆر زەنگی لێدەداو بەتوندی دەرگاکەی دەکوتی تا سەرئەنجام نەنکم دەسکی ژەنگگرتووی ئەو پەنجەرەیەی قاتی دووەمی دەکردەوە کە ڕووی لە مزگەوتەکە بوو، سەیری دەکردین. چاوانی باش نەیاندەبینی، هەربۆیە ناچاری

دەکــــردین بــــانگی لێبکـــــەین و دەســــتی بۆ بجوڵێنین.

دایکم دەیوت: "منداڵینە، لەبەر دەرگاکە بچنە دواوە تا نەنکتان بتوانێت بتانبینێت." خۆیشی تا ناوەڕاستی شۆستەکە لەگەڵمان دەهات، دەستی دەجولاندو هاواری دەکرد: "دایە منم لەگەڵ منداڵەکان. ئێمەین گوێت لەدەنگمانە؟"

لەو زەردەخەنە دڵگیرەی کە ڕوخساری نەنەی ڕوناك دەکردەوە تێدەگەیشتین کە ئێمەی بینیوەو ناسیوینیەتەوە. بەخێرایی دەگەڕایەوەو دەچوو لە ژوورەکە کلیلێکی گەورەی دەهێنا کە لە ژێر پشتییەکەی دایدەناو پاشان لە ڕۆژنامەیەکیەوە دەپێچاو لە پەنجەرەکەوە بۆی هەڵدەداین، منو براکەم پاڵمان بە یەکترەوە دەنا تا زوتر هەڵیگرینەوە.

ئەم جارەیان هێشتا دەستی براکەم دەئێشا" بۆیە هەولی نەدا کلیلەکە هەڵگرێتەوە، من ڕامکردو لە ناوەڕاستی شۆستەکەم هەڵگرتەوەو دام بە دایکم. دایکم بە زەحمەت کلیلەکەی لە کێلونەکەدا سوڕاند. هەموو پێکەوە قورسایی خۆمان خستە سەر دەرگاکە تا بە هێواشی کرایەوە، و لە تاریکیی ماڵەکەوە بۆنی کەڕو، بۆنی کۆنیو مانەوە هاتە دەرەوە. بۆنێك کە هەرگیز لە هیچ شوێنێکی تر هەستم پێ نەکردووە. پاڵتاوە یەخە پێستیو کڵاوە خورییەکەی باپیرم بە عەلاگەی تەنیشتی دەرگاکەدا هەڵواسرا بوو، نەنکم ئەوانەی بۆ ڕاونانی دز بەویادا هەڵواسیبوو، پۆتینەکانیشی لەلایەکی دەرگاکەدا دانابوو کە هەمیشە بەبینینیان دەترسام. لە دورەوە نەنکمانم بینی، لەسەر قادرمە تەختە تۆخەکە کە ڕاستەوخۆ دوو قات سەر دەکەوتە سەرێ، وەستا بوو. لە ناو ڕوناکییەکی سپییدا کە لە شوشەیەکی موشەجەری کۆن دەدرەوشایەوە، عەسا بەدەست، هەروەکو خێوێك لە نێو تارماییەکاندا وەستا بوو و نەدەجولا. دایکم لەکاتی سەرکەوتن بەو قادرمە ڕزیوەدا تەنانەت یەك وشەشی لەگەڵ دایکیدا نەوت. (جارەکانی دیکە کە دەچووینە سەردانی نەنکم، دەیوت: "دایە گیان چۆنیت؟ دڵم بۆتان تەنگ بوو بوو، دایە گیان."" لەسەر قادرمەکان، بەڕەسمی ئەو سەردەمە دەستی نەنکمم ماچ کردو خستمە سەر ناوچەوانم" هەولمدا چاوم بەو خاڵە گۆشتییە دەرپەڕیوەی سەر مەچەکی نەکەوێت. هەروەها زەندەقمان لە بینینی ئەو تاکە دانەی چوو بوو کە مابوی، هەروەها لە چەناگە درێژەکەیو مووەکانی دەموچاویشی، کاتێ چووینە ژورەکەوە، بە دایکمەوە نوساینو لەم لاو ئەولای ئەوەوە دانیشتین. نەنکم گەڕایەوە ناو سیسەمە گەورەکەی کە زۆربەی ڕۆژ بە ڕۆبی خەوەوە لەویا دەیگوزەراند، و بە نیگایەکی چاوەڕوانکراوەوە دەیوت: "خێرا بکەن سەر گەرمم بکەن!" بە ڕوماندا خەنایەوە.

دایکم وتی: "دایە گیان، ئاگردانەکەتان باش گەرم ناکات،" مەقاشەکەی هەڵگرتو ئاگردانەکەی پڕکرد لە دار.

نەنکم ساتێك وەستا. پاشان وتی: "ئێستا وازی لێبێنە. بڵێ بزانم هەواڵ چییە. دەنگوباسی دنیا؟"

دایکم وتی: "هیچ هەواڵێك نیە!"

"یـــانی هـــیچ شـــتێکت نییـــە بـــۆم باس بکەیت؟"

ماوەیـــەك بێـــدەنگ بـــووین، پاشـــان نەنکم پرسی:

"هیچ کەسێکت نەبینیوە؟"

دایکم وتی: "نەدایە، کەسم نەدیوە."

"بۆ خاتری خوا یانی هیچ شتێك نەبووە؟"

من وتم: "نەنە کوتایانین."

نـەنکم چاوە شینەکانی کـۆکردەوەو وتـی: "بەڕاست؟ ئازاری هات؟"

براکەم وتی: "دەستی من ئێشێت."

نـەنکم زەردەخەنەیـەکی کـردو وتـی: "وەی خوایە گیان!"

دیســان بـۆ ماوەیــەکی زۆر بێــدەنگ بـوو. مـن و براکـەم هەسـتاین و تەماشـای سـەر گـردە دورەکـــان و دارتوەکـــان و کولانـــەی بـــەتاڵی مریشـــکەکانمان کـــرد. نـــەنکم بـــە دەنگێکـــی پاڕانـەوە ئـامێزەوە لـە دایکمـی پرسـی: "یـانی هیچ هـەواڵێکت پـێ نیە بۆم بگێڕێتەوە؟ دەبوو بچیت بۆ قاتی سەرەوەی ماڵی خەسوت. کـەس سەر لەوێ نادات؟"

دایکـم وتـی: "دوێنـێ پاشـنیوەڕۆ دلڕوبـا خـانم لـەوێ بـوو." منداڵـەکان لەگـەڵ نـەنکیان یاری بزیکیان کرد.

نـەنکم کـە بـەم قسـەیە خۆشـی هـاتبوێ شـتێکی وت کـە دەمـانزانی دەیلێـت: "دلڕوبـا خانم لە کۆشکدا گەورە بووە!"

هەڵبەتـە دەمـانزانی کـە مەبەسـتی لـە "کۆشـك" دوڵماباخچـەیە، نـەك ئـەو کۆشـکە گەورەو بەهەیبەتـە ڕۆژئاواییانـەی کـە ساڵانێك وەسـفیانم لـە کتێـب و چـیرۆك و ڕۆژنامەکانـدا خوێندبۆوە.

زۆر دوای ئـەوە تێگەیشـتم کـە ئـەم قسـەیەی نـەنکم ئامـاژەی بەسـوك تەماشـاکردنی نەنکمـە بۆ ئـەم دلڕوبا خانمـە کـە گوایـە کـەنیزەك بـووە، واتە لە حەرەمسـەرای سـوڵتاندا کـەنیزەك بـووە، نـەك تـەنها دلڕوبا خـانم کـە گـەنجێتی خـۆی لـە حەرەمسەرادا گوزەراند بوو و پاشتر ناچاریان کـرد بـوو شـوو بـە بازرگانێـك بکـات، بـەڵکو دایکـی باوکیشـم کـە هاوڕێی ئەو بوو ئەویشـی سوك و بـێ بـەها دەکرد. پـاش ئـەوە، سـەرگەرم بـوون بـە قسـەکردن لـەبارەی بابەتێکـەوە کـە لـە هەموو یەکتربینینەکاندا بێ هیچ چەندو چۆنێك دەهاتـە ئـاراوە: نـەنکم هەفتـەی یـەك ڕۆژ بـە تـەنها لـە ڕیسـتۆرانتە بەناوبانگەکـەی عەبدولاّ ئەفەنـدی لـە ناوچـەی بیوغڵـو نـانی نیـوەڕۆی دەخـوارد، پـاش ئـەوە بـە درێـژی و بـە وردی ڕەخنـەی لـەو شـتانە دەگـرت کـە خواردبـوونی. سـێیەمین بابـەتی قسـەی هەمیشـەیی بـەم پرسـیارە ناکـاوەی نـەنکم دەهاتـە ئـاراوە: "منداڵینـە دایکتـان مەعدەنوسـتان بـۆ دەکاتـە چێشتەکانتانەوە؟"

پێشـتر دایکمـان پێـی وتبـووین، بۆیـە پێکەوە وتمان: "نەخێر نەنە، تێی ناکات."

نـەنکم، هـەروەك هـەموو جارێـك، بـۆی بـاس کردین کە بینیویـەتی پشـیلەیەك میـزی کـردووە بەسـەر مەعدەنوسـەکانی باخچـەیەکدا، پاشـان ئەوەشی بۆ زیاد کرد کە زۆر ڕێی تێ دەچێت ئـەو مەعدەنوسـە، بـێ ئـەوەی جـوان بیشـۆنەوە، کردبیتیانـە خـواردنی چ گەمژەیەکـەوە، پاشـان پێـی وتـین کـە چـۆن لەگـەڵ سەوزەفرۆشـەکانی

نیشانتاشـــــــی و شیشـــــــلیدا کـــــــه هێشـــتا مەعدەنوســیان دەفرۆشـت مشـتومڕی کـــردووەو قەناعـــەتی پێکـــردون کـــە ئیـــدی مەعدەنوس نەفرۆشن.

دایکم وتـی: "دایکـە، منداڵـەکان تاقـەتیان چووە دەیانـەوێت بگـەڕێن. چۆنە دەرگـای ئـەو ژوورەی ئەوبەری ڕاڕەوەکە بکەمەوە؟"

نـەنکم هـەموودەرگاکانی قفـڵ ئـەدا تـا دز نەچـێتە ماڵــەوە. دایکــم دەرگـــای ژوورێکـــی گـەورەو ساردی کـردەوە کـە بەسـەر هێڵـەکانی ترامـوادا دەیڕوانـی و بـۆ سـاتێك هـەر سـێکمان وەستاین و تەماشای قەنەفەو کورسیگەلێکمان کـرد کـە چەرچـەفی سـپیان بەسـەردا دابـوون، هــەروەها ســەیری دەســتە ڕۆژنامــەی زەردەوە بـــوو و ســـندوقگەلێك و چـــرا ژەنگگرتـــووە تۆزلێنیشتووەکانمان کـرد، هـەروەها تەماشـای دەســـتکی هەڵواســـراو و کوشـــنی ڕزیـــوی پاسـکیلێکی کچـانەمان کـرد کـە بەشـێوەیەکی ســـەیر بـــە سوچـــێکەوە هەڵپەســێردرا بـــوو. بـــەڵام ئـــەمجارەیان بەپێچـــەوانەی جارەکـــانی دیکـــــەوە کـــــە خۆشـــــحاڵتر بـــــوو و بەخۆشیەوە شتێکی لـە سنوقەکان دەردەهێناو پیشـــانی دەدایـــن و دەیـــوت: ("منداڵـــه خۆشەویسـتەکانم، دایکتـان کاتێـك بچـوك بـوو ئـەم قاپقاپانـەی لـەپێ دەکـرد." "سـەیر بکـەن، ئەمـــە سەرپۆشـــی قوتابخانـــەی پورتانـــە!" "کـــوڕە شـــیرینەکانم، دەتانـــەوێت دەغیلـــەی کـاتی منـداڵی دایکتـان ببیـنن؟") بـەڵام ئـەم جارەیـان ئەمانـەی نـەکرد، کاتێـك دەچـووە دەرەوە وتـــی: "ئەگـــەر ســـەرماتان بـــوو، بگەڕێنەوە بۆ ئەو ژورە."

مـن و براکـەم ڕامـانکرد بـۆ لای پەنجەرەکـەو سەیری ئەوبەری شـەقامەکەو وێستگەی چۆڵی نێـو گۆڕەپـانی تراموا‌کـەمان کـرد. ئـەوکات ڕاپـــۆرتی پێشـــبڕکێی کـــۆنی فوتبۆڵمـــان لـــە تـــوێی ڕۆژنامەکانـــدا خوێنـــدەوە. تۆزێـــك دواتــر، مــن وتم: "تاقــەتم چــوو. دەتــەوێت سەروژێر بکەین؟"

براکەم بێ ئەوەی سەری لەسەر ڕۆژنامەکە بـــەرز بکاتـــەوە وتـــی: "دیســـان ئـــارەزوی دۆڕانـــدنت هەســـتاوەتەوە؟ جـــارێ ڕۆژنامـــە دەخوێنمەوە."

لـــەپاش یارییەکـــەی شـــەوی پێشـــووەوە، بەیانییەکـــەی دوبـــارە یاریمـــان کردبـــۆوەو دیسانەوەیش براکەم لە منی بردبۆوە.

"تکا دەکەم."

"بەیـــەك مـــەرج. ئەگـــەر مـــن بردمـــەوە دوو وێنـەم بدەیتێ، خۆ گـەر تۆ بردتـەوە یـەك وێنـە زیاترت نادەمێ."

"نەخێر."

براکــەم وتــی: "دە مــن یــاری ناکــەم. وەك دەبینیت ڕۆژنامە دەخوێنمەوە."

بە خۆنواندنەوە ڕۆژنامەکەی بەرز کـردەوە، وەکـو ئـەو سـیخوڕە ئینگلیـزەی لـە فیلمـی ڕەش و سـپی کـە بـەم دواییانـە لـە سـینەمای فریشتە بینیبوومان. پاش ئەوەی ماوەیەك لە پەنجەرەکـەوە تەماشـای دەرەوەم کـرد، بڕیـارم دا مەرجـــەکانی براکـــەم قبـــوڵ بکـــەم. کۆمـــەڵێك وێنـــەی مرۆڤـــە ناودارەکانمـــان لـــە گیرفانمـان دەرهێنـا و یاریمـان دەسـت پێکـرد. سـەرەتا مـن دەمـبردەوە، بـەڵام دوایـی حـەوت وێنەی ترم دۆڕاند.

وتم: "بەم شێوەیە من هەمووی دەدۆڕێنم. یان وەکو ئەوسا یاری بکەین یان ئیتر من یاری ناکەم."

براکەم وەکو مەئەموری لێکۆڵیار بزوا و وتی: "باشە، بە هەر حاڵ من دەمویست ڕۆژنامە بخوێنمەوە."

چوومە کەنار پەنجەرەکەو بە وردی دەستم کرد بە ژماردنی وێنەکان: 121 وێنەم بۆ مابۆوە. دوێنێ، بەر لە ڕۆشتنی باوکم 183 وێنەم هەبوو! بۆ دەبوو ئەوەندە خۆم سەخڵەت بکەم؟ مەرجەکانی ئەوم قبوڵ کرد. سەرەتا چەند دەستم بردەوە، پاشان ئەو دەستی کرد بە بردنەوە. کاتێ ئەو وێنانەی کە لێمی بردبوونەوە لەسەر کۆمەڵە وێنە ئەستورەکەی خۆی دایدەنا، هەوڵیدەدا بەر بە خۆی بگرێت و پێنەکەنێت تا من تورە نەبمو هەڵنەچم.

تۆزێك دواتر وتی: "ئەگەر بتەوێت، دەتوانین بە جۆرێکی تر یاری بکەین. هەر کەس بردییەوە وێنەیەك هەڵبگرێت. ئەگەر من بردمەوە دەتوانم خۆم وێنەکە هەڵبژێرم، چونکە هەندێ لە وێنەکان تۆ هەتنو هەرگیزیش نایاندەیت بە من."

قبوڵم کرد. پێموابوو دەیبەمەوە. نەمزانی چۆن بوو کە سێ جار لەسەر یەك دۆڕانمو بەر لەوەی تێبگەم چی ڕوویداوە، دو دانە لە ژمارە 21 و گرتابۆگاکانمو یەك ژمارە 78ی سوڵتان فاروقم دۆڕاند بوو کە براکەم خۆیشی هەیبوو. دەمویست یەکسەر ئەوانەی لێ بەرمەوە، بۆیە بڕی گرەوەکەمان بردەسەرەوە. وای لێهات کە لە هەر دوو دەستە یاری، ژمارە 63ی ئەنیشتاین _کە ئەو نەیبوو_ ژمارە سێی مەولانا، ژمارە 100 سەرکیسی نازاریان _بونیاتنەری شەریکەی نوقڵو بنێشتی مامبۆ_ و ژمارە 51 کلیۆپاترام هەر زوو دۆڕاند.

تەنانەت نەمدەتوانی تفیش قوت بدەم. لەترسی ئەوەی نەکا فرمێسکەکانم بڕژێنە خوارێ، ڕامکرد بۆ لای پەنجەرەکەو دەستم کرد بە تەماشاکردنی دەرەوە. پێنج خولەك لەوەوپێش هەموو شتەکان چەند جوان بوون: تراموایەك کە لە وێستگاکەی نزیك دەبۆوە، تەلاری باڵەخانە دوورەکانی نێو داربەڕووە خەزان لێدراوە پاییزیەکان، ئەو سەگەی کە لە سەر بەردڕێژی شەقامەکە ڕاکشا بووو تەمەڵانە خۆی دەخوراند. خۆزگە کات دەوەستا. خۆزگە وەکو یاری ئەسپسواری، زارمان هەڵدەداو دەمانتوانی پێنج خانە بگەڕێینەوە بۆ دواوە، و ئیدی لەگەڵ براکەمدا "یاریی سەروژێرمان نەدەکرد.

بێ ئەوەی ناوچەوانم لەسەر چوارچێوەی پەنجەرەکە هەڵگرم وتم: "وەرە جارێکی تر یاری بکەین."

براکەم وتی: "یاری ناکەم، تۆ ئەگریت."

چووم بۆ لای و بە پەرۆشەوە وتم: "سوێند دەخۆم کە نەگریم، جواد. بەس وەرە عادلانە یاری بکەین، وەکو یەکەم یاری."

"من خەریکم ڕۆژنامە دەخوێنمەوە."

وتم: "باشە." وێنەکانم، کە تا دەهات کەمتر دەبۆوە، تێکەڵکردوو بڕم لێدا وتم: "هەروەکو دوایین کەڕەت یاریمان کرد، سەر یان ژێر؟"

براکەم وتی: "بەڵام بێ گریان. زۆر باشە، سەر."

من بردمەوەو ئەو یەک مارشاڵ فەوزیی چاکماکی دامێ. من قبوڵم نەکرد. "تکایە ژمارە 78 سوڵتان فاروقم بدەرێ."

براکەم وتی: "نەخێر. بڕیارمان وانەبوو."

دوو سوڕی تریش یاریمان کردو من دۆڕاندم. نەئەبوو سوڕی سێیەم یاریم بکردایە. بە دەستی لەرزیووەوە ژمارە 49کەی خۆم، ناپلیۆنم دایێ.

وتی: "من ئیتر یاری ناکەم."

لێی پاڕامەوە. دوو کەڕەتی تریش یاریمان کرد. کاتێک دۆڕاندم، جا لەبری ئەوەی ئەو وێنانەی بدەمێ کە داوای دەکردن هەرچی لە وێنەکانم مابۆوە هەموو هەڵدا بەسەروچاویدا هەموو مەی وێستیتە ژمارە 28 ەکانو ژول ڤێرنە ژمارە 82ەکان، سوڵتان محەمەد فاتیحە ژمارە حەوتەکانو شاژنە ئەلزابێسە ژمارە70کانو، سیلاسالکە ڕۆژنامەنوسە ژمارە41 ەکانو ڤۆڵتێرە ژمارە 42ەکان، کە بیرم لە یەک بەیەکیان کردبۆوە زۆر بە زەحمەت توانیبووم بیانشارمەوە و دوو مانگو نیو کە ڕۆژ بەڕۆژ کۆم کردبوونەوە، هەموو وەکو پەپولە بە ئاسماندا کەوتنە باڵەفڕەو بە چەشنێکی خەماوی کەوتنەوە سەر زەوی.

خۆزگە مرۆڤێکی تر بومایەو لە شوێنێکی تر بژیامایە. گەڕامەوە بۆ لای ژورەکەی نەنکم، پاشان سوڕامەوەو بێدەنگ بە قادرمە ڕزیوەکاندا چوومە خوارەوە، لەبیری یەکێ لە خزمە دورەکانماندا بووم ، بازاڕدۆزێکی بیمە بوو و خۆی کوشت. دایکی باوکم بۆی باس کرد بووم ئەو کەسانەی خۆیان دەکوشت مەحکوم بوون بەوەی لە ژێر زەویی لە جێگەیەکی تاریکدا بمێننەوەو ناتوانن بچن بۆ بەهەشت. گەیشتبوومە نزیک پلەکانی خوارەوەی نەردەوانەکە، ئیستێکم کردو لە تاریکییدا وەستام. پاشان دوبارە سوڕامەوەو دیسان بە قادرمەکاندا سەرکەوتمەوە سەرێو لەسەر دوایین پلە، لە تەنیشت ژورەکەی نەنکم، دانیشتم.

گوێم لێ بوو نەنکم دەیوت: "من کە وەکو خەسوت دەوڵەمەند نیم. تۆ دەبێت منداڵەکانت گەورە بکەیتو چاوەڕێ بیتو بەس."

دایکم وتی: "بەڵام دایکە، دیسان تکات لێ دەکەم، من دەمەوێت بەمنداڵەکانمەوە بگەڕێمەوە بۆ ئێرە."

نەنکم وتی: "تۆ ناتوانیت بە دوو کوڕەوە لەم ماڵە وێرانو تەپوتۆزاویەدا بمێنیتەوە."

"بەڵام دایکە، بیرت نیە کە لە ساڵانی کۆتایی تەمەنی باوکمدا، دوای ئەوەی خوشکەکانم شویان کردو ڕۆشتن، سێ کەسی چەند دڵخۆشو بەختەوەر پێکەوە لێرە دەژیاین!"

نەنکم وتی: "مەبرورە، دڵەکەم، ئەبێت بەم ڕۆژگارە لە نێو گۆڤارە کۆنەکانی باوکتدا بگەڕێیت."

پێیان دەڵێم سۆپە گەورەکەی قاتی خوارەوەش دابگیرسێنن، دوو ڕۆژەو هەموو خانووەکە گەرم دەبێت."

نەنکم وتی: "بەر لەوەی ببیتە ژنی ئەو، بەتۆم وت چ جۆرە مرۆڤێکە."

"کرێکارێك دەگرمو لە ماوەی دوو ڕۆژدا لە شەڕی هەموو خۆڵو تۆزی ئەم ماڵە ڕزگارمان دەبێت."

نەنکم وتی: "ڕێگە نادەم هیچ کارەکەرێکی دەڵەقۆڕ پێ بنێتە ئەم ماڵەوە. ئەمە جگە لەوەی شەش مانگی پێ دەچێت تابتوانیت ئەم ماڵە پاك بکەیتەوەو لە دەست ئەم هەموو جاڵجاڵۆکەیە ڕزگارت بێت. تا ئەو کاتەیش مێردە سەرسەختەکەت گەڕاوەتەوە."

دایکم وتی: "ئەمە دوایین قسەتانە؟"

"مەبرورە، ئەزیزم، ئەگەر تۆو منداڵەکانت بێنە ئێرە، منو تۆ چۆنچۆنی لەگەڵ یەك دەگونجێین؟"

"ئاخر دایە گیان، من چەند جار تکام لە ئێوە کردو پاڕامەوە کە موڵکی بەبەك، بەر لەوەی کە دەوڵەت داگیری بکات بفرۆشیت؟"

"من ئامادە نیم بڕۆم بۆ دائیرەی تاپۆ و ئیمزا لەژێر ناوەکەمدا بکەمو وێنەی خۆم بدەم بەو پیاوە نەفرەتییانە."

دەنگی دایکم کە تەواو بەرزبووبۆوە، وتی: "بەڵام دایکە، من پارێزەرم بۆ ناردن تا ناچار نەبن خۆتان ئەو کارە بکەن."

نەنکم وتی: "من هیچ متمانەیەکم بەو پارێزەرە نەبوو. لە بیچمو بۆدیا دیار بوو کەڵەکچی بوو، تەنانەت دڵنیا نەبووم کە بەڕاستی پاریزەر بێت. دەنگیشم بەسەردا بەرز مەکەرەوە."

دایکم وتی: "باشە، ئیدی هیچ ناڵێم." پاشان ئێمەی بانگ کرد: "منداڵینە! ئامادە بن، خێرا بکەن، دەڕۆین."

نەنکم وتی: "سەبرکەن، بۆ کوێ دەچن؟ هێشتا لەبارەی هیچ شتێکەوە قسەمان نەکردوە."

دایکم بەهێواشی وتی: تۆ ئێمەت ناوێت."

"ئەمە بگەرەو چەند چکلێتێك بۆ منداڵەکان بکرە."

دایکم وتی: "نابێت بەر لە نانی نیوەڕۆ، چکلێت بخۆن." و لەدوای منەوە هات بۆ ژوورەکەی ئەوبەری ڕاڕەوەکەو وتی: "کێ ئەم وێنانەی پەرش و بلاوکردۆتەوە؟ خێرا کۆیان بکەرەوە." پاشان بە براکەمی وت: "تۆش یارمەتی بدە."

بێدەنگ وێنەی مرۆڤە ناودارەکانی سەرزەویەکەمان کۆکردەوە، دایکم سندوقە کۆنەکانی کردەوەو تەماشای جلوبەرگەکانی سەردەمی منداڵی خۆی، جلە کۆنەکانی، جلوبەرگە پانو پۆڕەکانی و هەموو شتەکانی دیکەی نێو سنوقەکەی دەکرد. تۆزو خۆڵی ژێر قاچەکانی مەکینەی خەیاتییەکە چووە چاومەوەو فرمێسك بە چاوانمدا هاتە خوارەوە.

کاتێك لە دەستشۆرێکی بچوکدا دەستمان دەشت، نەنکم بە دەنگێکی هێمنو پاڕانەوە ئامێزەوە وتی: "مەبرورە، ئەم قوریە، کە ئەوەندەت حەز لێیە، بۆچی هەڵیناگریت؟" باپیرم ـخوا لێی خۆش بێت، چ پیاوێکی نازدار بووـ کاتێك کە فەرمانڕەوای دیمەشق بوو ئەو قوریەی بۆ دایکم کری. لەو سەری دنیاوە هاتووە، لەچینەوە هاتووە. هەڵیگرە، تکا دەکەم."

دایکم وتی:

"دایە گیان، من هیچم لە ئێوە ناوێت. تا قوریەکەت نەشکاندووە بیخەرە ناو کەوانتەرەکەوە. خێراکەن منداڵینە، دەستی نەنکتان ماچ بکەن."

نەنکم کە دەستی درێژ کرد بوو تا ماچی بکەم، وتی: "مەبرورە، ئازیزم، تکایە لە دایکە داماوەکەت تورە نەبیت. تکا دەکەم، دەپاڕێمەوە، بەتەنها جێم مەهێڵن، سەرم لیٚ بدەن."

بەخێرایی لە پلیکانەکان چووینە خوارەوەو بە هەر سێکمان دەرگا ئاسنەکەمان ڕاکێشاو کردمانەوە. خۆرەتاوی پرشنگدار چاومانی شوشتەوەو سیەکانمانی پڕ کرد لە هەوای تازە.

نەنکم لە سەر پلیکانەکانەوە هاواری کرد: "وریا بن دەرگاکە باش دابخەن! ئەم هەفتەیە سەرم لێبدەنەوە، باشە؟"

دەستی دایکممان گرتبوو و بە بێدەنگی لەویٚ دور دەکەوتینەوە. لە ناو ترامواکەدا بێدەنگ دانیشت بووین و گوێمان بۆ دەنگی کۆکەی موسافیرەکانی دیکە هەڵخست بوو تا ئەوەی کە ترامواکە کەوتەڕیٚ. کاتیٚ جولاٚ، من و براکەم بەبیانوی ئەوەی کە دەمانەوێت لە شوێنێکدا دانیشین کە کارمەندی بلیتەکە ببینین ڕیزێك چووینە پێشەوەو دەستمان کرد بە یاری (سەر یان ژێر). ئەو متمانەیەی بەخۆمم بەدەست هێنا وایکرد کە برێك ببەمەوەو دیسان دەست بکەمەوە بە دۆڕان. لەوێستگای عوسمان بەگ، براکەم مەرجەکانی یارییەکەی گۆڕی: "ئەگەر من بردمەوە، باقی وێنەکانی تۆ دەبنە هیی من، خۆ ئەگەر دۆڕاندم، تۆ پانزە وێنە بە هەڵبژاردنی خۆت لە من وەردەگریت."

یاریمان کرد. من دۆڕاندم. بەهێواشی دوو دانە وێنەم بۆ خۆم هێشتەوەو هەموو ئەوانی تری دەستە وێنەکەم دا بەو. ڕیزێك گەڕامە دواوەو لە تەنیشت دایکمەوە دانیشتم. نەگریام، کاتێك ترامواکە خێرا دەبوو، و بە ئارامی دەینالاٚند، وەکو دایکم غەمگین لە پەنجەرەی ترامواکەوە تەماشای دەرەوەم دەکرد، تەماشی ڕۆشتنی هەموو ئەو مرۆڤو شوێنانەم دەکرد کە ئێستا ئیدی نەماون _فرۆشگەی بەرگدورینی پڕ لە بەکرەی دەزوی ڕەنگاوڕەنگ و قوماشی ئیستیرادی ئەوروپی، چەرداخ و سایەبانی کاڵەوەبووی بەر خۆرو بارانی فرۆشگەی فرنی شیرینی فرۆشی بەخۆیان و پەنجەرە تەمگرتووەکانیانەوە، ئەو نانەواخانانەی کە نانی گەرمیان بە ڕێك وپێکی لەسەر ڕەفەکانیان سەفتە کردبوو، سەرای دڵگیری سینەمای "تان" کە فیلمگەلێکمان سەبارەت بە ڕۆمای کۆن تێدا دەبینی پڕ بوو لە کەنیزەگەلێك کە جوانتر بوون لە خواوەندەکان، چەند منداڵێکی وێڵ و بیٚ خاوەن کە لە بەردەم سینەمادا کتێبی دەستی دوویان دەفرۆشت، خاوەنی ئەو سەرتاشخانەیەی کە جوتیٚ سمێڵ و مقەستێکی نوك تیژی هەبوو کە هەمیشە منی دەترساند، و کابرای شێتی نیوەڕوتی گەڕەك کە هەمیشە لەپاڵ دەرگای سەرتاشخانەکەدا دەوەستا.

لە وێستگەی حەربیە لە ترامواکە دابەزین. کاتێك بەپیٚ بەرەو ماڵەوە دەڕۆیشتین،

بێدەنگیی براکەم تورەی کردم. ئەو وێنەیەی لیندبێرگ کە لەناو گیرفانمدا شاردبوومەوە دەرمهێنا. یەکەمجار بوو براکەم دەیبینی، بە سەرسامی و باوەڕنەکردنەوە نوسینەکەی خوێندەوە: "ژمارە 91، لیندبێرگ. لەگەڵ ئەو فڕۆکەیەی کە بەهۆیەوە بەسەر ئۆقیانوسی ئەتڵەسیدا فڕی. ئەوەت لەکوێ بوو؟"

وتم: "من دوێنێ خۆم نەکوتا. زوو لە قوتابخانە گەڕامەوەو باوکم بەر لەوەی کە بڕوات بینیم، باوکم بۆی کڕیم."

براکەم وتی: "مانای ئەوەیە کە نیوەی هی منە. تازە، دوایین دەست کە یارییمان کرد لەسەر هەموو وێنەکانی تۆ بوو." هەوڵیدا وێنەکە لە دەستم بفڕێنێت، بەلاّم بەئەندازەی پێویست چاپوك نەبوو. مەچەکمی گرت و بایدا. شەقێکم لە قاچی هەڵداو پەلاماری یەکترمان دا.

دایکم هاواری کرد: "بەسە! وتم بەسە! لە ناوەڕاستی جادەداین!"

وازمان لە لێدان هێنا. پیاوێك بە چاکەت و پانتۆڵ و بۆینباخ و ژنێك بە کلاّوێکی گەورەوە بە تەنیشتماندا تێدەپەڕین، لەوەی کە لەبەرچاوی خەڵك شەرمان کرد بوو تەریق بوو بووینەوە. براکەم دوو هەنگاو چووە پێشەوەو کەوتە سەر ئەژنۆ. قاچی خۆی گرتبوو: ناڵاندی: "زۆر دێشێت."

دایکم لە ژێر لێوەوە وتی: "هەستە. ئەڵێم هەستە. خەڵکەکە هەموو سەیرمان دەکەن."

براکەم هەستا و وەکو پاڵەوانێکی بریندار فیلمە حەربییەکان دەستی کرد بە شەلین. نیگەران بوو بووم نەکا بەڕاستی زەبری بەرکەوتبێت، بەلاّم لەلایەکەوە فێنکایی بەدڵمدا دەهات کە ئەوم بەم حاڵەوە دەبینی. پاش ئەوە ماوەیەك بەبێدەنگی ڕۆیشتین، براکەم وتی: "ڕاوەستە با بگەینە ماڵەوە بەقوربانت دەبم."

پاشان ڕویکردە دایکم و وتی: "دایکە عەلی خۆی نەکوتاوە."

"با، دایکە، خۆم کوتاوە."

دایکم هاواری کرد: "بێدەنگ!"

گەیشتبووینە بەرامبەر باڵەخانەکەی خۆمان" هێندە نەبێت کە دەبووایە لە شەقامەکە بپەڕینایەتەوە. ڕاوەستاین تا ئەو تراموایەی کە لە ماچکاوە دەهات تێپەڕێت و ئینجا لە شەقامەکە بپەڕینەوە. هەر یەکسەر لە دوای ترامواکەشەوە گەلاّبەیەك و دوای ئەویش ئۆتوبوسی باشیکتاش و پاشان ئوتومبیلیکی دیستۆی وەنەوشەیی کاڵ لە شەقامەکە تێپەڕین. لەو کاتەدا بوو کە سەرنجمدا مامم لە پەنجەرەکەوە ڕاماوەتە شەقامەکە. ئێمەی نەبینیبوو، سەیری ئەو ئوتومبیلانەی دەکرد کە تێدەپەڕین. چەند خولەکێك بەوردی تەماشایم کرد.

ماوەیەك بوو کە ئیدی ئوتومبیل بە شەقامەکەدا تێنەدەپەڕی. کاتێك گەڕامەوە لای دایکم تا بزانم بۆچی دەستی نەگرتووین و لە شەقامەکە نەیپەڕاندوینەتەوە، بینیم خەریکە بە بێدەنگ دەگری.

**سەرچاوە:**

*http://dibache.com/text.asp?cat=3&id=128*

# جیلْ کیبلْ و فێندەمێنتالیزمی ئیسلامی

هاشم سالْح

لە عەرەبییەوە: شوان ئەحمەد

جارێکی تر "جیلْ کیبلْ" ئەوە دەسەلمێنێ کە یەکێکە لە پسپۆڕە گرنگەکانی بواری بزاوتە ئسولّیە ڕادیکالیەکان، نەك هەر لە سەر ئاستی فەرەنسا، بەلْکو لە سەر ئاستی جیهانیش. دوای کتێبە قەوارە گەورەکەی دەربارەی (جیهاد) کە تیایدا باسی لە هەلْکشان و تەشەنەسەندن و پاشان داکشان و گلۆر بونەوەی بزاوتە ئسولْیەکانی کردبوو، ئێستا بە کتێبێکی نوێوە دێتەوە مەیدان. ئەم کتێبە تەواوکەری کتێبی پێشویەتی، بەلاّم لەمەیاندا پڕکێشی زیاتر دەکات، بە تایبەت کاتێك ئەو گۆڕانکاری و ڕووداوە تازانە لەبەرچاو دەگرێت کە لە دوای سالّی 2000 ڕویانداوە. شایەنی باسە سالّی 2000 بەرواری دەرچونی کتێبی (جیهاد)ە. ئەلْبەتە گرنگترین ڕوداوێکیش دوای ئەو مێژووە، 11 سێپتەمبەرە. بەلاّم دەتوانین" ئاداری مەدریدیشی سەربار بخەین، چونکە لەو ڕۆژەدا فێندەمێنتالستەکان تاوانێکی قێزەونیان لە ژێر ناوی (پەلاماری ئەندەلوس)دا ئەنجام دا".

لەم کتێبەیدا "کیبلْ" هەولْی ئەوە دەدات هۆکاری ئەو روداوە لە هەموو لایەکیەوە تاوتوێ بکات و خوێندنەوەیەکی قولْ بۆ ئەو مەسەلەیە بکات. لەم پێناوەشدا لەو هۆکارە ناوخۆی و دەرەکیانە دەپێچێتەوە کە بووە مایەی ئەو هێرشە تیرۆریستیەی نەك بە تەنها ولاّتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، بەلْکو هەموو جیهانی هەژاند. بۆ ئەوەی بگاتە ئەمەش، "کیبلْ" لەو دۆخە ناهەموارە دەکۆلْێتەوە کە پاش شکستی ئۆسلۆ بەسەر کێشەی فەلەستین – ئیسرائیل دا دێت. هاوکات لە هۆکاری هاتنە پێشی موحافیزکارە نوێیەکانیش دەکۆلْێتەوە کە چۆن لە واشنتۆندا گەیشتنە لوتکەی دەسەلاّت و ئەمەش ناودەنێت

(شۆڕشی موحافیزکاره نوێیەکان). لە ڕاستیدا ئەوانە موحافیزکاران نین، لەبەرئەوەی موحافیزکار کەسێکە پارێزگاری لەو هەلومەرجە دەکات کە لە ئارەدایە و هەرگیز ناخوازێت بیگۆڕێت، بەلاّم موحافیزکارە نوێیەکانی ئەمریکا دەیانەوێت هەموو دنیا بگۆڕن، بە تایبەت ناوچەی خۆرهەلاّتی ناوەڕاست. کەواتە چۆن دەتوانین ناوی موحافیزکارانیان لێ بنێین؟

هەرچۆنێك بێت ئەم ناوە بەوانەوە لکاو ئێستا بەسەر زمانی هەموانەوەیەو ناشکرێت بگۆڕدرێت. بێگومان بەرپرسیارێتی موحافیزکارەکان بەتایبەتیش بەرپرسیارێتی "ریچاردبێلْ" لە ئالۆزبونی زیاتری بارودۆخی خۆرهەلاّتی ناوەڕاستدا، شتێکە نکولّی لێناکرێت. بەشێکی زۆری ئەم کتێبەی "کیبلْ" تەرخانە بۆ باس و خواسی بزاوتە ئسولّیە ڕادیکالەکان، بەلاّم لەگەلْ ئەوەشدا بیری نەچووە باسی هەلومەرجی ئەمڕۆی عێراقیش بکات کە تەواوی جیهانی بەخۆیەوە سەرقالْ کردووە. چارەنووسی یەکلایکردنەوەی کێشەی عێراق، ڕەنگە ناوچەکەو تەواوی جیهانیش بگۆڕێت، چونکە هێزە فاشستی و تاریکەکان لەوێدا لە شەڕێکی بێئامانداندان لەگەلْ هێزە پێشکەوتوخوازو هیومانستیەکاندا. بەر لەوەی باس لە تێزە سەرەکیەکانی ئەم کتێبە بەنرخە بکەم، ناونیشانی نەسکەکان بەرچاو دەخەم، بۆ ئەوەی خوێنەر زانیاریەکی دەربارەی قەوارەی گشتی کتێبەکە هەبێت. دەسپێکی کتێبەکە دوای پێشەکی بەم ناونیشانەیە: (شکستی ڕێکەوتنامەی ئۆسلۆ).

دوای ئەوە شەش بەشی دیکە دێت لەگەلْ پاشەکیەکدا. ناونیشانی یەکەمین بەش ئەمەیە: (شۆڕشی موحافیزکارە نوێیەکان). تیایدا نوسەر کورتە باسێکی مێژویی دەربارەی هەلْکشانی ئەم ئاقارە فیکریە – سیاسیە لە ولاّتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا پێشکەش دەکات، هەر لە شەستەکانی سەدەی ڕابردووەوە تا ڕۆژگاری ئەمڕۆمان. ئەم ئاقارەش دابڕانێکی گەورەی لە سیاسەتی دەرەوەی ئەمریکادا دروستکرد، سیاسەتێك کە لەسەر کاری دیبلۆماتی شێلگیرانەو واقعبینی "هنری کیسنجەر" و "جۆرج بۆش" و "کۆلن پاولْ" دامەزرابوو، بەلاّم لەگەلْ هاتنی موحافیزکارە نوێیەکاندا، سیاسەتی دەرەوەی ئەمریکا پێدەنێتە قۆناغێکی تازەوە، ئەویش قۆناغی گۆڕینی هاوسەنگی هێزە لە خۆرهەلاّتی ناوەڕاستدا، بە زۆر و بە زەبری هێز، وەك چۆن "ڕۆنالد ریگان" بە زەبری هێز، ئیمپراتۆریەتی شەڕی لەناوبرد. تا ئێستاش سەرکێشی موحافیزکارە نوێیەکان لە عێراقدا بەردەوامە و درێژەی هەیە، سەرەڕای چاکە و خراپەکانی. ئەمانە پێیان وایە دەبێت هێزی لە بن نەهاتووی ئەمریکا لە پێناو بلاّوکردنەوەی دیموکراسیدا بەسەرتاسەری جیهاندا، بە گەڕ بخرێت. نەسکی دووەمی ئەم کتێبەش ئەم ناونیشانەی هەیە: (لێدانی دوژمنی دوور). ئەم دەستەواژەیە لە کتێبێکی کەسی دووەمی ناو قاعیدە و تیۆرسینی سەرەکی بزاوتە ڕادیکالّییە توندڕەوەکان "ئەیمەن زەواهری"یەوە وەرگیراوە. لێرەدا "کیبلْ" شیکاریەکی وردی کتێبی (فرسان تحت رایة النبي) "ئەیمەن

زەواهری" دەکات و تەنانەت تێزە سەرەکیەکەی خۆشی لەسەر دادەڕێژێت. پوختەی تێزەکەشی بەمجۆرەیە: فێندەمێنتالیستە خوێن ڕێژەکان دوای ئەوەی لە گۆڕینی بارودۆخی ناو وڵاتانی عەرەبی نائومێدبوون و نەیانتوانی دوژمنی نزیك – واتە رژێمە حوکمڕانەکان – ڕامالن، بڕیاریاندا دەست لە دوژمنی دوور واتە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بوەشێنن، چونکە ئەمانە ئەمریکا بەوە تاوانبار دەکەن کە پشتیوانی لە دەسەڵاتدارانی وڵاتانی ئیسلامی دەکەن. ئەم بۆچونە ئەگەرچی سەر لەبەر ڕەتی ناکەمەوە، بەڵام دەبێت بڵێم کە زۆریش قەناعەتی پێنەهێنام. بەڵام من ئەو بۆچونەی ترم بەلاوە چاکترە کە هەر لەم کتێبەدا هاتووەو دەڵێت: دوای ئەوەی موجاهیدە ئەفغانییەکان بەسەر لەشکری سوردا سەرکەوتن و وڵاتیان لێپاککردنەوە، ئەمەش بووە هۆی هەرەسهێنانی یەکیەتی سۆڤیەت، "بن لادن" و "زەواهری" و ئەوانەی وەك ئەوان وان، پێیان وابوو ئەوان ئیمپراتۆریای کۆمۆنستیان روخاندووە، لەپای ئەمەشدا پێیان وابوو دەتوانن ئیمپراتۆریایەکی دیکەش بروخێنن: واتە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا. بەڵام ئەمانە ئەوەیان لە بیرچوو کە ئەمریکا یەکیەتی سۆڤیەت نییە. سەروەختێك ئسولێیەکانی قاعیدە دەستیان لێوەشاند، ئەمریکا لە دۆخی هەڵکشان و ئەوپەڕی هێز و دەسەڵاتدا بوو، لە کاتێکدا یەکیەتی سۆڤیەت لە دۆخی لەبەریەکهەڵوەشانەوەو گلۆربوونەوەو کوژانەوەدا بوو. بەڵام ئەمانە لەبەرئەوەی ئەقڵیەتیان ئەقڵیەتێکی غەیبیانی و یۆتۆبیستانەیە، بۆیە نەیانتوانی لە بزاوتی مێژوو تێبگەن و لە هاوکێشەی هێز لە جیهانیشدا حاڵی بن. پاشان پێیان وابوو – بە هێزی لێکدانەوەکەی کیبل یش لێرەدایە –، دەستوەشاندن لە ئەمریکا لە گەرمەی ڕاپەڕینی دووەمدا، وا دەکات جەماوەری جیهانی ئیسلامی و عەرەبی جۆش بدات و بکەونە شوێن ئەمانە. ئەم بیرکردنەوەیە تا رادەیەك بیرکردنەوەیەکی ئەقلانییە و لە سەرەتاشدا ئەوەی ویستیان بۆیان هاتەدی. بەڵام زوو بە زوو ئەو شەڕەیان دۆڕاند، دوای ئەوەی جەماوەری عەرەبی و ئیسلامی لێیان تەکینەوە.

ڕێکخراوی قاعیدە دوای ئەو ڕووداوە فیتنەو ئاشوبێکیان لە ناو جیهانی ئیسلامیدا دروستکرد و خەڵك بوون بە دوو بەشەوە: ئەوانەی لایەنگربوون لەگەڵ ئەوانەی دژیان بوون. لەناو ئەوانەی دژیان بوون کەسانی ئسولی میانڕەو یاخود ئەقلانیان تێدایە، وەکی "یوسف قەرزاوی" و کەسانی دیکەش. "قەرزاوی" و زۆربەی فەقیهە گەورەکان، بە ئاشکرا سەرکۆنەی پەلامارەکانی 11ی سێپتەمبەریان کرد. ئەگەرچی "بن لادن" و گروپەکەی ئەمانە تاوانبار دەکەن بەوەی لە خزمەتی دەسەڵاتدان و لە ڕژێمە حوکمڕانەکانەوە نزیکن، بەڵام جەماوەری ئەمان هیچی لە جەماوەری قاعیدە کەمتر نییە، ئەگەر زیاتر نەبێت. بەهەرحاڵ "بن لادن" توانی فیتنەیەك لەناو جیهانی ئیسلامیدا بنێتەوە کە تا ئێستاش بە دەستیەوە گیرۆدەین و قوتارمان نەبووە لێی. نەسکی سێیەمی کتێبەکە باس لە چۆنیەتی ڕاوەدونانی قاعیدە دەکات لەلایەن

ئەمریکاییەکانــــەوە، ئەگەرچـــی تـــا ئێســـتا نــەیانتوانیوە بــە یــەکجارەکی لــەناویان بــەرن. بەڵگەش بۆ ئەمە ئەوەیە کە دوای دوو ساڵ و نیو لە پەلاماردانەکانی 11 سێپتەمبەر، خۆیان ڕێکخســتەوەو تەقینــەوەکانی نــاو مەدریــدیان ئەنجامــدا. ئەمـــەش گـــەورەترین پـــەلاماری تیرۆرسـتیە کـە تـا ئێسـتا لـە ئـەورووپادا ڕووی دابێـــت، لەبەرئـــەوەی قوربانیـــەکانی نزیکـــەی دووســـەد کەســـێك دەبـــوون، لەگـــەڵ هـــەزاران بریندار و کەم ئەندام.

نەسـکی پێنجـەم تەرخانــە بـۆ بـارودۆخی عێــراق و نەسـکی شەشـەمیش کـە دوا بەشــی کتێبەکەیـە بـاس لـە (شـەڕی ئـەورووپا) دەکـات، واتە باس لەو جەنگە دەکات کە ئێستا لە نێوان دووئاقـار لـە ئیسـلامی ئەورووپایـدا لەئارەدایـە: ئاقارێکیـــان لەگـــەڵ کرانـــەوەو مۆدێرنـــەدان و ئاقارەکـــەی دیکەشـــیان دۆگمـــا و داخـــراون. دواجـار پاشـەکی کتێبەکـە بـەم سەرباسـە دێتـە کۆتایی: (لەودیوی جیهاد و ئاشوبەوە). هەست بە ڕوگیری دەکەم کاتێك نەسك بە نەسکی ئەم کتێبە هەڵدەدەمەوە، بەبێئەوەی بتوانم بچمە ناو لێکدانـــەوە قـــوڵ و چـــڕ و پڕەکـــانی "جیـــڵ کیبڵ"ەوە، ئەویش بەهۆی کەم دەرفەتیـەوە. من پێموایـە هـەر بەشـێکی ئـەم کتێبـە پێویسـتی بـە ڕەشکردنەوەی چەندین لاپـەڕە هەیـە، بـۆ ئـەوەی تێزەکـەی شـرۆڤە بکـەین و ڕەخنـەی لێبگـرین. ئەگەر ئەمە بۆ بەشێکی بێت، دەبێت بۆ تـەواوی کتێبەکە بڵێین چی؟ بەڵام هیوادارم زوو بە زوو وەربگێڕدرێتـە سـەر زمـانی عـەرەبی و ئـەو کـات خوێنـەرانی ئێمـە دەتـوانن بـە چـاکی سـود لـە تێزەو بۆچونە مەعریفیەکانی ببینن.

من هاوڕام لەگەڵ ئەو بۆچونەی نوسـەردا کـە دەڵێت: (ئەو شەڕەی ئێستا لـە ئـەورووپادا هەیـە، شـــەڕێکە لـــە نێـــوان ئیســـلامی ڕۆشـــنگەری و مۆدێرنـە لەگـەڵ ئیسـلامی تـاریکی و پەرگیریـدا. ئەم شەڕەش کاریگەری گـەورەی لەسـەر وڵاتـانی ئیســلامی دەبێــت و هــەر بــە تــەنها کاریگــەری لەســـەر ڕەوەنـــدی ئیســـلامی لـــە ئـــەورووپا جێناهێڵێـت. ئـەو هەرایـەی بـەم دواییانـە لەسـەر مەسـەلەی حیجـاب لـە فەرەنسـا ڕویـدا، دواتـر دەرەنجامی پۆزەتیڤانەی دەبێت. پێویستە ئـەوە بـزانین کـە سـەربەخۆیی فیکریـی وەختێك دێتـە دی کە مشتومڕی گـەرم و بێئامـان ڕوبـدات، ئـەم پرۆسـەیەش بێتـە مایـەی ڕونکردنـەوەی ئەسـڵی کێشەکان بە شێوەیەکی چاکتر و ڕەوانتر.

لێرەدا دەبێت بڵێین، پێویسـتە "جیـڵ کیبـڵ" ڕۆڵــی ئاقـاری ڕۆشـنگەری و مۆدێرنـە لـە نـاو وڵاتـــانی ئیســـلامیدا لەبـــەر چـــاوبگرێت و فەرامۆشـــیان نـــەکات، چـــونکە لـــە وڵاتـــانی ئیسـلامیدا ئەوانـەش هـەن، ئەگەرچـی دەنگیـان وەك دەنگــی فێندەمێنتالسـتەکان بـەرز نییـــە و هەموو کەس گوێبیستیان نابێت. کەواتە دەبێت کۆك بین لەسەر ئەوەی کە ڕۆشنگەری لەناوخۆو دەرەوە دێـت، نـەك تـەنها لـە دەرەوە بێـت. بـەڵام ئـەوە ڕاسـتە کـە ڕۆشـنگەرانی ئێمـە لـە دەرەوە، پـەراوێزێکی گـەورەتر و بـەرفراوانتریان هەیـە بـۆ جموجـــۆڵ و چـــالاکی، لـــە چـــاو ڕۆشـــنگەرانی ناوەوەدا. چونکە ئەوانـەی دەرەوە لـە وڵاتـانێکی دیموکراســـی ئـــازاددا دەژیـــن کـــە پارێزگـــاری ئازادی بیرکردنەوەو ڕادەربڕین و ڕەخنـە دەکـەن، ئەمـــەش بـــە پێچـــەوانەی وڵاتـــانی عـــەرەبی و ئیســـلامیەوەیە. کەواتـــە دوور نییـــە ڕزگـــاربوون

لەسەر دەستی رۆشنگەرانی دەرەوەوە بێت، واتە لەوانەوە بێت کە نیشتەجێی پاریس و بەرلین و لەندەن و مەدرید و برۆکسل و ئەمستردام و جنێف و تەنانەت نیویۆرك و..هتد. لە ئێستادا دیاسپۆرای ئیسلامی بە تەواوی جیهاندا بڵاوبۆتەوەو ژمارەی ئەندامانیان تەنها لە ئەوروپای خۆرئاوادا بە ملیۆنەها کەس ئەژمار دەکرێت. ئەرکی گەیاندنی رۆشنگەری بە ملیارێك کەس لە ئەستۆی ئەوانەدایە، ئەویش بەهۆی هەڵسوکەوتی رۆژانەیان لەگەڵ شارستانیەتی مۆدێرندا. بەڵام ترسناکتر و سەیرترین شت ئەوەیە کە لە ناوجەرگەی کۆمەڵە پۆست – مۆدێرنەکاندا، کەسانی فێندەمێنتالستی پەڕگیر دەبینیت کە بە ئارەزوی خۆیان دێن و دەچن و بێباکن لە هەموو شتێ!

بەڵێ من لەسەر هێڵە گشتیەکانی تێزەو نوسینەکانی ئەم کتێبە، لەگەڵ "جیل کیبل"دا کۆك و هاوڕام و منیش وەکی ئەو ئومێدەوارم جیهانی ئیسلامی، لە دەست رژێمە ستەمکارەکان و ئۆپۆزسیۆنە ئسوڵیە توندڕەوەکان قوتاری بێت، چونکە چارەسەر نە بەویان دەکرێت و نە بەمیان. ئەوەی چارەسەری پێدەکرێت لە جێیەکی ترە. ئەم هێزەی کە ئێمە لە سۆراخیداین، تەنها لە رێگەی ململانێی و مەرگەساتی تراژیدیەوە دروست دەبێت و دێتە بوون.

حەزمدەکرد "کیبل"ـی ئەم کتێبەیدا بەراوردکارییەکی بکردایە لە نێوان فێندەمێنتالیزمی ئیسلامی شەڕانگێز، لەگەڵ ئەو فێندەمێنتالیزمە مەسیحیەی کە تا سەدەی نۆزدەهەم لە ئەوروپادا هەبوو، ئەویش وەکی فێندەمێنتالیزمی ئیسلامی شەڕانگێز و پەڕگیر بوو. گەر بهاتبایە و ئەوەی بکردایە، ئەوا ناوی کتێبەکەی دەگۆڕی و لە بری (شەڕ و ئاشوب لە ناوجەرگەی ئیسلام)دا دەبوو بڵێت: (قەیرانی هۆشیاری ئیسلامی لەگەڵ خۆیدا و لەگەڵ مۆدێرنەی جیهانی لەیەککاتدا). پێویستە ئێمە کێشەی فێندەمێنتالیزم لە ڕەگ و ڕیشەوە چارەسەر بکەین، لەبەرئەوەی خواستی وایە لە ناو قەفەزەکانی ڕابردوودا زیندانیمان بکات.. ئەوەی ئێستا ڕوودەدات قەیرانی موسڵمانانە لەگەڵ مۆدێرنەدا، وەکی ئەوەی ئەوروپا لە ماوەی نێوان سەدەی شانزەو نۆزدەدا پیا تێپەڕی. ئێمە ئێستا لە هەلومەرجێکی مێژوویی دژواردا دەژین و ناتوانین لە چاوتروکانێکدا خۆمان لە وتەزا مەزهەبیەکانی سەدەکانی ناوەڕاست پاك بکەینەوە.. "جیل کیبل" خۆی باش دەزانێت سەرکەوتنی مۆدێرنە لە ئەوروپادا قوربانی چەندی ویست و چەند کاتی ویست و ئەم پرۆسە دژوارە چەندی خایاند؟ ڕەنگە ئەم قسانەی من هەندێ ناهەقی تێدا بێت دەرهەق بە "جیل کیبل"، لەبەرئەوەی ئەو بە فیعلی لە کۆتایی کتێبەکەیدا باسی لە ئاینزای کاتۆلیکی مەسیحی کردووە. بەڵام باسکردنێکی زۆر خێرا، سەرەڕای گرنگیشی. ئێمە لە ڕێی ئەم بەراوردکارییەوە دەتوانین بە چاکی لە دیاردەی فێندەمێنتالیزم لە ئیسلامدا حاڵی ببین. بەڵام گەربێتو هەر خۆمان بپستێنینە ناو چوار چێوەی یەك کەلەپوور، ئەوا توانای ئەوەمان نابێت بە باشی لێی تێبگەین.

دواجـار حەزمـدەكرد "كيبـڵ" ئامـاژەی بـۆ ئـەوە بكردايـە كـە پراكتيـزە كردنـی ڕەخنـەی مێژويی بەسەر تێكستە ئيسلاميەكاندا، لەلايـەن چـەند تويـژەرێكی بـوێری ئيسـلاميەوە كـە لـە ئـەوروپا نيشـتەجێن كـاری بـۆ كـراوە. ئـەی نـەمانوت ڕۆشـنگەری لـە ئـەوروپاوە جيهـانی ئيسـلامی رونـاك دەكاتـەوەو لـەوێوە خـۆری ڕۆشـنگەری لێهەڵـدێت؟ پاشـان خـۆ ئـەوروپاش چۆن لەو قەيرانەی هۆشياری مەسيحی رزگاری بـوو كـە بـە درێـژايی سـێ سـەدە برسـتی لەبـەر بـڕی؟ بێگومـان لـە ڕێـی پراكتيزەكردنـی ڕەخنەی مێژويی بەسەر تێكستە پيرۆزەكانيدا، ئەو تێكستە پيرۆزانەی لە پێناو پاساودانەوەی كوشـت و بـڕی مەزهـەبی بێئامانـدا بـەكاردەهێنران، وەكـی ئـەوەی لـە ئێسـتادا "بـن لادن" و "زەواهـيری" و "زەرقـاوی" دەيكـەن. ئەوانـەی قەسـابخانە بەناوبانگەكـەی سـانت بارتيلميان لە فەرەنسا دژ بە پرۆتستانتەكان لە سـەدەی شـازدەدا ئەنجامـدا كـێ بـوون؟ ئەڵبەتـە ئـەو فێندەمێنتالسـتە كاتۆليكيانـە بـوون كـە لـە ڕووی دەمـارگيری و دڕنـدەيی و داخرانـەوە هيچيان لـە "بـن لادن" و گروپەكـەی كەمتر نەبووە.

مـن پێمـوايە 11ی سـێپتەمبەر هـات بـۆ ئـەوەی، نهـێنی مێـژوو ئاشـكرا بكـات. ئـەم نهێنيـەش شـتێك دەڵێـت، نـاتوانم لێـرەدا بيـدركێنم، بـەلاّم هـەر ئەوەنـدە دەڵـێم كـە ئـەم ڕووداوە هەندێك لـەو حەقيقەتە شاراوانەمان بۆ ئاشـكرا دەكـات كـە پـتر لـە هـەزار سـاڵە بێـدەنگی لێكـراوە و داپۆشـراوە. هۆشـياری ئيسـلاميش دەبێـت توانـای ئـەوەی هـەبێت كـە شـان بداتـە بـەر ئـەم ئەركـە و ڕووبـەڕووی ئـەو كێشانە بێتەوە.

## پەراوێز:

**gilles kepel, fitna: Guerre au caurde lislam, paris, Gallimard, 2004*.

## سەرچاوە:

هاشـم صـالح: معضـلة الاصـولية الاسـلامية – دار الطليعة، بيروت – الطبعة الاولى، 2006.

# هەزار و یەك شەوە

**خۆرخە لویس بورخیس**

**لە فارسییەوە: حەمەرەسوول حەسەن پوور**

رووداوێکی سەرەکی لە مێژووی گەلانی رۆژئاوادا دۆزینەوەی رۆژهەلاتبوو. راستتر دەبێ ئەگەر باسی چەشنە ئاگابوونێکی رۆژهەلات بکەین کە هەردەم شیاوی بەراوردکردنی ئامادەگیی بوونی ئێرانە لە مێژووی یۆناندا. جگە لەمە ناسیاوی لەگەڵ رۆژهەلاتیشدا کە رووداوێکی بەربلاو، مت، درەوشاوەو شیاوی تێگەیشتن- لووتکەی بوون لەخۆی دەگرێت و من چەند دانەیەکیان دەژمێرم. لە روانگەی منەوە ئەم کارە بۆ وتووێژ لەمەڕ ئەم بابەتەوە پێویستە، بابەتێکی تا ئەم رادایە خۆشم دەوێت و هەر لە منداڵیشەوە حەزم لێیەتی:

کتێبی هەزار و یەك شەو یان بەم چەشنەی لە دەستنووسە ئینگلیزییەکاندا ناویان بردووە. (یەکەم دەستنووسی کە خوێندمەوە *The Arabian Nights* – شەوانی عەرەبی) هەرچەندە ناونیشانەکە بە جوانی کتێبی هەزار و یەك شەو نییە بەلام نهێنی تێدایە.

چەند رووداوێك دەژمێرم: نۆ کتێبی هێرۆدۆت بە درەوشاوەیی میسر، مەبەستم میسری دوورە دەستە. دەڵێم "دوورە دەست" چونکی فەزا بەکات دەخەملێندرێ و لەو رۆژگارەدا کەشتییەوانی پڕ لە مەترسی بووە. دونیای میسر بۆ یۆنانییەکان نوسینگەی شارستانییەتی کۆنتر بوو بە چەشنێکی نهێنی دەهاتە بەرچاویان.

پاشان لە وشەکانی رۆهەلات و رۆژئاوا دەکۆڵینەوە کە ناتوانین بیانناسێنین بەلام باسی هەندێ راستی دەکەن. سەبارەت بەم وشانەش هەر ئەم شتە دێتە پێشەوە کە ئیگۆشبی یا پاکیزە لەمەڕ زەمەن دەیگوت: "زەمەن چییە؟ ئەگەر لێم نەپرسن دەیزانم، ئەگەر لێم بپرسن ئیتر نایزانم". رۆژهەلات چییە، رۆژئاوا چییە؟

ئەگەر پرسیارم لێبکەن تەنیا دەتوانم وەڵامێك بدەمەوە. وەرن پەنا بۆ خەملاندنێك ببەین.

دیدارەکان و جەنگ و لەشکرکێشییەکانی ئەسکەندەر بێنینە بەرچاومان. ئەسکەندەر کە ئێران و هیندستانی داگیر کرد و هەروەك دەزانین پاشان لە بابلدا مرد. ئەمە یەکەم چاوپێکەوتنی گەورەی رۆژهەلات بوو، ئەم چاوپێکەوتنە کاریگەرییەکی ئەوتۆی لە ئەسکەندەردا بوو کە یۆنانی بوونی خۆی فەرامۆشکرد و تارادەیەك بوو بە ئێرانی. ئەمرۆ ئێرانییەکان ئەو ئەسکەندەرەی ئیلیادەو شمشێرەکەی دەخستە ژێر سەرینەکەی و دەخەوت، هێناویانەتە نێو مێژووەکەیانەوە.

پاشان باسی لێوە دەکەین، بەلام چونکی ناومان هێنا دەمەوێ ئەفسانەیەکتان بۆ بگێرمەوەو لەوەش دلنیام بۆتان سەرنج راکێش دەبێت:

ئەسکەندەر لە تەمەنی سی و سێ ساڵیدا لە بابل نامرێ. لە سوپاکەی هەلدەبرێ، لە دارستان و ئاراندا سەرگەردان دەبێ. پاشان رووناکییەك بەدی دەکات، ئەم رووناکییە ئاگری دار دەبێت. هەندێ شەرکەر بە دەوری ئاگرەکەوە دادەنیشن کە روخساریان زەرد و چاویان لاربووە، بێئەوەی بزانن کێیە رێگەی دانیشتنی لای خۆیانی پێدەدەن. چونکی بەر لە گشت شتێ سەرباز بووە. لەو هەرێمانەی بە تەواوەتی شارەزایان نییە بەشداری شەرەکان دەبێ. ئەو سەربازە: ئەو ئامانجەی ئەو بەرگرییان لێدەکا بۆی گرینگ نییە و ئامادەی مردنە. چەند ساڵ تێپەر دەبێ، زۆر شتی بیر دەچێتەوە تا ئەو رۆژەی هەقدەستی سەربازەکان دەدرێت لە نێو ئەو پارەیەی وەریدەگرێ. پارەیەکی کانزای تێدادەبێ کە نارەحەتی دەکات. لە نێو لەپی دەستیدا رایدەگرێت و بە خۆی دەڵێ: "تۆ پیرە پیاوی، ئەمە میدالیایە، کاتێك ئەسکەندەری مەقدوونی بووم بەبۆنەی سەرکەوتنی هەولێر فەرمانم دەرکرد لێی بدەن". هەر بۆیە رابووردووەکەی دەدۆزێتەوە و دیسانەوە دەبێتە سەربازی بەکرێگیراوی تاتار و چین..

ئەم نوێکارییە لە یادنەچووەوە هی "روبرت گریوز"[1] هۆنەری ئینگلیزییە. کە گرتنی رۆژهەلات و رۆژئاوای لەسەر دەستی ئەسکەندەر پێشبینی کردبوو. لە ولاتانی ئیسلامیدا تا ئێستاش بە ناوی "ئەسکەندەری زولقەرنەین" بەناوبانگە چونکی فەرمانرەوای دووباڵی رۆژهەلات و رۆژئاوا بووە.

وێنەیەکی دیکە لەم بابەتە دوور و درێژەی نێوان رۆژهەلات و رۆژئاوا سەیر بکەین. ئەو بابەتانەی بە گشتی خەمناك بوون. بیری ڤیرژیلی گەنج بکەینەوە کە دەستی بەسەر ئاوریشمێکی چندراوی دەستکردی ولاتێکی دوورە دەست دادەهێنا. ولاتی چینییەکان کە تەنیا دەزانی دوورە دەست و ئارام و پر حەشیمەتەو کۆتایی سنووری رۆژهەلاتی پێکهێناوە. ڤیرژیل لە "گیۆرگیاس"[2] دا باسی ئاوریشم دەکات، ئەو ئاوریشمە نە دووراوە لەگەڵ وێنەی پەرستگە و ئیمپراتۆر و ئەو رووبارانەی ئەو دەیناسین جیاواز بوون.

بەرجەستەبوونێکی دیکە لە رۆژهەلات هەمان ئەو شتەیە کە لە کتێبی "مێژووی سروشتی" بەرهەمی "پیلین"[3]دا بەدیدەکەین.

لەو کتێبەدا باس لە چینییەکانەوە دەکرێ و ناوی باکتریا و ئێرانی تێدا بردراوە، باسی هیندستان و پاشا "پرووس"[4]ی کردووە. هەڵبەستێکی "یوونالیس"[5]م دێتەوە یاد کە دەشێت چل و چەند ساڵ بەر لەو بەروارە نووسرابێت، یونالیس کە باسی شوێنێکی دوورە دەست دەکا دەڵێ: "ئەوبەری کازیوە و مات. بۆ من گشت رۆژهەلاَت"ەو لەم چوار وشەیەدا کورت دەکرێتەوە.

کێ دەزانێ لەوانەیە یوونالیس بەم چەشنە هەستی پێکردبێت وەك چۆن ئێمە هەستی پێدەکەین. بەلاَم من حەز دەکەم بروا بەم قسەیە بکەم. رۆژهەلاَت هەردەم دەبوو خۆراوا بۆ لای خۆی رابکێشێت.

شوێن داستانەکە دەکەوم و دەگەمە خەلاَتێکی سەرنج راکێش. لەوانەیە ئەم شتە رووی نەدابێ و ئەفسانەبێت. هاروونە رەشید فیلێك بۆ هاوکارەکەی "شارلمانی" دەنێرێ. لەوانەیە ناردنی فیلێك لە بەغداوە بۆ فەرانسا نامومکین بووبێت بەلاَم گرینگ نییە. بەوپەڕی ئارەزووەوە ئەم فیلە پەسەند دەکەم. ئەم فیلە دێویکە.

(بیرمان نەچێ وشەی "دێو" بە ناچاری بە واتای شتێکی ترسناك نییە). سێرفانتس "لۆپەدی یۆگا"[6]ی بە "دێوی سروشت" ناوزەد کردبوو. ئەم فیلە دەشێت لەبەرچاوی فرانك و شارلمانی شای ئەلمانی سەیر بووبێت (خەمناکە ئەگەر وا تێبگەین شارلمانی نەیتوانیوە "سرودی رولاند"[7] وەخوێنی چونکی لەوانەیە بە زاراوەیەکی جەرمەنی پەیڤێبێت).

کەواتە فیلێکی بۆ دەنێرێت و وشەی "ئەلیفانت"[8] (وشەی ئیسپانیایی بە واتای فیل)ی بیر دەخاتەوە کە رۆلاند ئولیفان دەیچرێت. (شەیپورێك لە عاج دروستکراو بۆیە ئەم ناوەی لێنراوە). لەبەرئەوەی کە باس لە بنج و بناوان ناسین دەکەین دەبێت بیرمان نەچێت وشەی ئیسپانیایی "ئەلفیل" لە زمانی عارەبیدا بە واتای فیلە و لەگەڵ "مەرفیل"[9]دا هاو بنج و بناوانە. لە نێو مۆرەکانی یاری شەترەنجی رۆژهەلاَتیدا فیلێکم بەدیکرد کە قەلاَکەی مرۆڤێکی بچووکی هەلگرتبوو. ئەم مۆرەیە بە پێچەوانەی ئەو هەستەی بە بینینی قەلاَ هەستی پێدەکرێ، روخ نەبوو، بەڵکوو بڕبڕەی پشتی فیل بوو.

لە ماوەی جەنگی خاچپەرستاندا شەڕکەرەکان بە یادەوەری جەنگەوە دەگەڕێنەوە بۆ ولاَتەکانیان. بۆ وێنە یادەوەری "شێر"ێك. شەڕکەری بەناوبانگ "ریشارد"ی شێردڵمان هەیە. گیانەوەری شێر کە دێتە نێو هێماکانی شەڕکەرییەوە، گیانەوەرێکی رۆژهەلاَتییە. ئەم زنجیرەیە ناتوانێت بۆ هەتا هەتایە درێژبێتەوە بەلاَم دیسانەوە "مارکۆپۆلۆ" بێنێتەوە یاد کە کتێبەکەی دەرکەوتی رۆژهەلاَتییبوو (ماوەیەك بەرزترینیان بوو) ئەو ئەم کتێبەی لە جەنگێکی کە فیزیاییەکان لەسەر دەستی باشوورییەکان تێکشکان بە گیراوێکی هاوبەندی خۆی دیکتە کرد. لێرە مێژووی رۆژهەلاَت لەئارادایە و بەتایبەتی مەسەلەی "قووبیلای خان" خۆی قوت دەکاتەوە کە لە هەڵبەستێکی "کولریج"[10]دا دەبینین.

لەسەدەی پانزەیەم لەشاری ئەسکەندەرییەدا

(شـاری ئەسـكەندەری زولقەرنـەین) كۆمەڵـە چـیرۆكێك كۆدەكرێتـەوە. بیردەكەمـەوە ئـەو چیرۆكانە لە شوێنێكی دیكەوە هاتبن. یەكەمیان لـە هینـد، پاشـان ئێـران و ئاسـیای بچـووكەوە وەریانگێڕابنـەوە و ئاخرەكەشـی بـە عـارەبی نووسـراونەوەو لـە قاهیرەدا كۆیـان كردوونـەوە. كۆی ئەوانە كتێبی "هەزار و یەك شەو"ە.

دەمەوێ لەسەر ئەم ناونیشانە هەڵوێستەیەك بكەم. یەكێك لە جوانترین سەردێڕی دونیایە، وا دەزانم بـە هـەمان جـوانی بەرهـەمی "دۆن"[11]ە ئەم ناونیشانە بە شێوەیەكی تر جوانە.

(ئـەزمونێك لەگـەڵ زەمەنـدا). وا فیكـر دەكەمـەوە بـۆ ئێمـە ئەمـە پێوەنـدی بـە وشـەی "هـەزار"ەوە هـەبێ كە بە واتـای "بێكۆتـایی"یـە. وتنی هـەزار شـەو، بێكۆتـایی شـەو دەگەیـەنێت، شەوانی پڕ ئەژمار، وتنی "هـەزار و یـەك شـەو" واتـا زیـادكردنی شـەوێك بـە شـەوە بێكۆتاییەكانە. بیر لەو چەمكە سەرنج ڕاكێشەی ئینگلیسی بكەینـەوە. جـاری وایـە بـە جێگـەی ئـەوەی بڵـێین: "بـۆ هەمیشـە *Forever*، دەڵـێین *forever and a day*. بۆ هەمیشە زاییدەن یـەك ڕۆژ" ڕۆژێـك بەوشـەی "هەمیشـە"وە زیـاد دەكـەین. ئـەو شـتەی هـۆگری بـە ئافرەتێـك بیردەخاتەوە: "تا ئەبەد خۆشم دەوێی، تەنانەت زۆرتـریش"، بیركردنـەوەی بێكۆتـایی هاوكـات لەگەڵ "هەزار و یەك شەو"دایە.

ساڵی 1704 یەك دەستنووسی بڵاوكرایەوە. یەكـەم نوسـخەی شـەش بەرگییەكـەی ڕۆژهەڵاتناسـی فەرانسـی "ئـەنتۆنی گـالأن"[12] لەگـەڵ جووڵانـەوەی ڕۆمانسـییانەی ڕۆژهەڵاتـدا بـە تـەواوی هاتـە نێـو بیركردنـەوەی ئەورووپییەكانـەوە. تـەنیا كافییـە دوو ناومـان بیرنەچێت، دوو نـاوی بـەرز. نـاوی بـایرۆن كـە وێنەكـەی لـە بەرهەمەكـەی گـرینگترە و نـاوی ڤیكتۆر هۆگۆ كە لە گشت لایەنێكەوە گرینگە. وەرگێـڕدراوی دیكـەش دەردەكـەون، پاشـانیش "ڕۆدیـار كیپلینـك" كـە سـاڵی 1890 بەرجەستەبوونێكی دیكەی ڕۆژهەڵات دەهێنێتە ئـاراوە: "ئەگـەر بانگـەوازی ڕۆژهـەڵاتت بیسـت ئیتر هیچ بانگەوازێكی تر نابیسی".

با بگەڕێینـەوە ئـەو كاتـەی كـە هـەزار و یـەك شـەو بـۆ یەكـەمجار وەرگێـڕدرا. ڕووداوێكـی سـەرەكی بـۆ گشـت ئـەدەبیاتی ئەورووپایـە. لـە سـاڵی 1704دایـن. لـە فەرانسـادایـن. ئـەو فەرانسـایەی "بۆالۆ"[13] لـە ئەدەبیاتەكەیـدا فەرمانڕەوایی دەكات و ساڵی 1711 دەمرێت و بیرناكاتەوە لەمـەولا هـەموو زمانپاراوییەكـەی بە هێرشـی تیشـكداری ڕۆژهـەڵات دەكەوێتـە مەترسییەوە.

بـیر لـە زمانپـاراوی بۆالۆ دەكەمـەوە كـە تێكەڵەیەكە لە دوور بینی و بەرگرییەكان. بیر لە بەرامبـەریی ژێـری بكەینـەوە، بـیر لـەم ڕسـتە جوانەی "ڤێنلۆن"[14] بكەینەوە: "لە كارەكانی بـیرو هـۆش بچـووكترینیان بەڵگەهێنانەوەیـە". زۆر باشە بۆالۆ گـەرەكی بـوو هەڵبەست لەسـەر بناغەی ژێری دابمەزرێنێ.

ئەمشـەو بـەم زاراوە بەناوبانگـەی لاتـین دەدوێـم كـە پێـی دەڵـێن "كاستیلی" و ئەمـەش بەشێكە لە دەردی غەریبی، لەم سات و سەودایە ئەویندارانـە و جـار جـار شـەڕخوازانەی نێـوان ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا، چونكی ئاواتی چوونی بـۆ هیند بوو كە دۆزینەوەی ئەمریكای لێكەوتەوە.

لەبەرئەوەی ئیسپانیاییەکان بیریان دەکردەوە گەیشتوونەتە هیند ئێمە خەڵکی "مۆکتزۆما[15]، ئاتاواڵپا[16] و کاتریل[17]" بە هۆی ئەم هەڵەیەوە بە هیندی[18] ناو دەبەین. وتارە بچووکەکەی منیش بەشێك لەم رەوتەی نێوان رۆژهەڵات و رۆژئاوایە.

ریشەی چەمکی (رۆژئاوا) دەزانین بەڵام گرینگ نییە، دەتوانین بڵێین کلتووری رۆژئاوا ناتەواوە بەم واتایەی تەنیا ناوێکی رۆژئاوایە. دووگەل لە کلتووری ئێمەدا گرینگی سەرەکییان هەیە ئەوانیش بریتین لە گەلی یۆنان (چونکی رۆم درێژەدەری دونیای هێلینی)یەو گەلی ئیسرائیل لە رۆژهەڵاتەوە. ئەم دوو گەلە لەو شتەی ئێمە پێی دەڵێین کلتووری رۆژئاوادا کۆبوونەتەوە. کاتی پەیڤین لەمەڕ بەرجەستەبوونی رۆژهەڵات پێویستە ئەو بەرجەستەبوونە هەمیشەییە کە "کتێبی پیرۆز"ە بیر خۆمانی بێنینەوە. هاوکێشییەك لەم نێوانەدا لەئارادایە چونکی رۆژئاوا لەسەر رۆژهەڵاتدا کاریگەرە. کتێبێکی نووسەرێکی فەرانسی هەیە کە ناوەکەی دۆزینەوەی ئەوروپا بە هۆی چینییەکانەوەیە و ئەمە شتێکە پێوەندی بە رووداوێکی راستەقینەوەیەو روویداوە.

رۆژهەڵات ئەو شوێنەیە رۆژ لێی دەردەکەوێت. ئاڵمانەکان وشەیەکی هەڵکەوتوویان بۆ رۆژهەڵات هەیە "*Morgenland* — زەوی بەیانی و بۆ رۆژئاواش "*Abendland* — زەوی ئێواریٚ" یان هەیە.

بێشك ئێوە "ئێشپینگێر"تان بیردێتەوە، واتا "لەناوچوونی زەوی ئێواریٚ" یاخود بەم چەشنەی بە زمانی رەمەکی وەریدەگێڕن: "لێژبوونەوەی رۆژئاوا).

بیرناکەمەوە کە دەبێت لە وشەی "*orient* — رۆژهەڵات" چاوپۆشی بکەین، وشەیەکی بەم جوانییە، چونکی بە هەڵکەوت: "*or* — ئاڵتون"ی تێدا بەدی دەکریٚ. لە وشەی "*orient*" وشەی "*or*" هەستپێدەکەین چونکی کاتی رۆژهەڵاتن ئاسمان دەبێتە رەنگی ئاڵتوونی. دیسانەوە هەڵبەستە بەناوبانگەکەی دانتی دەهێنینەوە یادمان "*Dolcecolordorient 2a FFiro*[19] — رەنگی لەسەرخۆی یاقووتی رۆژهەڵات". وشەی "*orient*" لە راستیدا هەردووك واتاکەی تێدا بەدی دەکرێت: یاقووتی شینی رۆژهەڵاتی، ئەو شتەی لە رۆژهەڵاتەوە دێت و هەروەها هەڵهاتنی خۆرە ئاڵتونییەکەم بەیانی بەرز.

رۆژهەڵات چییە؟ ئەگەر بە چەشنی جوگرافییانە شی بکەینەوە، شتێکی جێگەی سەرنج دەدۆزینەوە، بەم پێیەی بەشێك لە رۆژهەڵات، رۆژئاوایە، یاخود باشتر بڵێین بۆ یۆنانی و رۆمییەکان رۆژئاوابوو، چونکی روونە کە باکوری ئەفەریقیا رۆژهەڵاتە. بێشك رۆژهەڵات وەك: میسر، ئیسرائیل، ئاسیای بچووك، باکتریا، ئێران، هیند و دواجار ئەو ولاٚتانە لە خۆ دەگرێت کە لەم شوێنە هەڵکەوتوون و شتێکی ئەوتۆ هاوبەشیان بەیەکەوە نییە. بەم پێیە و بۆ وێنە، تا تارستان، چین و ژاپۆن و هەمووی ئەوانە بۆ ئێمە رۆژهەڵاتن. بیردەکەمەوە هەموو ئەوانەی دەڵێن رۆژهەڵات لە پلەی یەکەمدا بیر لە رۆژهەڵاتی ئیسلام دەکەنەوە، پاشان بەدوای ئەودا بیر لە رۆژهەڵاتی باکووری هیند دەکەنەوە.

یەکەم واتا کە ئەم وشەیە بە ئێمە دەبەخشێ ئەمەیەو زۆرینەی کتێبی هەزار و یەك شەویش لێرەدایە. شتێك لە ژێر ناوی رۆژهەلأت هەستپێکراوە. ئەو شتەی لە ئیسرائیلدا هەستم پێنەکرد بەلأم لە غەرناتەو قورتەبەدا هەستمپێکرد. بوونی رۆژهەلأتم هەستپێکرد بەلأم نازانم دەشێت ئەو رووداوە راڤە بکرێت یان نا، ئەمجار نازانم پێویستە ئەو شتەی پێشووتر هەموومان هەستمان پێکردووە، راڤە بکەین و من دەزانم بۆ واتا جۆراوجۆرەکانی ئەم وشەیە قەرزارداری کتێبی هەزار و یەك شەوین.

بۆ یەکەم جار بیر لەم کتێبە دەکەینەوە و دوای ئەوەیە بیری مارکۆ پۆلۆ دەکەوینەوە یان ئەفسانەکانی "چۆنی قەشە" و رووبارە پڕ لمەکان کە ماسی ئاڵتوونییان تێدایە و لە پلەی یەکەمدا بیری ئیسلام دەکەینەوە.

مێژووی ئەم کتێبە بەدی بکەین و پاشانیش وەرگێردراوەکەی. سەرچاوەی کتێبەکە نەناسراوە. دەمانتوانی بیری ئەو کلیسایانە بکەینەوە کە بە نارەوا پێیان گوتراوە. "گوتیك"و دەستکردی وەچەی مرۆڤن. بەلأم لێرەدا رووداوێکی سەرەکی بەدیدەکرێ کە کرێکار و بنیاتنەرانی کلێساکان بە تەواوی دەیانزانی چ کارێ دەکەن. بە پێچەوانەوە هەزارو یەك شەو بەچەشنێکی سەرسوورهێنەرو لەپڕ دەردەکەوێ. چیرۆکەکان بەرهەمی هەزاران نووسەرن و هیچ کامیان بیریان لەوە نەدەکردەوە کە مەشغوولی دروستکردنی کتێبێکی بەناوبانگن، یەکێك لە بەناوبانگترین کتێبەکانی گشت مێژووی ئەدەبیات ئەو کتێبەی دەڵێن لە رۆژئاوا زێدەتر سەرنجی دەدەنێ تا رۆژهەلأت.

با ئێستا سەیری بابەتێکی سەرنج راکێش بکەین کە "بارۆن هامێرپوگشتاڵ"[20] بۆمانی دەگێڕێتەوە، ئەو رۆژهەلأتناسەی کە "لەن[21] و برتۆن[22]" بەناوبانگترین وەرگێڕەکانی ئینگلیسی هەزار و یەك شەو بە پەسەندەوە ناوی دەهێنن. باسی کەسانێك دەکات کە بە ناوی "*confabulato resnoc turni*" ناویان دەبات. ئەو شەو بێدارانەی حەکایەتان دەگێڕنەوە. ئەوانەی پێشەکەیان گێڕانەوەی حەکایەتە بە دێژایی شەوان.

باسی دەقێکی دێرین دەکات بۆئەوەی بێ خەوییەکەی فەرامۆش بکات کە ئەسکەندەری مەقدۆنی بووە. ئەم حەکایەتانە دەشێت ئەفسانە بووبن. وا بیر دەکەمەوە کێشانی ئەفسانەکان ئاکاری ئەوان نییە. ئەو شتەی "ئەزوپ"[23] و حەکایەتخوانەکانی هیندی شاد کرد بیرکردنەوەی گیانلەبەرێك بوو هاوشێوەی مرۆڤە بچووکەکان بە کۆمیدیا و تراژیدیاکانیانەوە. بیرۆکەی خەیاڵی ئەخلاقی دواتر هاتە ئاراوە. گرینگ ئەوە بوو کە گورگ لە بەرخ و مانگا و گوێدرێژ یاخود شێر و بولبولدا قسە بکات. کە وا بوو ئێمە ئەسکەندەری مەقدونیمان هەیە کە چەندین حەکایەت لە زمانی شەوبێدارانی بێ ناوونیشان دەبیسێت کە پیشەیان حەکایەتخوانییە و ئەمە چەندین سەدە درێژەی کێشاوە. لین لە کتێبەکەیدا: (نەریتی میسرییەکانی ئەمرۆ) دەگێڕێتەوە سالّی 1850، قاهیرە حەکایەتخوانی زۆری لێبووە. پەنجا کەسێکیان حەکایەتی هەزا و یەك شەویان دەگێڕایەوە.

زنجیرە چیرۆکگەلێکمان هەن، زنجیرەی

هینــدی کــه بــه گــوێرەی وتــەی "بێرتــۆن" و "کانســینۆس[24] – ئــیس نــیس" کۆکــەرەوەی نوســــــخەیەکی جێگــــــەی پێداهــــــەڵگوتنی ئیسپانیایی، کاکڵی کتێبەکە پێك دەهێنێ. ئەم زنجیرەیە لە پاشان دەچێتە ئێران و لەوێ ئەم چــیرۆکانە دەگــۆڕن، دەوڵەمەنــدتری دەکــەن و دەیکــەن بــە عــارەبی. دواجــار دەچــێتە وڵاتــی میسر. ئەمە لە کۆتاییەکانی سەدەی پانزدەیەم روودەدات. لەم دەورەیەوە لێوەرگرییەکی دیکە جێــدەمێنێ کــەوا دێتــە بەرچــاو ئــەویش لــە لێوەرگرییەکی دیکەوە سەرچاوەی گــرتبێ کە ئەمــەیان ئێرانییــە و ناوەکــەی "هــەزار و یــەك ئەفسانە"یە.

لەبەرچی هەوەڵێ هەزار و دواجار یەك شەو؟ وا بــیر دەکەمــەوە دوو هۆکــار بــۆ ئــەم مەســەلەیە هــەبن: یەکــەمیان خورافاتــە (لێــرەدا خورافــات گرینگــە) کــە بــەپێی ئــەوە، ژمــارە جووتــەکان بەدشوومن. کەوایە بە شوێن ژمارەی تاقەوەن و بەخۆشــییەوە ژمــارەی "یــەك" یــان لــێ زیــاد کردووە. ئەگەر لە ژمارەی نۆ سەد و نەوەد و نــــــۆدا راوەســــــتابایەن، هەســــــتمان دەکــــــرد ژمارەیەکمان نوقسانە، بەم شێوەیە بە پێچەوانە بــیر دەکەینــەوە کــە شــتێکی بــێ کۆتاییمــان دەدەنێ و دیسانەوە شەوێکی پێوە زیاد دەکەن. "گــالان" رۆژهەڵاتناســی فەرانســی ئــەم دەقــەی خوێندۆتــــەوە و وەریگێــــڕاوە. بــــابزانین تــــا ئێســــــتاش لــــــەم دەقــــــەدا رۆژهــــــەڵات لەسەر چ بناغەیەکەو بە چ شێوەیەکە. بەر لە گشــت شــتێ بــەم هۆیــەی ئێســتایە کــە بــە خوێندنــەوەی هەســـتپێدەکەین لــە وڵاتێکــی دوورە دەستداین.

دەزانین تۆمارکردنی رووداوو مێژوونووسین هــەردووکیان هــەن بــەڵام لــە پلــەی یەکەمــدا ئــەم توێژینەوانــە رۆژئــاوایین. مێــژووی ئــەدەبیاتی ئێرانــی یــاخود مێــژووی فەلســەفەی هینــدی بوونی نییە، تەنانەت مێژووی ئەدەبیاتی چینی و مێژووی چینیش بوونیان نییە چونکی ئەم کەسانە بڕوایان لێك گرێدراوی ئیشوو کارەکان نییـــە. ئـــەوان وا بیردەکەنـــەوە هەڵبەســـت و ئــەدەبیات دوو شــتی نــەمرن. وا بــزانم لــە جێــدا مــاڤی خۆیانــە. بیردەکەمــەوە بــۆ وێنــە ئەگــەر ئــەم ســەر دێــرەی هــەزار و یــەك شــەو (یــان بــەم چەشــنەی بێرتــۆن دەڵێــت – (هــەزار شــەو و شــەوێك *Book of the thousand nights and a night* "مــان هــەر ئــەمڕۆ بــەیانی دروســتکردبا ســـەردێڕێکی نائاســـایی بـــوو. ئەگـــەر ئـــەمڕۆ دۆزیبامانایــەوە بــە خۆمــان دەوت: ســەردێڕێکی چەندە جوانە. جوان نەك تەنیا بە هۆی ئەوەی قەشــەنگە. (هــەروەك رۆژئــاوا بوونــەکانی بــاخ بەرهــەمی لۆگــۆنیس قەشــەنگە) بــەڵکوو بــەم هۆیــەوە لــە ئــارەزۆ و حــەزی خوێندنــەوەی ئــەم کتێبە دروستدەکات.

مرۆڤ گەرەکیەتی لە هەزار و یەك شەودا گوم بێــت. دەزانــین بــە چــوونە نێــو ئــەم کتێبــەوە چارەنووسی بچووکی مرۆیی فەرامۆشدەکەین: دەتــوانین رێگــەمان بچــێتە نێــو دونیایــەکی دیکــەوە. ئــەو دونیایــەی لــە هەنــدێ وێنــەی نموونــەیی و هــەروەها کەســانی دروســتکراو پێکهاتووە.

ئــەوەی لەســەردێڕی هــەزار و یــەك شــەودا گرینگە ئەمەیە کە هەستی کتێبێکی بێ کۆتایی دەداتــە مــرۆڤ: و ئــەم کتێبــە بریتییــە لــەوەی کــە

عەرەبەکان دەڵێن هیچ کەس ناتوانێت هەزار و یەك شەو تا کۆتاییەکەی بخوێنێتەوە. نەك لەم رووەوە کە خەمبارە. بەڵکوو لەم رووەوە کە هەستدەکەین کتێبەکە بێکۆتاییە.

لە ماڵەوە، وەرگێڕدراوە حەڤدە جلدییەکەی بێرڤونم لایە. دەزانم هەرگیز هەموویان ناخوێنمەوە، بەلاَم دەزانم شەوانێك لەوێدا چاوەڕوانمن. لەوانەیە ژیان تێکەڵی چارەرەشی بێ. حەڤدە جلدم لەوێ هەن، ئەم چەشنە ئەبەدیبوونێکی رۆژهەلاَتییانەم هەبێت.

بەلاَم چ رۆژهەلاَتییەك، نەك رۆژهەلاَتی راستەقینە کە بوونیان نییە. دەمەوێت بڵێم واتا رۆژهەلاَتی و رۆژئاواییەکان گشتی کردنە بەلاَم هیچ کەس خۆی بە رۆژهەلاَتی هەست پێناکات. بیردەکەمەوە مرۆڤێك خۆی بە ئێرانی، هیندی یاخود مالیزیایی هەست پێ بکات بەلاَم نەك رۆژهەلاَتی و هیچ کەسیش خۆی بە ئەمریکایی لاتینی هەست پێناکات: ئێمە خۆمان بە ئەرجەنتینی، شیلیایی، یاخود ئۆرۆگوایی هەستپێدەکەین. گرینگ نییە، ئەم واتایە بوونی هەیە. لەسەر چ بنەمایەك دانراوە؟ لە پەلی یەکەمدا لەسەر بیرکردنەوەی ئەم دونیایەی کە لەسەر کۆتاییەکان دانراوە کە تێیدا خەڵکی زۆر چارە رەشن یاخود زۆر خۆشبەختن، زۆر ساماندار یان زۆر فەقیرن دونیای پادشاکان، ئەو پادشایانەی نابێت روونی بکەنەوە چدەکەن. ئەو پاشایانەی دەتوانم بڵێم وەك کۆڵکە خواکان بێ بەرپرسیارییەتین.

هەروەها ئەندێشەی خەزێنە شاراوەکانیش لەئارادایە. هەموو کەسێ دەتوانێ بیاندۆزێتەوە. ئەندێشەی زۆر گرینگی جادوویی، جادوو چییە؟ هۆدارێکی جیاوازە و بریتییە لەم بیرکردنەوەی کە لە دەرەوەی پێوەندی هۆدارییەکی کە ئێمە دەیناسین، پێوەندییەکەی دینیش هەیە. ئەم پێوەندییە دەشێت وابەستە بە رووداوی بەهەڵکەوت بێت، بە ئاڵقەی ئەنگوستیلەیەك، بە چرایەك بێت. ئێمە دەستمان دەگاتە ئاڵقەی ئەنگوستیلە یان چرا و جنێك دەردەکەوێت. ئەم جننە کۆیلەیەو لە هەمان کاتدا لە گشت جێگەیەك بوونی هەیەو ناچار بە کردەوەمان دەکات. ئەم رووداوە لە هەر ئان و ساتێکدا لەوانەیە روویدات.

چیرۆکی راوچی و جننەکە بێنینەوە یادمان. راوچییەکە چوار منالی هەیە و دەست کورتە. گشت رۆژێك لە بەیانییەوە تۆری ماسی گرتنەکەی داوێ. زاراوەی کەناردەریا زاراوەیەکی جادووییەو دەمانخاتە دونیایەکی نارونی جوگرافییەوە. راوچییەکە لە کەناری دەریاکە نزیك نابێتەوە. ئەو نزیك رۆخێك دەبێتەوەو تۆڕەکەی دەهاوێ. رۆژێکی بەیانی تۆڕەکەی داوێ و سێ جار رایدەکێشێت، کەرێکی مردوو دەردەکەوێت، کەلوپەلی شکاوی ناو ماڵ دەردەکەوێت و بە کورتی شتی بێکەڵك دەردەکەوێ. بۆ جاری چوارەم تۆڕەکەی داوێ (هەر جارەش هۆنراوەیەك دەچرێ) و تۆڕەکە زۆر قورس دەبێ، راوچییەکە چاوەڕوانی راوێکی باش دەکات. بەلاَم ئەوەی دێتەدەر تونگەیەکی مسی دەبێت، مسێکی زەرد کە بە مۆری سولەیمان شەقڵ کراوە. سەرەکەی دەکاتەوە. دووکەڵێکی خەستی لێ دێتە دەرەوە، بە خۆی دەڵێت، دەتوانێ تونگە بە مسگەرێ بفرۆشێت، بەلاَم دووکەڵەکە

بەرەو ئاسمان دەچێ و وێنەی جنێك بە خۆیەوە دەگرێت.

ئەم ئەجننانە کێن؟ پێوەندییان بە مەخلووقی بەر لە حەزرەتی ئادەمەوەیە. لە مرۆڤ نزمترن بەڵام دەشێت دێوو درنج ئاسابن. بە بڕوای موسڵمانان لە گشت جێیەکدا هەن. نابیندرێن و لەمس ناکرێن. جننەکە دەڵێ سوپاس بۆ خواو سولەیمانی پێغەمبەری. راوچی لێی دەپرسێت بۆ چ بۆ سولەیمان کە ماوەیەکی زۆر بەر لە ئێستا مردووە ئێستا پێغەمبەری خوا حەزرەتی محەمەد (د. خ)یە، هەروەها پرسیاری لێدەکات، کە بۆ چ لە تونگەکەدا بەندکراوە. جننەکە پێی دەڵێت ئەو یەکێك لەو ئەجننایە کە بە دژی موسڵمانان یاخیبوون و سولەیمان لە تونگەکەدا بەندی کردووە و سەرەکەی بە مۆر شەقڵداوە و بۆ نێو قووڵایی دەریای هاویشتووە. چوار سەد ساڵ تێپەڕبوو جننەکە سوێندی خوارد گشت ئاڵتوونی دونیا دەداتە ئەو کەسەی رزگاری بکات بەڵام هیچ رووداوێك روویندەدا. سوێندی خوارد ئاوازی مەلان فێری رزگاریدەرەکەی دەکات. چەند سەدە تێپەر دەبێت و بەڵێنەکانی چەند هێندە زیاد دەکەن. دواجار ئەو ئان و ساتە دێت کە سوێندێ دەخوا رزگاریدەرەکەی بکوژێت: "ئێستا پێویستە بەڵێنی یەکەم بەرمە سەر: خۆت بۆ مردن ئامادە بکە. ئەی رزگاریدەرەکەم!". ئەم تووره بوونە بە چەشنێکی سەرسووڕهێنەر جننەکە دەهێنێتە سەر خوو خدەی مرۆڤ و لەوانەشە تەنانەت بەرەو خۆی رایکێشێت.

راوچییەکە ترساوە، وا دەنوێنێت بڕوای بەم چیرۆکە نییە و دەڵێ: "ئەو شتەی بۆت گێڕامەوە راست نییە. تۆ کە سەرت دەگاتە ئاسمان و پێیەکانت بۆ زەوی، چۆن توانیت لەم تونگەیەدا جێت بێتەوە؟" جننەکە وەڵامدەداتەوە "پیاوی ناژیر، هەر ئێستا دەیبینی"، بچووك دەبێتەوە و دەچێتەوە نێو تونگەکەوە و راوچیش بەپەلە سەرەکەی دادەخات و هەڕەشە لە دێوەکە دەکات.

چیرۆکەکە درێژ دەبێتەوە و کاتێك دێت کە کەسایەتییە سەرەکییەکەی راوچی نییە و بەڵکوو پادشایە، پاشان پادشای دوورگە رەشەکان و دواجار گشت شتێ تێکەڵی یەکتر دەبێت. ئەمە چەشنی تایبەتیە "هەزار و یەك شەو"ە. بیر لەو تۆپە خڕە چینییانە بکەنەوە کە تۆپی خڕی دیکەیان تێدایە، یاخود بیر لە بووکە شووشەی چینییەکان بکەنەوە. شتێکی هاوشێوەمان لە "دونکیخوت"دا هەیە بەڵام وەك هەزار و یەك شەو کۆتایی پێنەهاتووە. ئیتر ئەوە کە هەمووی ئەمانە لە چیرۆکی بەربڵاوی ناوەندیدا روویانداوە و گشتمان دەیزانین: چیرۆکی ئەو پاشایەی خەیانەتی لێکردبوو و بۆ پێشگرتن بەوەی دیسانەوە خەیانەتی لێنەکرێت بڕیار دەدات هەموو شەوێك ژنێکی دیکە بێنێ و بەیانی بیداتە دەست مرۆڤ کوژەکەی، تا ئەوەی "شەهرەزاد" بڕیاردەدا برادەرەکانی رزگار بکات و بەو چیرۆکانەی هەموو شەوێ بە نیوە چڵی بۆی دەگێڕێتەوە پاشا لە کوشتنی خۆی دەستەخەرۆ دەکات. ئەم ژن و مێردە هەزار و یەك شەویان بەسەردا تێدەپەڕێت و شەهرەزاد کوڕێکی دەبێت.

ئەم چیرۆکانە لە چیرۆکی دیکەدا جێگیرن کاردانەوەی سەرنج ڕاکێش دروستدەکەن وەك شتگەلی بێبڕانەوە کە چەشنێك سەر ئێشە دروستدەکەن. ئەم شێوە نووسینە بەهۆی ئەو نووسەرانەی زۆر دوای ئەو هاتوون سەر لەنوێ کاری پێکرا لە کتێبی "ئالیس *Alice*"[25] ی "لوویس کارۆل[26] *Le wiscarroll*"ی نووسەری ئینگلیسیدا دەبینین. یان لە ڕۆمانەکەی دیکەیدا: "سیلوی و برونو *sylrie bruno*"[27] دا کە تێیدا ئەو خەونانەی لەگەڵ خەونی دیکەدا تێکەڵ دەبن، دێنە ئاراوەو لق و پۆپیان لێدەبنەوە و زۆر دەبن.

خەونەکان بابەتێکی خۆشەویستی "هەزار و یەك شەو"ن. چیرۆکی ئەو دوو پیاوەی خەون دەبینن جێگەی تاریفکردنە. یەکێکی خەڵکی قاهیرە لە خەویدا ئەمری پێدەکەن بۆ ئێران بچێت، بچێ بۆ شاری ئەسفەهان کە لەوێدا گەنجێك لە چاوەڕوانی ئەودایە. مەترسی ئەم گەشتە دوور و درێژە بە ئەستۆوە دەگرێ و دەگاتە ئەسفەهان، ماندوو شەکەت لە حەوشەی مزگەوتێکدا دەخەوێ بۆ ئەوەی پشووبدات و بە خۆی نازانێ لە نێو دزاندایە. هەموویان دەگرن و قازی پرسیاری لێدەکات بۆ بۆ ئەم شارە هاتووە. میسرییەکە ڕووداوەکەی بۆ باسدەکات. قازی قاقا پێدەکەنێ و دەڵێ: "ئەی پیاوی نازیر و خۆشباوەڕ، من سێجار خەونم بە باخێکی قاهیرەوە بینی کە سەعاتێکی هەتاوی تێدایە و لەولاتری فەوارەیەك و دار هەنجیرێك و لە ژێر فەوارەکە خەزێنەی تێدایە. هەر ئەم درۆیەم بڕوانەکرد. ئیتر نامەوێت لە ئەسفەهاندا بتبینمەوە. ئەم پارەیە بگرە و برۆ". پیاوەکە بۆ قاهیرە دەگەڕێتەوە: ماڵەکەی خۆی لە خەونی قازیدا ناسیبۆوە. ژێر فەوارەکە هەڵدەکەنێ و خەزنەکە دەدۆزێتەوە.

لە هەزار و یەك شەودا هەڵوێستی ڕۆژئاوایی تێدایە. لە وێدا ڕووداوەکانی ئوولیس دەبینین، تەنیا ئوولیس ناوی "سەندبادی بەحری"یە. ڕووداوەکان جاروبار لێکدەچن – (تێیدا ڕووداوی پوولیفم (دێوی ئینسان خۆری ئودیسە) بەدیدەکەین). بۆ دروستکردنی قەسری هەزار و یەك شەو وەچەی مرۆڤی زۆر پێویستبووە و ئەم مرۆڤانە خێرخوازی ئێمەن.

چونکی کتێبێکی بێکۆتاییان بۆ ئێمە جێهێشتووە، ئەم کتێبەی تا ئەم ڕادەیە لە تواناییدایە شکڵی خۆی بگۆڕێت. کە دەڵێم تا ئەم ڕادەیە شکڵ گۆڕان چونییەکەم دەق واتا دەقی "گالان" زۆر سادە و لەوانەشە لە هەمووان پتر مرۆڤ بۆ لای خۆی بکێشێت. دەقێکە پێویستی هیچ چەشنە هەوڵدانێکی خوێنەر ناکات. هەروەك کاپیتان برتۆن بەڕاست وتوویەتی بەبێ یەکەمدەق دەستنووسی دواترمان نەبوو.

لە دوای گالان لە ساڵی 1704دا یەکەم بەرگی بەچاپ دەگەیەنێت. ئەم دەستنووسە چەشنێك ئاپۆرە و هەروەها چەشنێك عاشقبوون لە فەرانسای ژێر و بێژیاری لوویی چواردەیەمدا پێك دەهێنێت. کاتێك باسی جووڵانەوەی ڕۆمانسی لە ئارادا بێت و مێژووی زۆر دواتر بیردەکەنەوە بەڵام دەتوانین بڵێین جوڵانەوەی ڕۆمانی لە ساتەوەختێکدا دەسپێدەکات کە یەکێك لە "نۆرماندی"یان لە پاریسدا دەست بە خوێندنەوەی هەزار و یەك شەو دەکات. لەم

کاتەدایە کە خوێنەر لە دونیای دروستکراوی "بوالۆ" دێتە دەرەوە بۆ ئەوەی بێتە نێو دونیای ئازادی رۆمانسییەوە.

دوای ئەوە رووداوگەلی تر روودەدەن. دۆزینەوەی "رۆمانی (خەباتی سەگ) لە فەرانسا لەلایەن "لووساژ[28] *Aluinrene Le sage* –رۆماننووس و نووسەری دراماتیکی فەرانسایی 1747 –1668ی ز"یەوە.

بڵاوبوونەوەی "بالاد"ە ئیسکۆتلەندی و ئینگلیسییەکان لەلایەن – "پرسی[29] – *Thomas percy – 1750*" و پاشان نزیکەی 1798 جووڵانەوەی رۆمانی ئینگلیستان بە "کۆلریچ"ەوە دەستپێدەکات کە "قوبیلای خان"ی پشتیوانی مارکۆ پۆلۆ لە بیری خۆیدا باردەهێنێت. بەم پێیە دەبینین دونیا تا چ رادەیەك جێگەی تاریفکردنەو شتەکان چەندە پێکەوە تەندراون.

وەرگێڕدراوی دیکە دێنە مەیدانەوە. وەرگێڕدراوی "لین – زانستنامە"ی خووخدەی موسڵمانان. وەرگێردراوی مرۆڤناسین و شل و پەیڕێوی برتۆن بە ئینگلیسییەکی سەیر نووسراوە کە بەشێکی زمانی سەدەی چواردەیەمە. ئینگلیزییەکی ئاخندراوی شتی کۆن و نوێیە.

ئینگلیزییەکە بە دوور لە جوانکاری نییە بەڵام جاریوایە خوێندنەوەکەی دژوارە. پاشان وەرگێڕدراوی شێواوو بێ پەردەی دکتۆر "ماردروس[30] *Mardrus* –وەرگێڕی هەزار و یەك شەو بە زمانی فەرانسی" دێتە مەیدانەوە و هەروەها وەرگێڕدراوێك بە زمانی ئاڵمانی وشە بە وشە بەڵام بە دوور لە هەر چەشنە کێشی ئەدەبی "لیتمان – *Littman*". ئەمڕۆ بە خۆشحاڵییەوە دەستنووسی ئیسپانیایی واتا وەرگێڕدراوی "رافاییل کانسیوس – ئاسنیس" کە مامۆستام بوو بە دەستمانەوەیە. بەرهەمەکە لە مەکزیك چاپ بووبوو. لەوانەیە ئەمەیان باشترین وەرگێڕدراو بێت، هەندێ یاداشتیشی لەگەڵدایە.

داستانێك هەیە (بەناوبانگترین داستانی هەزار و یەك شەو)ە کە دەستنووسە سەرەکییەکەی لەدەستدا نییە و ئەویش چیرۆکی "عەلائەدین و چرای جادوویی"یە. ئەم داستانە لە دەستنووسی گالاٌندا دەرکەوتووە و برتۆن بێهوودە شوێن دەقە عەرەبی یان فارسییەکەی کەوتووە. تا ئەو جێیەی پێیان وا بووە گالاٌن ئەم گێڕانەوەی لە خۆیەوە سازکردووە. من وا بیر دەکەمەوە وشەی لە خۆوە سازکردن بەناهەق و شەرانگێزانەیە. گالاٌن هەر ئەوەندە مافی خۆی بووە داستانێك ساز بکات کە حەکایەتخوانەکانی شەو مافیانە. بۆ چ نابێت وای دابنێین ئەو دوای وەرگێرانی ئەم هەموو داستانە حەزی کردبێت بۆ خۆشی چیرۆکێك ساز بکات؟

ئەم رووداوە تەنیا پشتی بە چیرۆکی گالاٌن نەبەستووە "دۆکونیسی *Thomas de quincey*"[31] نووسەری ئینگلیزی 1787 – 1859ی ز" دەڵێ هەزار و یەك شەو چیرۆکێکە پێی لە چیرۆکەکانی تر بەرزترە و ئەم چیرۆکەی بێ هاوتایە چیرۆکی عەلائەدینە. باسی "کاهن"ێکی میسری دەکات کە بۆ چین دەچێت چونکی دەزانێت لەوێ دەکرێت تەنیا کەسێك پەیدا بێ کە لە توانایدایە چرای جادوویی لە

ژێر خاك دەربێنێت. گالأن پێمان دەڵێت ئەم "كـاهین"ە ئەستێرە ناسبوو و ئەستێرەكان بۆیان روونكردبوۆوە پێویستە بە شوێن ئەم گەنجەدا بۆ چین بچێت. (كۆنیسی بیر و هۆشێكی سەیر و سەرنج راكێشی هەبوو رووداوێكی تەواو جیاوازمان بیر دەخاتەوە. بە گوێرەی وتەی ئەو "كاهین"ە كە گوێی بە عەرزییەوە دەنێت و دەنگی پێی خەڵكی زۆر دەبیسێت. لە نێو ئەم دەنگانەدا دەنگی پێی كوڕێك لەوانی تر جیا دەكاتەوە كە لە چارەنووسیدا بوو چرایەكە لە ژێرخاك دەربێنێت. (كونیسی دەڵێت ئەم شتە بۆ لای ئەم بیر و هزرەی بردبوو كە دونیا لە "پێوەندییەكان" پێكهاتووە، پڕ لە ئاوێنە جادووییەكانەو لە بچووكترین شتەكاندا كلیلی گەورەترینیانی تێدایە. ئەم رووداوە كە "كاهین"ی مەغریبی گوێی لەسەر عەرزیداناوە و دەنگی پێی عەلائەدینی دۆزیوەتەوە لە هیچ دەقێكدا نییە. شتێكی نوێیە كە خەون و خەیاڵ یاخود بیرو هۆش داویانە بە دۆكونیسی و هەزار و یەك شەو تا ئێستاش زیندووە. كاتی بێ برانەوەی هەزار و یەك شەو درێژە بەرێگەكەی دەدات. لە سەرەتاكانی سەدەی هەژدەیەم كتێبەكە وەردەگێڕن سەرەتای سەدەی نۆزدەیەم یان كۆتایی سەدەی هەژدەیەم دۆكونیسی بە چەشنێكی دیكە بیرخۆی دێنێتەوە. شەوەكان وەرگێڕی دیكەش پەیدا دەكەن و هەر كامیان دەستنووسی جیا بە دەست دەدەن لەسەر یەك دەتوانین باسی كتێبێكی زۆر بكەین كە پێیان دەوترێت "هەزارو یەكشەو".

دوو كتێب بە پێنووسی گالأن بە زمانی فەرانسی و ماردروس، سێ كتێب بە زمانی ئینگلیزی بە پێنووسی برتۆن، لین و پین، سێ كتێب بە زمانی ئاڵمانی بە پێنووسی: "هینـنگ"[32] "*Walter Henning*" "لیتمان" و "وایل"[33] – *gustarweit* – رۆژهەلأتناس و مێژووزانی ئاڵمانی "1808–1889ی ز". كتێبێك بە زمانی ئیسپانی لە "كانسینوس – ئاسنێس"، هەر كام لەم كتێبانە لەگەڵ ئەوی تردا جیاوازە چونكی "هەزار و یەك شەو" درێژە بە گەشەسەندن و سەرلەنوێبوونەوەی خۆی دەدات. "ئیستیونسێن[34] – *Robertlouis balkourstevenson* – هەڵبەستوان و رۆمانووسی ئیسكۆتلەندی 1850–1894 – نووسەری – دوورگەی خەزێنە، دكتۆر جیل و مستیر هاید" لە كتێبی "جێگەی ستایش"ی هەزار و یەك شەوی نوێ – (*New Arabian Nights*) دا وتاری پاشایەك دەبینین كە بە جلووبەرگی گۆڕدراوەوە لەگەڵ وەزیرەكەی بە شاردا دەگەڕێن و رووداوی سەرنج راكێشی بۆ دێنە پێشەوە. بەلأم ئیستیونسێن پاشایەك دەخولقێنێ بە ناوی – "فلۆرسیل دوبۆهیم[35] – *Florice de Boheme*" یاریدەدەرەكەی بە ناوی "سەرهەنگ جراڵدین" "*Geraldine*"[36] و ئەوان لە لەندەندا دەگێڕێ. نەك لەندەنی راستەقینە بەڵكوو ئەو لەندەنەی هاوشێوەی بەغدایە.

ئەویش نەك بەغدای راستەقینە بەڵكوو بەغدای هەزار و یەكشەو.

نووسەرێكی دیكە هەیە كە هەموو لایەك پێویستە سوپاسی بەرهەمەكەی بكەین. ئەو

"چیستێر تۆن[37] — *gilbertkeith Chesterton*"ە میراتگری — "ئستیونسێن"ە. ئەگەر ئەم نووسەرە بەرهەمی "ئیستیونسێن"ی نەخوێندبایەوە، ئەو لەندەنە خەیاڵییەی کە رووداوی "باوکی براون و ئەو پیاوەی ناوی پێنج شەممو بوو" لەوێدا دەقەومێ، لە ئارادا نەبوو. و ئیستیونستین ئەگەر هەزار و یەك شەوی نەخوێندبایەوە هەزار و یەك شەوە نوێیەکەی نەنووسیبوو. هەزار و یەك شەو کتێبێك نییە کە ئیتر لە ژیاندا نەبێت. کتێبێك بەم بەربڵاوییە کە پێویست ناکات خوێندبێتمانەوە چونکی تەواوکەری بیر و هۆشی ئێمەیە، بەم چەشنەی ئەمشەو لێرە ئامادەیە.

## پەراوێزەکان:

1—*Robert Rank Graves* شاعیر و رۆماننووسی ئینگلیز (1895—1985ی ز)

2—*Georgias*

3—*cairus plinus secundus plin* (جیپۆلۆجیستی رۆمی (23—79ی ز)

4—*poros*

5—*Decimus Janis Jurenalis* شاعیری هیجایی رۆمی (60—140 ی ز)

6—*Lopedevey* نووسەر و شاعیری دراماتیکی ئیسپانیایی (1562—1635 ی ز)

7—*Lachansonde Roland* (دێرینترین ئەفسانەی حەماسی فەرانسی — (و)

8—*Elefante*

9—*Morfil*—دانەفیل بە زمانی ئیسپانیایی — (و)

10—*samueltay lorcoleridge* — شاعیر — رەخنەگر و فەیلەسووفی ئینگلیزی.

11—*(John william Dunne (1875-1949* — پلان دانەری فرۆکەو فەیلەسووفی ئینگلیزی کە یەکەم فرۆکەی جەنگی ئینگلیزی لە ساڵی 1906 دا پلانی بۆ داڕشت — بەرهەمە فەلسەفییەکەی لە ژێر ناوی (ئەزموونێك لەگەڵ زەمەندا) رێگەیەکبوو بۆ چەشنێك بوونناسی نوێ — (و).

12—*Antonie Galland* — رۆژهەڵاتناسی فەرانسی (1865 —1936) وەرگری خەڵاتی نۆبڵ (1907).

13—*Boilleau* — نووسەری فەرانسی (1636 — 1711) لە کتێبی هونەری شاعیریدا ئەدەبیاتی کلاسیك بە یاساگەلی پتەوکورت دەکاتەوە.

14—*Francisde Salignac de la Mothe Fenelon* قەشەی گەورەی فەرانسی

15—*Moctezuma* یان *Montezuma* — دوایین ئیمپراتۆری ئازتەك — (1466—1540).

16—*Atahralpa* — دوایین ئیمپراتۆری ئینکا—(و)

17—*Catriel*

18—لە زمانە رۆژئاواییەکاندا سوور پێستەکان بە ناوی (*indien*) بانگدەکەن.(و)

19—رەنگی لەسەرخۆیی یاقووتی رۆژهەڵاتی.(و)

20—*Hammer purgstall* رۆژهەڵاتناس و لێکۆڵەری ئاڵمانی.(و)

21—*Edward williamlane* رۆژهەڵاتناسی ئینگلیزی (1801—1876).(و)

22—*Sir Richard Francis Burton* — گەڕیدە و رۆژهەڵاتناسی ئینگلیزی (1821— 1890)

23—*Esope* یان *Aisopos* ئەفسانە نووسی یۆنانی (سەدەی شەشەمی پێش زایین).

24—*cansinos - Assens*

25-*Alice* ئالیس لە هەرێمی سەیر و سەمەرەکاندا

26-*Lewiscarroll*، نــاوی دەســـتکردی. *Charles lutwidge Dodgson* نووسەری ئینگلیـزی (1832-1898) نووسەری ئالیس لە هەرێمی سەیر و سەمەرەکاندا.

27-*sylviebruno*

28-*Alain Rene le sage* – رومـاننووس و نووسـەری دراماتیکی فەرانسی (1668-1747).(و)

29-*Thomas perey*

30-*Mardrus* – وەرگێری هەزار و یەك شەو.(و)

31-*Thomas de quincey* نووســەری ئینگلیــزی (1785-1859).(و)

32- *Waltter Henning* ئێران ناسی بەناوبانگ

33-*Gustarweil* رۆژهەلأتناس و مێژوزانی ئالمانی (1808-1889).(و)

34-*Sterenson Balkour Robertlouis* – شـاعیر و وتــارنووس و رۆماننووســی ئیســکوتلەندی (1850-1894) نووسـەری دوورگـەی گـەنج و دوکتـۆر (جکیـل و مستیر هاید).(و)

35-*Floricelde Boheme*

36-*Geraldine*

37-*terton keithches Gilbert*، شـــاعیر، رۆمـــاننووس، وتـــارنووس و رەخنـــەگری ئینگلیـــزی (1874-1936).(و)

## سەرچاوە:

(نـه مقالـه دربـاره دانتـه) – (نـۆ وتـار سـەبارەت بـە دانتی).

نووســـینی (خـــۆرخێ لـــوییس بـــورخیس)، وەرگێرانی لـە فارسییەوە (کاوە سید حسینی – محمد رضا رادنژاد).

# قاوداخستن

**کریستینا پێری رۆسی**

**لە سویدیەوە: عەبدوڵا قادر دانساز**

لـــە کۆتـــایی ســـاڵانی 1900دا لـــەبارەی شـارەکانەوە قاویـان داخسـتبوو. هەنـدێ باسـی کاولبوونیانی دەکرد و هەندێکی تریش باسی دووبارە لەدایکبوونەوەی پارچەکانیانی دەکرد.

گروپـی ژێـر زەمـینی و نهـێنی دەربـارەی شـارانێك چپەچپیان بـوو بـەوەی تـاوەکو ئێسـتا دەتـوانی لـەنێو ئـەو شـارانەدا نیشـتەجێ بیـت، تیایاندا بسوڕێیتەوەو تەماشای باڵندە بکەیت، سـەردانی مۆزەخانـە بکـەیت، یـاوەکو سـەرنجی رەنگـەکانی ئاسمـان بـدەیت، بـەڵام ژمـارەی ئـەو کەسـانە زۆر کـەم بـوون. ئـیتر بەرەبـەرە مـرۆ لەبارەی بەرلینەوە دەستیان بە باس کرد. ئەوە بـە ئاشـکرا یـان لـە نێـو رۆژنامەکانـدا یـان لـە ماوەی کۆبوونەوەکاندا نـەبوو. هـەروەکو بڵێیت نێوی بەرلین شفرەیەکی نهێنی بێت بڵاوبووەوە، وشـەیەکی هوتـاف کردنـی ئەفسـووناوی بـوو، نـاوێکی بـە نهـێنی کـراو بـوو بـۆ ئـەو کەسـانەی پێی ئاشنان، بۆ کەسانی تریش بێ مانا بوو. مرۆ دوو بە دوو لە گفتوگۆی زۆر لە یەکتر نزیك پاش نمایشی ژوان باسی بەرلینیان دەکرد لە ژوورێکـی لابـەلاوە لـە نێـوان دۆسـتانی هەڵبژاردەوە، باسیان دەکرد.

لـــە ژوورێکـــی تـــەنیای بـــە ئاســـتەم ڕوونـاککراودا، ژنێکـی ڕەتوقـوت بـۆ ژنـە هاوخوشکەکەی ئەمەی خوارەوەی گێڕاوە:

–مـن ئـەوەم ژنـەوتووە کـە هـەتاوەکو ئێستاکەش زەیزەفۆن[1] دەڕوێت و قوو[2]ش لە نێو گۆمەکاندا هەیە.

–لە بەرلین بۆقژە[3] لە نێو بەفرا دەخوێنێت و مرۆ لەسەر مێزێك کە چەرچەفی کەتانی بەسەرا دراوە لەنێو کوپی فەخفووری چا دەخۆنەوە.

هـەر تـەنها لەبەرئـەوەی بـەرلین بـە دیـوار شـورەدراوە نابێتـە هـۆی ئـەوەی هەترەشـیان بچێت لەوەی لە دیوارەکەی نزیك بکەونەوە: ئەو

شورەیە پلە و پایەیەك لە سومبولی خەیاڵی دەبەخشێت بە شارەکە کە گەلێك شاری تر ئەوەیان نییە.

ژنە دەستە خوشکەکان لە نێو خۆیاندا رەچەتەی "سترودل"[4] یان دەگۆڕییەوە هەروەکو بڵێی ئەو رەچەتەیە نووسینێك بێت دەربارەی شیعری سەیرەوە لە کاتی زەردەی خۆرئاوادا، لە پشت پەنجەرەوە یاوەکو لەسەر پێرەوە ساردو سڕەکانەوە ئەوە ئاشکرا بکەن *der truam in Leben*[5] ئەوان تا ڕادەیەك بەو زمانە هەندێك لەوە حاڵی دەبوون لەبەرئەوەی ئەوان بە فێربوونی ئەو زمانە زۆر شادمان دەبوون.

کەسانی تر لەبارەی سان فرانسیسکۆوە دەدوان، بەڵام ترسێکی پەنهانی ئێجگار گەورە ناوبانگی شارەکەی داگرتە خوارەوە: هەروەها ئەو شارە ناوزەدکراوەکانیش بۆگەنیان کردبوو شاری سان فرانسیسکۆ لەنێو چەرچەڤ نوێن و باوێشکی کلۆرۆفۆرمدا نوقم بوو، لە پڕێکدا لە ناوەندی دونیادا گۆڕانی بەسەردا هات و بوو بە خانەیەکی شێرپەنجە.

شاری تر هەبوو. وەکو مەدرید لەوێدا هەستێکی کورت بە سەرکەوتن بە تەواوەتی وەك ئەو شادمانییەی پێش ئەوەی مرۆ بمرێت هەستی پێدەکات لە گەشەکردندایە و شاری وەکو پاریس، نا ئامادەن، پاریس ئەو شارەیە لەسەر نێوبانگی دێرینی خۆی دەژێت بەڵام ئێستاکانی پڕە لە تەوەزەلی. هاکا و هیچ جێگایەك نییە رێگای بۆ بگرێتە بەر و ئەوانەی پەیبردنەکانیان برد بۆ قاهیرە، پراگ، بوینس ئایرۆس، یاخود وارشۆ ئەوە ئەو کارەیان تەنها لەبەر نائومێدی کردووە بە تەنها لە بۆ ئەوەی کەمێك زیاتر مەرگ دوا بخەن. داڕوخانی شارەکان هەروەکو پەڵەیەکی نەوت بەسەر دەریادا تەشەنەی دەکرد.

ئا ئەو کەسەی لە کۆتایی ساڵانی 1900دا ئا ئەمە دەنووسێت، نازانێت کە ئایا چی دوا رۆژێك هەیە، نازانێت کە ئایا هیچ شارێك بوونی هەیە، نازانێ کە ئایا ئەدەبییات بوونی هەیە.

## پەراوێزەکان:

1- زیزەفۆن: درەختێکە بە لاتینی پێی دەوترێت: *Tilia cordata* و لە خێزانی کۆمەڵە رووەکێکە و سێ جۆری هەیە.

2- قوو: جۆرە مەلێکی ئاوییە بە لاتینی پێی دەوترێت: *Cygnus* و بە ئینگلیزی پێی دەوترێت: *swan* و سێ جۆری هەیە.

3- بۆقژە: جۆرە باڵندەیەکە بە لاتینی پێی دەوترێت: *Turdus merula*.

4- "سترودل": جۆرە کێکێکی ئەڵمانییە.

5- *Der Truam in Leben*: ئەم رستەیە بە هەڵە نووسراوە چونکە *Der Traum in Leben* راستە. وا دیارە نووسەر بۆ گاڵتەجاڕی ئەوەی نووسیوە. مانای رستەکەش ئەمەیە: گەورەترین خەونی ژیان.

## سەرچاوە:

*Christina peri*

*Kosmoagonier, 1990, pieksa maki*

# ئاوێنەی شکاو

سادق هیدایەت

لە فارسییەوە: عەبدوڵڵا سەعیدی

ئۆدێت وەکو گوڵاڵەی بەهاری گەش و تازە بوو، بە جووتێک چاوی خومار، بە ڕەنگی ئاسمان و قژە کاڵەکانی کە هەمیشە چەپکێك لەوان لەسەر گۆنەی پەخشان بوو. کات و ساتێکی درێژ بە لاچاوێکی ناسکی ڕەنگ پەڕیو لە بەرپەنجەرەی وەتاغەکەی دادەنیشت. لاقی لەسەر لاقی دادەنا، ڕۆمانی دەخوێندەوەو گۆرەوییەکانی دەدورییەوە دەنا گوڵدۆزی دەکرد، بەتایبەتی ئەو کاتەی کە "واڵسی گریزری" بە ویلۆن لێدەدا جەرگ و دڵمی هەڵدەتەکاند. پەنجەرەی وتاغەکەی من بەرامبەری پەنجەرەی وەتاغی ئۆدێت بوو، جاری وا هێندە بە دەقە و سەعات و ڕەنگە لە ڕۆژەکانی یەکشەممەدا من لە پشتی شیشەی پەنجەرەی وەتاغەکەم دادەنیشتم و چاوم لێ دەکرد. بە تایبەت شەوانە ئەو وەختەی کە گۆرەوییەکانی دادەکەند و خۆی لە جێگەوبان دەخزاند!

بەم جۆرە پێوەندی شاراوەی نێوانی من و ئەو دروست بوو. ئەگەر نەمدەدی، دەتگوت شتێکم لێ ون بووە. جاری وابوو هێندەم تەماشا دەکرد، هەڵدەستاو سووك تای پەنجەرەکەی پێوەدەدا. دوو حەوتوو بوو کە هەموو ڕۆژێ یەکترمان دەدی، بەڵام تێڕوانینەکانی ئۆدێت سارد و سڕ و بێ هەمیەت بوو، بێ ئەوەی کە چووکەڵە بزەیەکی بێت یان سەرهەڵدانی هەڵسوو کەوتێك کە مەیل و ویستی خۆی سەبارەت بە من دەربڕێ. لە ئەسڵدا چڕ و چاوێکی خۆگر و جیددی هەبوو. هەوەڵ جار کە ئەوم دی، ڕۆژێك بەیانی

بوو، چوو بوومە قاوەخانەی سەری کۆلانەکەمان بۆ خواردنی سوبحانە. کە لەوێ هاتمە دەرێ، چاوم بە ئۆدێت کەوت، جانتای ویلۆنی بەدەستەوە بوو و بەرەو میترۆ دەرۆیشت. سلاوم کرد، ئەویش بزەی هاتێ، دوایی ئیزنم لێ خواست کە جانتاکەی بۆ هەلبگرم. لە وەلامدا سەری راوەشاند و گوتی: "سپاس"، هەر لەم وشەیەوە ئاشنایی ئێمە دەستی پێکرد. لەو رۆژە بە دواوە کە پەنجەرەی وتاغەکانمان دەکردەوە، لە دوورەوە بە ئیشارەی دەست و چاو قسەمان لەگەلّ یەکتر دەکرد. بەلام هەمیشە دەبوو بەهۆی ئەوەی کە بچینە خوارێ و بۆ دیتنی یەکتری برۆینە باغی لۆگزامبۆرگ و لە دواییدا بچین بۆ سینەما یا شانۆ یا بۆ کافە، دەنا بە شێوەیەکی دیکە چەند ساتێك پێکەوەی تێپەر بکەین. ئۆدێت بە تەنیا لە مالێ بوو چونکە دایکی و زرباوکی چووبوونە سەفەر و ئەویش لەبەر کارەکەی لە پاریس مابۆوە. زۆر کەم قسە بوو، بەلام خوویەکی مندالانەی بوو: یەك دندە و سەرەرۆ بوو، زۆر جاران رقی هەلدەستاندم. دوو مانگێك دەبوو کە یەکترمان دەناسی و ببووینە هاوەلی یەکتر.

رۆژێك بریارماندا کە بۆ شەوێ بچین بۆ سەیری جێژنی بازاری هەینی "نوویی". لەم شەوەدا ئۆدێت جلە شینە تازەکانی لەبەرکردبوو و گەشتر و خۆشحالتر لە جاران دەهاتە بەرچاو. لە رێستۆران کە هاتینە دەرێ، لە تەواوی رێگەی میترۆدا بەسەرهاتی ژیانی خۆی بۆ گێرامەوە. تاوەکوو لەبەردەم لۆناپارك لە میترۆ هاتینە دەرێ. دەستەیەکی زۆر لە هامووشۆدا بوون. لە هەردوولای شەقامەکە، کەلوپەلی خۆخافلاندن و رابواردن ریزکرابوو. هەندێك، خەلکیان لە خۆیان کۆکردبۆوە، و هەلاو بگریان ساز کردبوو تیرەندازی، شانس و بەخت، شیرینی فرۆشی، سیرك، ماشێنی چکۆلە کە بە قەوەی برق بە دەوری جوغزێکدا هەلدەسوورا، هەندێك بالۆن کە بەدەوری خۆیاندا هەلدەسووران، چەند نشیمەنێك وەك کاروان هەر لە جوولەدا بوون و شانۆی جۆر بە جۆری لێ بوون. دەنگی قیژەی کچان، قسەکردن، پێکەنین و غەلبە غەلبی دەنگی ماتۆرو مۆسیقای جۆربەجۆر تێك هەلابوو. بریارماندا سواری واگۆنی زرێ پۆش بین و ئەویش نشیمەنێك بوو کە وەك کاروان هەر لە جوولەدا بوو و لە دەوری خۆی هەلدەسوورا و لە کاتی سووراندا رووپۆشێکی پارچەیی دایدەپۆشی و بە شکلی کرمێکی سەوز دەردەهات. کاتێك کە دەمانەویست سواربین، ئۆدێت دەستکێش و کیفەکەی دا بە من، هەتاکو لە کاتی وەرێکەوتندا لە دەستی بەرنەبێتەوە. ئێمە لە پالّ یەکتردا دانیشتین، واگۆن کەوتەرێ و رووپۆشە سەوزەکە بە هێواشی وەحەوا کەوت و بۆ ماوەی پێنج دەقیقە ئێمەی لە چاوی تەماشاچییەکان شاردەوە. کە رووپۆشی واگۆن چووە دواوە، ئێستاش لێوەکانمان هەر پێکەوە نووسابوون من ئۆدێتم ماچ دەکرد و ئەویش دەستی نەدەکردەوە، لە دواییدا کە دابەزین لە رێگادا بۆی گێرامەوە کە ئەوە جاری سێهەمە دێ بۆ جێژنی بازاری هەینی. چونکە دایکی لێی قەدەغە کردبوو. بۆ تەماشاکردن چووینە چەند جێگەی کەش، لە دواییدا نیوە شەو بوو هیلاك و ماندوو

گەڕاینەوە. بەڵام ئۆدێت دڵی ئێرەی گرتبوو، لە کن هەر کۆبوونەوە و مارەکەیەکدا ڕادەوەستا و منیش بە ناچاری ڕادەوەستام. دوو سێ جار بە زۆری قۆڵیم دەگرت و ڕامدەکێشا، بتەوێ و نەتەوێ ئەویش لەگەڵم دەکەوتەڕێ تاوەکوو لەبەردەم مارەکەی یەکێکدا ڕاوەستا کە تێغی ژیلێتی دەفرۆشت، کابرا قسەی دەکرد و لە چاکی و سوودەکانی کە بە شێوەی عەمەلی پیشانی دەدا، خەڵکی بۆ کڕینی هان دەدا. ئەمجارە ڕقم هەستاو توند باسکیم ڕاکێشا و گوتم: "باشە خۆ ئەمەیان پێوەندی بە ژنانەوە نییە". بەڵام ئەویش باسکی کێشاوەو گوتی: "بۆ خۆم دەزانم. دەمەوێ سەیرکەم". منیش بێ ئەوەی وەڵامی بدەمەوە، بۆ لای مێترۆ ڕۆیشتم. کە بۆ ماڵێ گەڕامەوە، کۆڵان چۆڵ و پەنجەرەی وەتاغی ئۆدێت کوژابۆوە. چوومە وەتاغەکەمەوە، چرام هەڵکرد، پەنجەرەم کردەوەو چون خەوم نەدەهات چەند ساتێك کتێبم خوێندەوە. کاتژمێر یەکی دوای نیوە شەو بوو، چووم کە پەنجەرە پێوە دەم و بخەوم. چاوم لێکرد ئۆدیت هاتۆتە خوار پەنجەرەی وەتاغەکەی و لە پەنا چرا گازی کۆڵانەکە ڕاوەستاوە. لەو کردەوەیەی ئەو سەرم سووڕماو پەنجەرەکەم داخست. کە دەمەویست جلەکانم داکەنم، هەستم کرد کە کیفە بە زەنگیانە چندراوەکەی و دەسکێشەکانی لە گیرفانمدایەو دەمزانی کە پووڵ و کلیلی ماڵەکەی لە کیفەکەیدایە، ئەوانم پێکەوە بەستن و لە پەنجەرەوە بۆم هاوێشتە خوارێ. سێ حەوتوو تێپەڕی و لە تەواوی ئەو ماوەیەدا هیچ هەمیەتێکم پێ نەدەکرد، کە پەنجەرەی وەتاغەکەی دەکردەوە من پەنجەرەکەی خۆم دادەخست. هەر لەو کاتەدا سەفەرێکی لەندەنم بۆ پێش هات. ڕۆژی پێش وەڕێ کەوتنم بۆ ئنگلیس لەسەر پێچی کۆڵانەکەمان تووشی ئۆدێت بووم کە جانتای ویلیۆنی بە دەستیەوە بوو و دەچوو بۆ لای مێترۆ. لە دوای سڵاو و چاك و خۆشی باسی سەفەرەکەم پێ گوت و لە بابەت کردەوەی ئەو شەوەی خۆم داوای لێبووردنم لێکرد. بە لەسەرە خۆییەوە ئۆدێت کیفە بە زەنگیانە چندراوەکەی کردەوە و ئاوێنەیەکی دایە دەستم کە لە نیوەڕاستدا شکابوو و گووتی: "ئەو شەوەی کە کیفەکەمت لە پەنجەرەوە هاویشتە خوارێ ئاوای لێهات. هیچ دەزانی ئەوە شوومی خراپە". لە وەڵامدا پێکەنیم و بە خۆرافاتیم لە قەڵەم داو بەڵێنم پێدا کە پێش وەڕێ کەوتن دووبارە ببینمەوە، بەڵام بەداخەوە نەمتوانی. تەقریبەن بۆ ماوەی مانگێك دەبوو کە لە لەندەن بووم، ئەو کاغەزەی ئۆدێت گەیشتە دەستم:

"پاریس 21 سپتامبر 1930"

"جەمشید گیان

"نازانی چەندە بە تەنێم، ئەو تەنیاییە ئازارم دەدا، ئەمشەو دەمەوێ هێندێك لەگەڵت بدوێم، چونکە کاتێك نامەت بۆ دەنووسم وەك ئەوە وایە کە قسەت لەگەڵ دەکەم. ئەگەر لەم نامەیەدا "تۆ" دەنووسم لێم ببوورە. ئەگەر دەتزانی دەرد و ئازاری ڕۆحی من تا چ ڕادەیەك زۆرە! "ڕۆژگار چەند درێژە، میلی چرکە ژمێر هێندە بە هێواشی و لەسەرە خۆیی دەڕوا، کە نازانم چبکەم. ئەرێ بەڕای تۆش دەنا کات و سات درێژ نییە؟ ڕەنگە لەوێ لەگەڵ کچێك ئاشنا

بووبێتی، گەرچی من لێت پشتە و سوورم کە هەمیشە سەرت لە نێو کتێبانداییە، هەر بەو جۆرەی کە لە پاریس وابووی، لەو وەتاغە چکۆلەیەی کە لە هەموو کاتێکدا لە پێش چاومە، ئێستاکە خوێندکارێکی چینی ئەوێی بەکرێ گرتووە، بەلاّم من پارچەیەکی ئەستوورم لە پشت شیشەکان هەلّواسیوە تا وەکوو دەرێ نەبینم، چونکە ئەو کەسەیە کە خۆشم دەویست لەوێ نییە، بە دەردی وەرگێراوی ئەم گۆرانییە کە دەلّێ:

"کە مەلێك کۆچ دەکات بۆ ولاّتێکی کە، گەڕانەوەی نییە".

"دوێنێ لەگەلّ هێلێن لە باغی لۆگزامبۆرگ پیاسەمان دەکرد، کە گەیشتینە کورسییە بەردینەکە، ئەو رۆژەم وەبیر هاتەوە کە هەردوکمان لەسەری دانیشتبووین و تۆ باسی ولاّتی خۆت دەکرد، و تۆ ئەو هەموو بەلّێنەت دەدا و منیش باوەڕم پێیان بوو، بەلاّم ئێستا بوومەتە تەزبیحی دەستی هاوالاّنم و هۆی گالّتەو جەفەنگی ئەوان منم و لە هەموو جێیەك باس باسی منە! هەمیشە بەیادی تۆوە، والّسی گرێزری لێدەدەم، ئەو وێنەیەی کە لە مێشەلاّنی وێنسۆن بەیەکەوە کێشامان لەسەر مێزەکەمە، کاتێك وێنەکەت دەبینم، هەر ئەوە کە دلّگەرمم دەکات: بە خۆم دەلّێم: "نا، ئەم وێنەیە فریوم نادا و نامخەلّەتێنێ!" بەلاّم مەخابن! نازانم تۆش ئەو باوەڕەت هەیە یان نا. بەلاّم لەو شەوە را کە ئاوێنەکەم شکا، هەر ئەو ئاوێنەیەی کە بۆ خۆت پێت دابووم، لە دلّم چەقیبوو کە رووداوێکی ناخۆش چاوەڕێمە. ئەو رۆژەی کە بۆ دوامین جار یەکترمان دیت و گوتت کە دەرۆی بۆ ئینگلیس، دلّم خەبەری دا گوتی کە تۆ دوور دەکەویتەوەو هیچ کاتێك یەکتر نابینینەوە – و ئەوەی لێی دەترسام بەسەرم هات. خاتوو بۆرێل پێ دەگوتم: بۆ وا خەمناکی؟ دەیەویست بمبا بۆ بێرتانی بەلاّم من لەگەلّی نەچووم، چونکە دەمزانی زیاتر بێ تاقەت دەبم.

"دەی لێی گەڕێن – ئەوەی رابرد، رابرد. ئەگەر بە تووڕەییەوە ئەم نامەیەم بۆ نووسیوی، لە خولّق تەنگییەوە بووە. بمبوورە و ئەگەر بوومەتە هۆی زەحمەت و ئازاری تۆ، هیوادارم کە منت لە بیر بچێتەوە. نامەکانم دەدڕێنی و لە بەینییان دەبەی، وانییە، ژیمی؟"

"ئەگەر دەتزانی لەم کاتەدا دەرد و ژانم چەندە زۆرە، لە هەموو شتێك بێزار بووم، لە کاری رۆژانەشمدا تێك شکاوم، بە شێوەیەك کە لەمەوبەر وا نەبووم ئەسلّەن دەزانی چی؟ ئیدی ناتوانم لەوە زیاتر بێ تەکلیف بم، ئەگەرچی دەبێتە هۆی دلّەڕاوکێی زۆرینەیەك. بەلاّم خەمی هیچ کامیان ناگاتە ئی من.. هەروەکو بڕیارم داوە رۆژی یەکشەممە لە پاریس دەڕۆم. قەتاری سەعات شەش و سی و پێنج خولەك دەگرم و دەڕۆم بۆ کالێ، ئەو شارەی کە تۆ بۆ ئاخرین جار لێی رەت بووی، ئەو کات ئاوی شینی زەریاش دەبینم، ئەم ئاوە هەموو بەدبەختییەکان دەشواتەوە و هەموو ساتێك رەنگی دەگۆڕدرێ، و بە زمزمەی خەمینی خۆی لە سنگی بەستێن دەدا، کەف دەکا، هەر ئەو کەفانەش لیمەکان دەچێژن و دەیدەنەوە دەرێ و لە دوایدا پاشاوی ئەم پێلانەی زەریاش دوایین دلّەڕاوکێی بیرەکانم لەگەلّ خۆی دەبات. چونکە

کەسێك بەدەم مردنەوە پێبکەنێ بەو پێکەنینە دەیکێشێ بۆ لای خۆی. رەنگە بڵێی کارێکی وا ناکا، بەلاّم دەیبینی کە من دەرۆناکەم.

ماچەکانم لە دوورەوە وەرگرە.

ئۆدێت لاسۆر"

دوو نامەم لە وەلاّمی ئۆدێتدا نووسی بەلاّم یەکێك لەوان بێ وەلاّم مایەوەو دووهەمیان بە نێو نیشانی خۆم گەڕاوە، کە مۆرێکیان لێدابوو "بگەڕێتەوە بۆ نێردراوی". ساڵی دوایی کە گەڕامەوە بۆ پاریس بە پەلە و هەڵەداوان خۆم گەیاندە کۆلاّنی سەن ژاك، ئەو شوێنەی کە ماڵی قەدیمم بوو. لە وەتاغەکەی مندا خوێندکارێکی چینی بە فیتوو، والّسی گریّزری لیّدەدا. بەلاّم پەنجەرەی وەتاغی ئۆدێت داخرابوو، بە دەرکەی ماڵەکەیەوە کاغەزێکیان هەڵواسی بوو کە لێی نووسرابوو:

"ماڵی ئیجارەیی"

**سەرچاوە:**

سه قطرة خون – انتشارات نگاه، چاپ اول 1383.

# هەواڵی شارێکی گەمارۆدراو

**شیعری: زیبگنیف هێربێرت***

**لە فارسییەوە: ئەمین گەردیگلانی**

بۆ منی پیر کە ناتوانم چەك هەڵگرم
تاکوو شان بە شانی لاوان خەبات بکەم
بەزەییان پێمدا دێت و
دەوری مێژوو نووسێکیان پێداوم کە بیگێڕم.
من چۆنیەتی کەوتنە گەمارۆ دەنووسم،
ڕوونیش نییە بڕیارە بۆ کێ ڕوو ڕاست بم،
ناشزانم هورووژم لە کەنگێوە دەستی پێکردووە
لە دوو ساڵ لەمەوبەرەوە لە مانگی دیسامبر یان سپتامبردا
یان ڕەنگە هەر دوێنێ دەمەو بەیانی بوو
لێرە هەموو تووشی ئازاری سوانی تێگەیشتنی زەمان بووین
بۆ ئێمە هەر نیشتمان و دڵ پێدان بەو ماوەتەوە.
کەلاوەی پەرستگاکان و خەونی هاشەو پاشەی دارستان و ماڵان
هێشتا ئێمەیان خاوەنین.
ئەگەر بێتوو کەلاوەکان لە کیس بدەین هیچمان بۆ نامێنێتەوە.
هەر ئەو جۆرەی شارەزاییم هەس دەنووسم،
لە ئاهەنگی حەوتە ناتەوەکاندا.
دووشەممە: هەمار خاڵین و پارەی برەودار بوونە مشك
سێ شەممە: شارەوان بە دەستی چەند کەسێکی نەناسراو تیرۆرکراوە
چوارشەممە: ڕاوێژکردن بۆ ئاگر بەس، دوژمن نوێنەرەکانی
پەرلەمان قۆڵبەست دەکا و شوێنی نیشتەجێ بوونیان نازانین،
یانی شوێنی شکەنجەیان.
پێنج شەممە/ لە دوای کۆڕێکی پڕ لە سەرسووڕمان
داخوازیی خەڵکی بازاڕی سەبارەت بە خۆبەدەستەوەدانێکی

بەبێ وادە و بەڵێن بە زۆرینەی دەنگەوە ڕەت دەکرێتەوە.

هەینی: یەکەمین وەدیارکەوتنی پەتای تاعوون.

شەممە: N.N.، پاریزەری کۆڵنەدەر خۆکوژیی کردووە.

یەکشەممە: ئاو نییە، هەڵمەتی دەروازەی ڕۆژهەڵات، بەناوبانگ بە دەروازەی ڕۆژهەڵاتمان پاشەکشێ پێکرد.

دەزانم ئەوانە هەموو ماندوویی هێنەرن،

ناتوانن هیچ کەسیش هان دەن.

لە ڕاڤە و شرۆڤە دوورم، لەغاوی ئیحساسات بەدەستەوە دەگرم.

ڕووداوەکان وەکوو خۆیان تۆمار دەکەم.

دەڵێن لە بازاڕەکانی بیانیدا هەر بە تەنیا ئەوانەن برەویان هەیە،

بەڵام بە شانازییەوە دەمهەوێ دنیا وەئاگا بێنم

کە تەنیا هەر بۆ شەڕی نوێ منالآنی خۆمان پەروەردە کردووە.

مندالآن چێژ لە چیرۆکەکان وەرناگرن، هەر کایەی کوشتوبڕ فێرن.

لە خەو و بە خەبەریدا بیر لە سوپ و نانو یەسقان دەکەنەوە.

ڕاست هەروەکو سەگ و پشیلە.

شەوانە زۆرم پێ خۆشە بە دەوری شاردا هەڵسووڕێم.

سنووری ئازادیی مسۆگەر نەبوومان،

لەسەرەوە لەشکری زۆر و زەوەند و چراکانیان تەماشاکەم.

گوێبگرم لە درمەی تەپڵ و زەنازەنای بەربەرییەکان.

بەڕاستی سەیرە هێشتا شار پارێزگاری لە خۆی دەکا.

گەمارۆ زۆر دەخایێنێ، دوژمن ناچارن بگۆڕێن.

ئەوان هیچ شتێکیان یەك نییە جگە لە ئاواتی لەنێوچوونی ئێمە.

گۆتەکان و تاتارەکان، سوئێدییەکان و لەشکرەکانی قەیسەر و

ئەو هێزانەی بەناوی شەوی کۆتایی گەمارۆی ئێمەیان داوە،

کێ دەتوانێ بیان ژمێرێ؟

ئاڵاکانیان وەك لێرەوار بەدەم ئاسۆوە هەر تاوێ بە ڕەنگێ

خۆیان دەنوێنن، لە زەرد و زۆڵیی کەناریی وەرزی بەهار، تاکوو

ڕەنگی سپی و سوور و ڕەشی زستان.

بە شەودا لەدەست کارەسات ڕزگار دەبم،

دەتوانم لە نێو ڕووداوی ڕابردوویەکی زۆر دووردا، بۆ وێنە لایەنگرانمان کە لەوپەڕی

دەریان ماوەیەك ڕامێنم.

دەزانم لە ناخی دڵەوە هاودەردیم لەگەڵ دەکەن،

ئارد و جەواڵی دڵداری و ڕۆن و پەند و ئامۆژگاریی باش دەنێرن.

تەنانەت نازانن باوکیان خەیانەتیان بە ئێمە کرد.

یەکگرتووەکانی سەردەمی "ئایۆکالیپسیس"ی دووهەم هی ئێمە بوون.

کوڕەکانیان بێ تاوانن و شیاوی ڕێز و سوپاسن، کەوایە سوپاسیان دەکەین.
ئەوان ئابلۆقەیەکی درێژخایەنیان وەکوو هەرمان جێهێشتووە،
ئەو کەسانەی کە چارەڕەشییان دیوە هەمیشە تەنیا و بێ کەسن،
وەکو پارێزەرانی دالایاما و کوردان و شوانی ئەفغانی.
ئێستا کە ئەوە دەنووسم لایەنگرەکانی سازش بەسەر باڵی کۆڵنەدەراندا زاڵ بوون
ئەوانە هەموو ئاوسانی ئاسایی بارودۆخەکەن
چارەنووسیش هێشتا لەسەر تای تەرازوون.
گۆڕستان بەربڵاو بوون و ژمارەی پارێزەران کەم بوونەتەوە.
بەڵام پارێزگاری هەروا بەردەوامە و هەتاکوو کۆتایی خۆی درێژەی هەیە.
ئەگەر بێتوو شار خۆی بەدەستەوە بدا
ئەگەر لانیکەم کەسێکمان دەرباز ببێ، ئەو هەموو شارەکە دەبێ،
شار لە ناخی خۆیدا هەڵدەگرێت و دەیبا بۆ تاراوگە.
لە ئەدگاری برسیەتی و ئاگر و مەرگ دەڕوانین و
لە شتێکی دزێوتریش، ئەدگاری دێزی خەیانەت.
هەر بە تەنیا خەونەکانمانیان بە خۆدا نەشکاندەوە،
هەر بە تەنیا خەونەکانمان ماسووکایەتیی پێ نەکەن.

*زبیکنیف هێربێرت (1924–1998) یەکێ لە گەورەترین شاعیرانی نیوەی دووهەمی سەدەی بیستەمی لەهێستانە. ئەگەرچی ئەو بە شاعیر ناوبانگی دەرکردووە، بەڵام لە نێو بەرهەمەکانیدا زۆر شانۆنامەی شاعیرانەی لە چەشنی (*Poetic Drama*) و کتێبێکی پەخشان بە ناوی (بەربەرێك لە باخدا) کە لە ڕاستیدا یادداشتی گەشتێکی هەقیقی و مەعنەوییە کە شاعیر لە ڕابردوو و سەردەمدا بە نێو وڵاتەکانی ناوچەی مەدیتەرانەدا بوویەتی و گرنگییەکی تایبەتی هەیە.
وەرگێڕانی شیعرەکانی هێربێرت بە زمانی ئینگلیزیو ئاڵمانی بووە هۆی ئەوەی کە ناوبانگی سنوورەکان بپەڕێنێ.
شیعری (هەواڵی شارێکی گەمارۆدراو) یەکێ لە گرینگترین شیعرەکانی هێربێرتە، کە لە ڕۆژانی دامەزرانی حکومەتی نیزامی لە لەهێستان ساڵی 1981 هۆنیویەتەوە.
ئەم شیعرە لەلایەن مارك ئیسموژنسکی مامۆستای ئەدەب و زمانی فارسی لە زانستگای (یالگانیان کوالۆف)ی لەهێستان کە دوکتۆرای ئەدەبی فارسیی لە زانستگای تاران وەرگرتووە، کراوەتە فارسی.

## سەرچاوە:

گۆڤاری کارنامە شمارە 31 ابان ماه 1381.

# دڵدارە هەرە ئازیزەکەم

## نامەی نێوان ئانتوان چیخۆف و ئۆلگاکنیپەر

لە فارسییەوە: ڕەووف بێگەرد

**چیخۆف**

**7ی مارت**

**یاڵتا**

نامەیەکم لە نەناسێکەوە پێگەیشتووە نووسیویەتی کە تۆ لە پترۆزبورگ نوقمی عەشق بوویت و تەواو، ماوەیەکی زۆر بوو لە بیری ئەوەدابووم کە تۆ لەو ڕژدانەیت هیچ لە دەستت نابێتەوە. پێ دەچێت لەبەرئەوەی پێم وتیت تەلگوراف بنێرە من دەست بڵاوبم و ویستبێتم نابووتت بکەم ئیتر منت خۆش ناوێت، دەڵێی چی وەلێ من هەرخۆشم دەوێیت، ئیتر ئەمە خوویەکە (...)

ڕژد، بۆ نامەت بۆ نەنووسیم، کە پێم بڵێیت لە پترۆزبورگ دەمێنیتەوە و بۆ مۆسکۆ نەگەڕێیتەوە؟ من لێرە چاوەڕێت بووم و ئیدی هیچم بۆ نەنووسیت چونکە وام دەزانی دەگەڕێیتەوە ماڵێ.

من ئاشکرایە کە زیندوو تەندروستم، هەرچەندە وەك جاران بە توندی دەکۆکم، کار لە باخەکەدا دەکەم. درەختەکان چرۆیان کردووە، هەوا خۆشە(*) وەك ئەو نامانە وایە کە تازە لە دەرەوە بە دەستم دەگەن، دوا نامە ئەوانەن کە لە ناپۆلیەوە گەیشتوون، تۆ چەندە دلۆڤانیت، چەندە هۆشمەندی ئازیزم! هەر نامەیەکیانم بەلایەنی کەمەوە سێ جار خوێندەوە. بەڵام کار لە باخەکەدا دەکەم و کاری پشت مێزم بە سستی دەڕوات، بێتاقەتم، زۆربەی کاتم بە هەڵەچنی نموونە چاپ کراوەکان بەسەردەبەم و بەوەیش خۆشحاڵم. بە دەگمەن بۆ یاڵتا دەچم، هیچی تیانیە سەرنجم ڕابکێشێت، وەلێ لەلایەکی ترەوە یاڵتاییەکان کاتێکی زۆریان

لێرە بەسەر دەبەن و بێزارمان دەکەن. هەموو جارێك سوێند دەخۆم کە لێرە دەڕۆم یان ژن دێنم، بەڵکوو ئەو بتوانێت ئەمانە لێرە دەربکات، مەبەستم میوانەکانە.. بە ڕەسمی خوازبێنیت دەکەم.

لەگەڵ خۆمدا عەتری دەگمەنم هێناوە، دە وەرە ئازیز و فریشتەکەم لە هەفتەی پیرۆزدا لێم وەربگرە، بێیت ئازیزم. بەڵام ئەگەر بڕیاری نەهاتنت دا بێگومان نارەحەت دەبم و ژیانم لا سووك دەبێت. لە ئێستاوە چاوەڕێتم و ڕۆژو سەعات دەژمێرم. ئەگەر عاشقی یەکێکی تریت و ناپاکیت لەگەڵدا کردووم گرنگ نیە، تۆ هەر وەرە تکایە، گوێت لێمە تووتکەکەم؟ من خۆشم دەوێیت و تۆ ئەمە دەزانیت و ژیان سەختە بێ تۆ. ئەگەر شانۆ داوات لێدەکات کە هەفتەی جەژنی پاك دەبێت پرۆڤە بکەن، بە "نمیروڤیچ" بڵێ ئەمە گاڵتە فێڵێکی ناشیرینە.

چوومە خوارەوە بۆ کێك و چا خواردن، نامەیەکم لە پترۆزبورگەوە بۆ هاتوە لەلایەن "کوندارکوف"[1]ی ئاکادیمیەوە، "سێ خوشکەکە"ی دیوە و زۆری لا خۆشبوە. شتێکت دەربارەی ئەو میواندارییە نا ئاساییانە بۆ نەنووسیوم کە بەشداریت تیا کردوون. بنووسە. تکایە بەلای کەمەوە تەنیا لەبەر دۆستایەتیمان ئەمە بکە. من دۆستی تۆم. دۆستی ڕاستەقینەی تۆ تووتەڵە جوانەکەم.

تەلگورافێکی درێژم لە "سولوڤتسڤا"[2] لە "کیف"[3]وە پێگەیشتووە، نووسیویەتی "سێ خوشکەکە" لە "کیف" بە جۆرێکی سەرسووڕمێن سەرکەوتوو بوو. شانۆگەری دواییم پێکەنین هێنەر دەبێت، زۆریش پێکەنین هێنەر. هیچ نەبێت من وای دەبینم.

باشە پیرێژن، ئاگات لە خۆت بێت، شادبە نەك غەمبار، نیگەرانی هیچ مەبە (...)

هەشتاجار ماچت دەکەم و لە ئامێزت دەگرم، لە بیرت نەچێت چاوەڕێتم، لە یادت بێت.

**شکۆدار و ئاقڵەکەت**

**ئانتونی**

* * * * * *

**کنیپەر**

**9ی مارت**

**پترۆزبورگ**

هەرە ئازیزەکەم، دەمەوێت کەمەکێك قسەی خۆشەویستانەت لەگەڵدا بکەم، بۆ ئەوەی لە دەست ئەم ئەکتەرە چکۆڵەیەت، کە سارردبۆتەوەو لە پترۆزبورگەوە نامەی بێ هەستت بۆ دەنووسێت، تووڕە نەبیت.

بە ڕاستیی ئەم ڕۆژانە سەرم زۆر قاڵە، شەرمم لە نامەکانم دێت زۆریش، هیچ شتێکیان لە من و لە گەرمایی من تیانیە. دەزانم هەستت پێکردووەو سوپاس گوزارم کە هیچت نەوتوە. تۆ مرڤێکی زۆر چاکیت ئانتون – دەبینیت کە من لەمە تێگەیشتووم و ئەگەر بەتاقە وشەیەك سەرکۆنەت بکردمایە لەوانە بوو سەرسەخت بوومایە. بەڵام هیچ لە هەستم تێدەگەیت؟ وا دەزانم ئەپریل و مەی ئازاددەبم. پێت خۆشە؟ ئەگەر بڕیارەکە وابێت کە ئەوان "کرامەر" و "قەلەڕەشی کێوی" "ئەپسن"[4] پرۆڤە بکەن، ئیتر من بێ کار دەبم، هێشتا گریمانەی ئەوە هەیە کە لە "کریمەر"دا ڕۆڵی کچەکەم بدەنێ

بـەڵام بڕواناکـەم. ئیـدی مـن چـوار مـانگ ئـازاد دەبمو دەبێت بیر لەوە بکەمەوە چۆن ئەو ماوەیـە بـە چـاکترین شـێوە و لـە باشـترین شـوێندا بگوزەرێنم، رازیـت؟ تـازە وەڵامـم بـۆ بنووسـە. بـە درێـژی و هەسـتەوە چـیت دەوێـت و چـیت بـە خەیاڵدا دێت. تەنیا ئەوە لە بیر مەکە بەڕاستیی مـن نـاتوانم بێم بـۆ "یاڵتـا"، چ سـوودێکی هەیـە دیسانەوە خۆم بشارمەوە و دایکت بـە خـەمباری ببیـنم. بەلامـەوە زۆر سـەختە، بـاوەڕ بکـە. یـان درکـی پـێ ناکـەیت یـان ناتـەوێت درکـی بکـەیت. بـۆ مـن قسـەکردن لـەو بارەیـەوە سـەختە. وەلـێ دەزانیـت کـە چـەندە سـەخت و ئـازاراوی بـوو، هـاوینی پـار. دەبێـت تـا چـەندە یـاری پشـیلە و مشك بکـەین؟ بۆچـی؟ لەبـەر خـەڵکی دی؟ ئـەوان کـە بزانن هـەموو شـتەکان راسـتن ئیتر بێدەنگی لـێ دەکـەن و وازمـان لـێ دێـنن. ئەوسـا هـەموو شـتەکان ئاسـانتر دەبـن. نـاتوانم بەرگـەی ئـەم هەموو نهێنیە بگـرم. بـۆ دەبێـت ژیـانم بـە گـرێ و گۆڵ بێت؟ تێدەگەیت دەڵێم چی؟ لەگەڵمایت.

* * * * * * *

**چیخۆف**

**11ی مارت**

**یاڵتا**

کەواتە ناتەوێت بێیت بۆ "یاڵتا" ئازیزەکەم. باشـە هەرچـۆنێك تـۆ پێـت خۆشـە بـا وابێـت، نامـەوێت ناچـارت بکـەم. بـەڵام ئـەوە بزانـە کـە بەڕاستی من ناتوانم ئێرە بەجێ بهێڵم! نامەوێت دیسـانەوە تووشـی سەرئێشـەی شـەمەندەفەر و ئوتێل و ئـەو جـۆرە شتە لاوەکیانـە ببمـەوە.. بـە هەرحاڵ تەنانەت ئەوانەیش گرنگ نین. مـن دێم بـۆ مۆسـکۆ. کەواتـە لەمـە زیـاتر ئـەو مەسـەلەیە قسە هەڵناگرێت.

تـۆ بـاش و شـادیت و ئەمـەیش نیشـانەی هۆشیاریتە ئەی کچی شکۆمەند. نووسیوتە مـن خۆشم لە پترۆزبورگ نایـەت. کـێ وا دەڵێت؟ مـن عاشـقی پترۆزبـورگم، ئەسـڵەن ئەمـە نوختـەی لاوازیـی منـە، مـن زۆر یـادەوەری ئـەو شـارەم هەیە. تەنیا شانۆکەیم بەدڵ نیە! هـەرگیز لەگـەڵ مەیلی مندا ناگونجێت، هیچ حەزی پێ ناکەم.

نامە شیرین و دەگمەنەکانت چێژێکی گـەلێك زۆرم پـێ دەبەخشێت، بـۆ حەزناکـەیت بـە نـاوی باوکەوە نامەت بۆ بنووسم. بە ڕاستیی مـن وەك قەشـەیەکی رەبـەن دەژیـم. باشـە ئـیتر نانووسـم (...) چـاکە دڵدارەکـەم شـەوێکی ئـارام و پـڕ لـە ئاسـوودەیت هـەبێت. تەندروسـت و شـادبە، لـە بیرم نەکەیت.

**ئانتونیەکەت**

* * * * *

**کنیپەر**

**11ی مارت**

**پترۆزبورگ — شەو**

ئـازیزترینم، پـێش ئـەوەی بنـووم دەمـەوێت نامـەت بـۆ بنووسـم، نامەکـەی (7ی مـارت)ت شـادی کـردم، کـە دەمخوێنـدەوە بـزەم دەهـاتێ، نامەی نەناس هەمیشە لە ڕاستیی دەدوێت. مـن عاشـق دەبم و هـەموو کـات ناپاکیـت لەگەڵـدا دەکەم و گومان لەمەدا نیە. بەڵام لە دواییدا هـەر دێمـــەوە لای تـــۆو تـــەنیا بـــۆ تـــۆ دەبم، هەردووکیشمان بەختەوەر دەبین، تۆ پێم بڵـێ لـە کوێ یـەکتر ببینین؟ مـن تـەنیا ئـەوەم دەوێت کـە

ببم بە هی تۆ. پێت ناخۆشە دوور بکەوینەوە؟ باشە زۆر ناڕۆین.. ئا یان نا؟ لە دەرەوە چەند نامەی منت پێگەیشتووە؟ گەوجانەیە؟ من بەردەوام نامە دەنووسم، کەواتە تکایە سکالاّ مەکە. کە منت لەگەڵدا بم دەتوانیت کاربکەیت؟ کە منت لا بم ژیان لە ڕۆژانی تەنیایی خۆشتر نابێت؟ هەی تەریکی سامناك وەلاّمم بدەوە (...)

دەبێت لە هەفتەی پیرۆزدا لە مۆسکۆ بم، چونکە لە بارەی ئاپارتمانەکەوە کێشەیەك هاتۆتە پێش. خانووەکەمان فرۆشراوەو دەبێت تا هەوەڵی مانگی مایس چۆڵی بکەین. دایکم تەواو نائومێدە، دەبێت هاوکاری بکەم چونکە هەموو ڕۆژێك سەرقاڵە، تێدەگەیت ئازیزم؟ ئەگەر هەوا خۆش بێت دەتوانیت بێیت بۆ مۆسکۆ، وانیە؟ لە هاویندا دەتوانین بڕۆین بۆ سوید یا نەرویژ. بیرێکی زۆر چاکە. نەڵێی نا (...)

ئەکتەری چکۆڵەت.

*******

**کنیپەر**

**15ی مارت**

**پترۆزبورگ — شەو**

(...) نمایشێکی زۆر ناخۆشی پەردەی چوارەمی (سێ خوشکەکە)م کرد نووسەری ئازیز. جوێن مەدە، ئەسڵەن نەمتوانی تا کۆتایی نمایشەکە خۆم بگرم، لەم چەند ڕۆژەی دواییدا زۆر هەست بە بێ هێزی دەکەم. ڕۆژی سێ جار قەترەی "ڤالریان" لەگەڵ "برومید"ا دەخۆم.

حاڵم تۆزێ باشترە، وا دەزانم زۆر یارمەتی داوم.

لەوە بگەڕێ (...) لە کوێ یەکدی ببینین؟ بێجگە لە یاڵتا تۆ هەر شوێنێك بڵێی من دێم "ڤیشینوسکی" لەوە ڕەنجاوە کە وەلاّمی وێنەکەت نەداوەتەوە. ماچت دەکەم ئانتوان، لە ئامێزت دەگرم، نەکەیت بکۆکیت.

* * * * *

**چیخۆف**

**16 مارت**

**یاڵتا**

ڕۆژباش چکۆڵە. بێگومان دێم بۆ مۆسکۆ، بەلاّم نازانم ئەمساڵ دەتوانم بچم بۆ سوید یان نا. سەفەر بێزاری کردووم، تەندروستیم لە تەندروستی پیرەمێردێك دەچێت، زیاتر لە بایبرت دەچم تا مێرد. ڕۆژم بە پیاسەی ناو باخ دەگوزەرێنم. هەموو شتێك زۆر باشە. دنیا گەرمە، هەموو شتێك لە گوڵ و شکۆفەدایە، باڵندە دەخوێنێت. میوانم نیە. ئەمە ژیان نیە، بەهەشتێکی ڕووتە.

تەواو وازم لە ئەدەبیات هێناوە، کە تۆم هێنا وات لێدەکەم تۆیش دەست لە شانۆ هەڵگریت، بۆئەوەی بە جووتە وەك جوتیار بژین، پێت باشە. باشە پێنج ساڵی تر ئەکتەری بکەیت تێی دەگەیت (...)

نامەم بۆ بنووسە ئازیزم، نامەکانت زۆر بەتامن،

تۆ دەتەوێت فیلم لێ بکەیت کە بۆم دەنووسیت تۆ دوو کەسیت، یەکێکیان مرۆڤ و ئەوی تر ژن. باوابێت، ئەگەر پێت خۆشە فیلم لێ بکە، بەلاّم هەر وەك ژنێکی شکۆمەند بمێنەرەوە و منیش پیرەمێردێکم، ئەگەر من

**تـەفرەت بـدەم تـۆ دەمبەخشـیت و درکـی ئـەوە دەکـــەیت کـــە مـــووی خۆڵەمێشـــم بـــە دەم و چـاوەوەیە بـــەڵام ئـــاگرێکم لــە نــاو دڵدایـــە. وا نییە؟** (...)

**لە ئامێزت دەگرم ناپاك، سەد جار، ماچێکی گەورەیشـت بەسـەردا پـەخش دەکـەم. بنووسـە. بـۆم بنووسـە، ئـەی خـۆش بەختیەکـەم، چـونکە دوای خواستنت لێت دەدەم.**

**خاوەن شکۆو ئاقڵەکەت**

**ئانت**

* * * * *

**چیخۆف**

**18ی مارت**

**یاڵتا**

**باشە، ئەکتەری چکۆڵە، دوای چەند رۆژێکی تر دەگەڕێیتەوە بۆ مۆسکۆ، مانای وایە ئیتر من نابێـــت بـــە ناونیشـــانی پترۆزبـــورگ بـــۆت بنووسم. ناونیشانی مۆسکۆت چییە؟ دەبێت بە ئادرەسـی کـۆن بـۆت بنووسـم یـان چـاوەڕوانی ئادرەسی تازەبم؟**

**ئاوو هەوا گەلێك باشە، یەکێکە لە چاکترین بـەهاری سـاڵ، پـێم خۆشـە، وەلـێ کێشـەکە لەوەدایە کە تەنیام، تەواو تەنیام! یان لە ژووری کارکردندام یان لە باخدام.**

**ئەکتـــــەری شـــــکۆمەندی مـــــن لـــــە "میشیل کریمـەر"دا رۆڵ مەبینـە، چـونکە ناچار دەبیـت هـەموو مـانگی مـایس و حـوزەیران لـە مۆسکۆ بیت و پرۆڤە و نمایش بکەیت. گوێم لێ بگـرە ئـازیزم. ئەگـەر هـەردووکمان بمێـنین تـۆ دەتوانیـــت هـــەزاران دەور ببینیـــت. ئـــای چ هەوایـــەکی ئەفســـوناویە، پلـــەی گـــەرما زۆر بەرزبۆتەوە.** (...)

**خاوەن شکۆو ئاقڵەکەت**

* * * * *

**کنیپەر**

**21 مارت**

**پترۆزبورگ – بەیانی**

**دوێـنێ نامەیـەکی سـەرتاپا فریودەرانـەت بـۆ ناردم، خـۆت زانیوتـە؟ هـیچ هـەبوە؟ گاڵتـەم کـرد، گاڵتەم کرد؟**

**ئــەو شــتانەی لــە بــارەی تەندروســتیتەوە نووسـیوتە چـیە؟ نیگـەرانی ئـەوەم کـە رەنگـە تەندروســتیت بــاش نــەبێت. لــەوەیش هــەر نیگـەرانم کـە دەتـەوێت بێیـت بـۆ مۆسـکۆ. نازانم هەوای مۆسـکۆ چـۆن دەبێـت. دەمـەوێت بتبینم. رەنگـە مـن بـێم بـۆ لات، بـەڵام بـڕوا بکـە ناتوانین وەك دوو هاوڕێ بە چاکی بژین، دەبێت تۆ ئەمە بزانیت، من لەم یاریـە گومانـاویە شـەکەت بووم. ئـەو ئـازارەی دایکـت دەیچـێژێت و نیگاکـانی "ماشـا" بـۆ مـن ترسـناکن. لـە مـاڵی ئێـوەدا وا هەســـت دەکـــەم لـــە نێـــوان دوو ئـــاگردا بـــەگیر هـــاتووم. ڕای خـــۆتم لـــەم بارەیـــەوە بـــۆ بنووســـە، هێشـــتا هـــەر هـــیچ ناڵێیـــت. ئـەم رۆژانــە گــەلێك مانــدووم، زیــاتر لــە نــاو جێگــادام، تــەواوی رۆژەکــەم لــە نــاو جێگــادا ڕادەکشـێم و تەنانـەت توانـای بەرزکردنـەوەی پەنجەیەکم نیە، ئەمڕۆ باسی ئەوەیان دەکرد کە "مرۆڤە تەنیاکان" بخەنە جێی "دوژمنی گەل"، بـەڵام مـن خـەوێکی خۆشـم کـرد و بـەیانیش بـە هەســـتێکی زۆر چـــاکەوە لـــە خـــەو ڕابـــووم**

"نمیروڤیچ" هات بزانێت کە ئایا من دەتوانم دەوربببینم یان نا (...)

ئازیزم هەر بە گەیشتنی ئەم نامەیەم ڕاست وەلاٌمم بدەرەوە، پێم بلٌێ دەتوانین لە کوێ یەکدی ببینین، لە بارەی تەندروستیتەوە تەلگورافێکم بۆ مۆسکۆ بۆ بنێرە، دەبیستیت؟ ئەگەر دەزانیت مۆسکۆت بۆ چاك نیە هەق نیە بێیت. ئەگەر نەمانەوێت لە "یالٌتا" بین دەتوانین لە شوێنێکی تری باشوور یەکتری ببینین. من دێم، ڕۆژی بیست و چواری مانگ من دەجوولٌێم (...)

ئەکتەری چکۆلٌەکەت.

* * * * *

**چیخۆف**

**26ی مارت**

**یالٌتا – تەلگوراف**

باشم، دوای جەژنی پاك دێم بۆ لات، سلاٌو، چاوەڕێی نامەتم.

**ئانتونیو**

* * * * *

**کنیپەر**

**27ی مارت**

**موسکۆ – تەلگوراف**

سبەینێ دێم بۆ یالٌتا

**ئۆلٌگا.**

* * * *

کنیپەر دوو هەفتەی لەگەلٌ خێزانی چیخۆفدا لە یالٌتا بەسەر برد، پاشان لەگەلٌ "ماشا"دا گەڕایەوە بۆ مۆسکۆ. بڕیاری تەواو لەسەر زەماوەندی ئەو دوانە دراو بڕایەوە.

* * * *

**کنیپەر،**

**یاداشت**

سەرەڕای نەخۆشی چیخۆف و عەشقی من بۆ شانۆ، بڕیارمدا ژیانی خۆم بە ژیانی چیخۆفەوە ببەستم، بیرم کردەوە کە ژیان بەم جۆرەیان جوانتر دەبێت، لە ڕاستیدا، لەگەلٌ ئەوەیشدا کە خەمی ئەوەم هەبوو دەبێت زوو زوو لە یەکتر دابڕێین، بەلاٌم هەر وا شکایەوە.

* * * * *

**کنیپەر**

**12ئاپریل**

**سواستوپول**

زوو سواری شەمەندەفەر بووین، ددانم زۆر دێشێت، لە "سواستوپول" چووومە لای پزیشکی ددان، پووکی بۆ توێکاری کردم و مەرهەمێکی دامێ، ماشا ماساژی دەم و چاومی کرد، ناتوانم دەم بکەمەوە. حالٌم خراوە، خۆزیا زوو دەگەیشتینە مۆسکۆ، کەشتیەکە بەهێمنی دەڕۆشت، خانمێکی جوانم بینی تاریفی چیخۆڤی دەکرد، دلٌخۆش بوو کە لە بەندەردا ئەوی بینیوە، دەلٌێت تەمەنی چیخۆف 38 سالٌە، دەربارەی شانۆی هونەری قسەمان کرد و (...)

* * * * *

**كنيپەر**

**ئاپريل** 15

**خاركۆف**

**سـلاو ئـانتونى ئـازيز، ئێمـه لـه خـاركۆفين، تــــا ئێـــــره ســــەفەرەكەمان بــــاش بــــووه، كابينــــەى نووســـتن خـــالّى بـــوو، بەڕاســـتيى مـوجيزه بـوو، بـه درێـژايى شـەو لـه تـاو دان ئێشـه خـەو نەچـووه چـاوم و "ماشـا"يشـم بێـــــزار كـــــرد، وەك منــــــدالّى ترســـــــاو هـــــەردەگريام، ماشــــا وەك فريشـــــتەيەك ئاگـادارى لـىٚ دەكـردم، سـەر لـه بەيانيەكـەى باشـــتر بــــووم، ئـــەم هەوكردنـــه نەحلەتيـــەى پـووكم گـەلێك ترسـناكه و لەوانەيـه خـراپتريش بێــــت. بــــه درێــــژايى تەمــــەنم ئـــازارى وام نەچەشـتووه، جـوێنم بـه عـەرش و قـورش دەدا (...) لـــه مۆســـكۆوه نامەيـــەكى چـــاكترت بـــۆ دەنووسم (...)**

**ئۆلگاكەت.**

* * * * *

**چيخۆف**

**ئاپريل** 16

**ياڵتا**

**كنيـپ چـيزى ئـازيز (...) ژيـان بـه بـىٚ تـۆ سـەراپا بێزاريـە، ئـەمڕۆيش نامەيـەكتم پـىٚ گەيشـت كـه سـكالاٚ لـه ددان ئێشـەكەت دەكـەيت، چـكۆڵه بەسـزمانەكەم، بنووسـه بـزانم ئێسـتا ددانت چۆنه، به گشتى حالّت چۆنه؟ ئازيزترين ئـازيزم، وام دەزانـى لـه پشـت مێزەكەمـەوه دەمتـوانى بـەبىٚ تـۆ دابنيشـم، بـەلاٚم ئاسـايى چ كارێك ناكەم و هەست بە نائومێدى دەكەم(...)**

## پەراوێزەكان:

*–له فارسيەكەدا نووسراوه هەوا سارده.

1–*Kondarkof*

2–*Solvotsva*

3–*Kief*

4–*Ibsen*

**سەرچاوە:**

**كتێبى دلبند عزيزترينم، ل 143–153.**

# وێستگەكانی سەردەم

- دیالەكتیكی رۆشنگەری
-ماكس هۆركهایمەر و تیودۆر ئەدۆرنۆ-

عەفیف عوسمان
لە عەرەبییەوە: سەردەم

- سوپاس كازانتزاكیس كە رێگاونیت لێكردین!

لە عەرەبییەوە: سەردەم

- گفتوگۆیەك لەگەڵ هاشم سالح
خاوەنی كتێبی (كێشەی فەندەمێنتالیزمی ئیسلامی)

لە عەرەبییەوە: هەورامان وریا قانع

- میلان كۆندێرا لە دەقێكی نوێدا
"سەد ساڵ لە تەنهاییدا" ماڵئاواییەكە لە رۆمان

لە عەرەبییەوە: ساكار رەووف بێگەرد

- زۆرزانێتیەكانی كیژۆڵە نەگریسەكە

ئیبراهیم حاج عەبدی
لە عەرەبییەوە: سەهەند

# دیالەکتیکی ڕۆشنگەری

## -ماکس هۆرکهایمەر و تیودۆر ئەدۆرنۆ-


عەفیف عوسمان

لە عەرەبییەوە: سەردەم




ماکس هۆرکهایمەر و ئەدۆرنۆ

فەیلەسوفی ئەڵمانی "ئیمانوێل کانت" دەپرسێت: (ڕۆشنگەری چییە؟) و لە وەڵامیشدا دەڵێت: (دەرچوونی مرۆڤە لەو دۆخی ئیفلیجی و دەستەوستانیەی هەر خۆی لێی بەرپرسیارەو کەمتەرخەمە لە بەکارهێنانی ئەقڵی خۆی بێ ڕابەرایەتیکردنی کەسانی دی). چاخی ڕۆشنگەری کە ماوەی چوار سەدەی خایاند، پرۆژەیەکی سێ لایەنەی چەسپاند: سەربەخۆبوون و مرۆگەری و گەردونگەرایی، لەگەڵ باوەڕبوونی تەواو بە ئەقڵ و پێشکەوتن، یەکێك لە بەرەنجامەکانیشی شۆڕشی فەرەنسی بوو کە لەگەڵ خۆیدا پرانسیپەکانی ئازادی و یەکسانی و برایەتی هێنا. بەلام ئەو شەڕو شۆڕانەی دواتر لە ئەوروپادا ڕویانداو ئەو تیرۆر و توندوتیژیەی هەموو لایەکی تەنیەوە، زۆر لە بیریارانی والێکرد بە خۆیاندا

بچنەوە و پرسیار لە ماهیەتی رۆشنگەری بکەن و ئەو خراپەکاریانە ببینن کە ئەقڵ خۆی بەرهەمهێنەریان بوو.

دوو دیارترین بیریاری قوتابخانەی رەخنەیی فرانکفۆرت "ماکس هۆرکهایمەر" و "تیودۆر ئەدۆرنۆ"، هەڵوێستەیان لە ئاست ئەم کێشەیەدا کرد، تا بزانن بۆچی مرۆڤایەتی دەرگیری فۆرمێکی نوێی بەربەریزم بووە و چۆن چۆنی فیکر بووە بە شمەکێك (بەرپرسیارێتی ئەقڵی رۆشنگەریش لەم مەسەلەیەدا چییە) و زمانیش چۆن بۆتە ئامرازێك بۆ رەواج پەیداکردن بۆ ئەو شمەکە. زانستیش کە ئامرازی پێشکەوتن و کۆنترۆڵکردنی سروشت بوو، بۆتە کێشەیەك و گەیشتۆتە ئاستی بە کۆیلەکردنی مرۆڤ، تەنانەت هەرشتێك کە بە کەڵکی ژماردن و بەکارهێنان نەیەت، رۆشنگەری فەرامۆشی دەکات و بە چاوی گومانەوە لێی دەڕوانێت. لەلایەکی ترەوە رۆشنگەری هەموو شتێك و ملکەچی سستمێك دەکات و ئەو سستمەش بە چاوگ و سەرچاوەی هەموو شتێك دەزانێت. هەروەها ئەقڵ بەرگی ستەمکاری پۆشی و رۆشنگەریش دەرهەق بە خەڵکی بەشێوەیەکی دیکتاتۆرانە کەوتە رەفتارکردن: (رۆشنگەری ئەوەندە ئاشنایەتی لەگەڵ خەڵك و خۆدا پەیدا دەکات کە بتوانێت گەمەیان پێبکات، هەرچی پیاوی زانستیشە شارەزایی لەو شتانەدا هەیە کە دەتوانێت کاریان پێبکات و بەکاریان بهێنێت).

نووسەرانی کتێبی (دیالەکتیکی رۆشنگەری) لەو دەسکەوتە زانستی و تەکنیکیانەی سەدەی رابردووەوە دەست پێدەکەن کە ئەگەری هاتنە ئارای جیهانێکی راستەقینەیان نیشان دا، بەبێ گەڕانەوە و جەنگ و سەرکوتکردن، بەڵام باجی ئەم پرۆسەیە داوەشانی زیاتر و زۆرتری هۆشیاری تیۆری بوو، لەگەڵ کۆنترۆڵکردنێکی بێوێنەی سروشت لەلایەن کۆمەڵگەوەو هەڵپەکردن بۆ هەموو ئەو شتانەی کە دەشێت بۆ مەبەستی تەکنیك بەکاربهێنرێت و کەڵکی لێ ببینرێت. ئەم کارەش بووە مایەی ئەوەی پرانسیپەکانی وەك حەقیقەت و ئازادی و دادپەروەری ئینسانی، ببنە وشەگەلێکی بێ ناوەڕۆك. بەمجۆرە خواستی بەدیهێنانی ئەو شتانە لە جیهانی کۆمەڵایەتیدا ئەو رەواجەی نەما. کەسێك کە نەزانێت ئازادی چییە، ناتوانێت لەسەر ئاستی سیاسی خەبات لە پێناویدا بکات. بیروبۆچوونی پێشکەوتن، سەرەکیترین رەگەزی فەلسەفەی رۆشنگەری بوو کە چینی بۆرژوازی پێشکەشی کرد و لە سایەی بەیداخی ئەقڵدا کاری بۆ دەکرد. بەڵام لە هەموو سەردەمێکدا بەرەو پێشچونی تەکنۆلۆژی و کۆمەڵایەتی، رەنگە ببێتە مایەی گۆڕینی مرۆڤ، بەمەش خۆ گونجاندن لەگەڵ دەسەڵاتی پێشکەوتندا، بەرەو پێشچوونی دەسەڵات مسۆگەر دەکات. ئەمەش بووە مایەی دووبارە بوونەوەی شکست و گەڕانەوە بۆ دواوە،

بە تایبەت کە پێشکەوتن بوو بە میکانیزمی کۆنترۆڵ و سەرکوتکردن. دەتوانین ئەم پێشکەوتن و بەرەو پێشچوونەش بە پێچەوانەی پێشکەوتن یاخود بە دژە پێشکەوتن، ناونوس بکەین.

"هۆرکهایمەر" و "ئەدۆرنۆ" لەوە دەکۆڵنەوە کە چۆن بزاوتی رۆشنگەری پشتی لە بەهاکانی خۆی کرد، بەر لەوەی بواری ئەوەیان بۆ بڕەخسێت تا لە واقعی کۆمەلآیەتیدا بەرجەستەبن. ئەم دوو بیریارە پێیان وایە ئەم پرۆسەی خۆ وێرانکردنەی ئەقڵ، لە ئایندەدا درێژەی دەبێت و فۆرمی تازەی ستەمکاری لێدەکەوێتەوە، گەر بێتو دان بەو ئاڵوزی و دۆخە تەمومژاویەدا نەنرێت کە تەوقی چەمکی پێشکەوتنی داوە و هەوڵ بۆ تێپەڕاندنی نەخرێتەگەڕ. کەواتە پێویستە ئەو تەلیسمە لەسەر ڕووی ئەقڵ لابەرین و ناهەمواریەکانی ئاشکرابکەین. هەردوو نوسەر لە شوێنێکی دیکەی ئەو کتێبەیاندا، جەخت لە سەر ئەوە دەکەنەوە کە کۆنترۆڵکردنی سروشت، پەیوەندیەکی توند و تۆڵی بە ئازادی مرۆڤەوە هەیە لە دەست سروشت. بەلآم کاتێك کۆنترۆڵکردن لە سروشت و شتەکانەوە، بادەداتەوە سەر کۆنترۆڵکردنی جیهان بەبێ گوێدانە ئاکامەکانی، ئەوا ماڵوێرانی بەدوادا دێت.

بۆ خستنە ڕووی کاریگەریەکانی ئەم کۆنترۆڵکردنە، هەردوو نوسەر پەنا بۆ لێکدانەوەی دوو نمونە دەبەن. یەکەمیان لە ئۆدیسەوە وەرگیراوە، ئەویش لە میانەی سەفەری "یۆلیۆسیس"ەوە. لەم نمونەیەوە سەیری روکاری دولایەنەی رۆشنگەری دەکەن و تیایدا ئەو پرانسیپە مێژوویە دەبینن کە دەسەلآت بە ناوی پرانسیپی پێشکەوتنەوە بۆ خۆی قۆرخ کردووە و لەم پێناوەشدا وەهم و فرت و فێڵ و چاوبەست کردن بەکاردێنێت، بە تایبەتی دەسەلآتی فاشیزم. دووەم نمونە لە (چیرۆکی جولێت)ی "ماركیزە دی ساد"ە وە سەرچاوە دەگرێت. قارەمانی ئەم چیرۆکە و ڕەفتار و هەڵسوکەوتە وێرانکاریەکانی، نمونەی میراتی بەر لە شارستانیەتەکان نیشان دەدا، هەروەها حەزو ئارەزووی وێرانکردنی شارستانیەتی بەچەکی تایبەتی خۆی بەرجەستە دەکرد. دەتوانین بڵێین "جولێت" کچی مێژوی تازە و بەهاکانی ئەو مێژوویە کە کۆنترۆڵ و چەوسانەوەی کردۆتە فەزیلەت و ناسکی و نەرم و نیانیشی کردۆتە تاوان و گوناه. لە کایەی (کلتور سازیدا) دەبینین شارستانیەت، شتێك لە وێکچوونی بە بەر هەموو شتەکاندا کردووە، بۆ نموونە سەرمایە دەسەلآتی خۆی فەرز دەکات بۆ ئەوەی هونەر بگۆڕێت بۆ کارێکی سود بەخش و شتێك کە قازانج بکات. واتە لە سایەی سستمی سەرمایەداریدا هونەر ئەگەر پابەندی ئەو پێودانگانە نەبێت کە بۆی دانراوە ئەوا بەرهەم ناهێنرێت، واتە دەبێت بچێتە چوارچێوەی خزمەتکردن بە بەرخۆرەکان و سەر لەنوێ ڕاهێنان و پەروەردە

کردنەوەیان، لەم پرۆسەیەشدا هیچ کەس ناتوانێت رزگاری بێت و لەو تەوقە بێتە دەرێ. ئەو جیاوازییە جۆراوجۆرانەشی دەیبینین ئیتر لە بەرهەم هێنانی ئۆتۆمۆبیل یاخود فیلمدا بێت، جگە لە چاوبەست و فریودان شتێکی دیکە نییە.

ئەگەر هەموو شتێك لە هۆشیارییەوە سەرچاوە بگرێت، ئەوا هۆشیاری گروپە جۆراوجۆرەکانی بەرهەم هێنان بەهۆی ئەو کلێشە پێشوەختەی ئامادەکراوە، دەبێتە شتێکی روکەش و بێمانا. ئەوەی کلتور سازی دەیکات، بریتییە لە سەرلەنوێ بەرهەم هێنانەوەی خەڵك و خوا بەپێی مۆدێلەکانی پیشەسازی بە گشتی. بەپێی بۆچوونی "تۆکڤێل" لە سایەی مۆنۆپۆلکردنی تایبەتی کلتووردا، سەتەمکاری دەستبەرداری جەستە دەبێت و راستەوخۆی بەرەو رۆح دەچێت. چونکە ئیتر سەرووەرو دەسەڵاتدار ناڵێت: یان دەبێت بمرن یاخود دەبێت وەکو من بیر بکەنەوە، بەڵکو دەڵێت: (ئێوە ئازادن گەر وەکو من بیرنەکەنەوە، ژیان و خێر و بێری خۆتان بۆ خۆتانە، بەلام لەمرۆ بەدواوە ئێوە نامۆن لەناومانــدا). لەم سەروبەندەشدا ئەو سەرووەرە بەردەوام خیانەت لەو بەڵێنانە دەکات کە دابوونی. دواجار لەم کتێبەدا "هۆرکهایمەر" و "ئەدۆرنۆ"، لە سەرهەڵدانی دیاردەی (دژە - سامی)یش دەکۆڵنەوە و بە یەکێك لە دەرکەوتەکانی سەرەرۆیی ئەقڵ و وەك گوزارشتکردنێك لە بونیادی رەفتارێکی بەدگومانی دەدەنە قەڵەم.

**سەرچاوە:**

رۆژنامەی (المستقبل)، 2007/4/25.

# سوپاس کازانتزاکیس کە ڕێگاونیت لێکردین!

لە عەرەبییەوە: سەردەم

"زۆربا زۆر بە گران هەناسەی دەدا، لەبەرئەوەی خوێن بەئاسانی نەدەگەیشتە دەزوولەکانی مێشکی. پیر ببوو، دەڕۆیشت و لارە لارەی بوو، ئیتر چۆن دەتوانێت خۆشەویستی بکات؟ بۆیە وای بە باش زانی وەك منداڵێکی پاکژ لەسەر جێگای کۆنە خۆشەویستەکەی پاڵ بکەوێت و چاوەڕێی مردن بێت". بەڵام کازانتزاکیس لە ڕۆمانی بەناوبانگی (زۆربای یۆنانی)دا وای وێنا دەکات کە زۆربا گەلێك زرنگە لە مامەڵەکردنی ئافرەتدا و بەتایبەتی لە سیحری ناوجێگادا. بوهیمیەکی ئەفسونگەرە و




دەتوانێت لە چرکەساتی خۆشی و پێکەنیندا بگری. لە کاتی خەم و پەژارەیشدا بداتە قاقای پێکەنین. لەو ساتەدا کە لە کەناری مەرگدایە سەمایەکی سیرتاکی یونانی بکات.

پاش گەڕان و کون پشکنیەکی دوورو درێژ بە دوای کەسایەتی ڕاستەقینەی زۆرباو ژیاننامەیدا. لێکۆڵەری یۆنانی (فیلیبیوس فیلیبیو) لە کتێبەکەیدا (مەرگی زۆربا) زۆر بە توندوتیژی ڕەخنە لەو وێنە ئەفسانەییە دەگرێت کە کازانتزاکیس بۆ ژیانی زۆربای وێنا کردووە و لە نواندنەکەی هونەرمەند ئەنتونی کوین لە فیلمی زۆربادا دەگاتە لووتکە.

فیلیبیوس هەنگاو بە هەنگاو کەوتۆتە دوای (زۆربا) پاش باس و خواس و گەڕانی زۆر شوێنی لەدایك بوون و وردەکاریەکانی ژیانی تایبەتی ئەوی دۆزیوەتەوە. لەگەڵ

نەوەکانی زۆربادا قسەی کردووە. تا گەیشتۆتە ئەو ڕاستیە تاڵ و ناخۆشەی کە (زۆربا)ی ڕاستیی هەرگیز لە ژیانیدا پاڵەوان نەبووە. ئەو زۆربایەی ساڵی 1910 بە ڕێکەوت تووشی کازانتزاکیس بووە، بێجگە لە مرۆڤێکی ئاسایی و پەراوێزکراو بەناوی (یورگاس زۆربا) هیچی تر نەبووە. ئەو لە دوورگەی کریتدا نەژیاوە، ژیانی لە ناو دەریادا نەبووە، هەرگیز نە ئەفسوونگەر بووەو نە ژنانی، خەڵکی مەکدونیا بووە، ساڵی 1943 بە ناچاری یۆنانی بەجێهێشتووە. تا لە کۆتاییدا لە شاری ئسکوبیای مەکدۆنیادا کۆچی دوایی کردووە.

لە کتێبەکەی فیلیبیوسدا چەند نامەیەك هەیە کە لە ئەندریاسی کوڕی زۆرباوە بۆ کازانتزاکیسی داهێنەر نێرراوە، لە نامەیەکیاندا بە بێزارییەوە بۆ کازانتزاکیس دەنووسێت: "بەڕێز تۆ سووکایەتیت بە خێزانەکەمان کردووە: حەز دەکەم پێت بڵێم کە ئێمە خێزانێکی بەڕێزو بە ڕەوشتین، هەرگیز باوکم داوێن پیس نەبووە، هیوادارم هەڵەکانت چاك بکەیتەوە. ئیعتیبار بۆ باوکی خوالێخۆشبووم یورگاس زۆربا بگێڕیتەوە".

لە کۆتایی کتێبەکەی فیلیبیوسدا خوێنەر بۆی دەردەکەوێت کە ئەوەی کازانتزاکیس نووسیویەتی دەستت هەڵبەستە، ئەو ئەفسانەیەکی تازەی لەبارەی پاڵەوانێکەوە دروست کردووە کە هەمان ناوی هەیە بۆ ئەوەی لە دنیای کلتور و داهێناندا بە نەمری بمێنێتەوە.

ئەفسانەی (زۆربای یونانی) لە زەینی ڕووناکبیراندا تەنیا لە سنووری ڕۆمانێکی مەزندا خۆی نابینێت، یان لە سەما جوانەکەی ئەنتونی کویندا، بەڵکوو ئەو یادەوەریانەی هاوئاهەنگن لەگەڵ موسیقاکەی تیودراکیسدا بۆ سەمای سیرتاکی. ئەو سەمایەی ئەنتۆنی کوین لە فیلمەکەدا ئەنجامی دا.

(زۆربا) وەهمیەکەی کازانتزاکیس زۆر نەمرتر و قووڵتر و ڕەسەنترە لە زۆربا ڕاستەقینەکە.

کێ دەڵێت هەقیقەت لە خەیاڵ جوانترە؟

**سەرچاوە:**

سایتی ئیلاف، ڕۆژی 2007/6/24.

## گفتوگۆیەك لەگەڵ هاشم ساڵح

## خاوەنی کتێبی (کێشەی فەندەمێنتالیزمی ئیسلامی)

له عەرەبییەوە: هەورامان وریا قانع

جیهـــــانی ئیســـــلامی پێویستی بە خوێندنەوەیەکی عەقلانی هەیە بۆ ئیسلام، تاکو ڕوبەڕوی ئـەو خوێندنـەوە توندڕەوەی لەمڕۆدا باڵادەستە ببێتـەوە، ئەمـە یەکێکـە لـەو داواکاریانـەی نوسـەری سوری "هاشم ساڵح" کە لە ئێستادا لـە پـاریس دادەنیشـێ‌و لـەم گفتوگۆیەدا دەیخاتەڕوو.

* گـــەر پرســـیارمان سـەبارەت بـە فێنـدەمێنتالیزم لێکردیت، دەڵێی چی؟

– لـە جیهـانی عەرەبیـدا زاراوەی فەنـــدەمێنتالیزم وەك هاومانا بۆ زاراوەی توندڕەوی بڵاوبوەتەوە، کاتێ دەڵێین ئەم کەسە فەندەمێنتاڵیستە، مانای



هاشم ساڵح

وایـە لـە تێگەشـتنیدا بـۆ ئـاین کەسـێکی تونـدڕەو یـان دەمـارگیرە. ئـەو ئـاین وەك شـتێکی سـەخت‌و دژوار تێـدەگات نـەك وەك شـتێکی سادەو ئاسان، ئەمەش تـەواو پێچـەوانەی ئەوەیـە کـە لـە قورئـانی پـیرۆزدا باسـی لێـوەکراوە. هـەروەها فەنـدەمێنتالیزم مانـای خۆبەسـتنەوەیەکی حـەرفی بـە دەقە پیرۆزەکانەوە دەگەیـەنێ‌و شـروڤە نـەکردنیان بەشـێوەیەکی مـەجازی، واتـە وشـە بەسـەر جەوهـەردا زاڵـدەکات یـان وشـە بەسـەر مەبەسـتە قوڵەکـەی دەقـە ئاینیەکەدا زاڵدەکات.

بـۆ نمونـە فەنـدەمێنیتالیزمی پرۆتسـتانتی لـە ئـەمریکا، بەشێوەیەکی حەرفی لە کتێبی پـیرۆز تێـدەگات‌و ڕازی نییـە خوێندنەوەیـەکی مەجازیانـەی بـۆ بکرێـت. لێـرەوە فەنـدەمێنیتالیزم مانـای گەڕانەوەیە بۆ ڕیشە (اصول)و خۆبەستنەوەیەکی حەرفیانەی

چەقبەستووە پێیەوە. لەمەوە گونجاندنێك لەنێوان ئیمانی ئاینی ئێستا لەلایەكەوە لەگەڵ ئەو شێوازە ڕۆشنبیرییە یان لەگەڵ ئەو دامەزراوەییە كە ئەم ئیمانە لە ساتێك لە ساتەكانی ڕابردوی دوردا كردویەتی بەبەر ئایندا لەلایەكی دیكەوە، دێتەكایەوە. ئەمە لەكاتێكدایە ئیمان هەمیشەو بەشێوەیەكی بەردەوام بە كراوەیی و بە ئازادیو بە تازەبونەوە دەمێنێتەوەو نابێت جێگیربێت.

ئێمە لەم سەردەمی زانستو فەلسەفەی مۆدێرنەدا، ناتوانین باوەڕ بە هەموو ئەو خورافاتە یان ئەو موعجیزانە بكەین كە دژ بە یاساكانی زانستی فیزیا یان یاساكانی سروشتن، وەك ئەوەی پێشینان باوەڕیان پێی هەبووە. ئێمە ناتوانین كتێبە پیرۆزەكان وەك كتێبی فیزیا یان كیمیا یاخود بایەلۆجیا یان بیركاری...هتد وەربگرین، بەڵكو ئەوانە بە پلەی یەكەم كتێبی ڕێنیشاندەری ڕۆحیو ئەخلاقین، بەلام كەسی فەندەمێنتالیست لەو بڕوایەدایە چی زانستی تازە هەیە هەر هەمووی لەناو كتێبی پیرۆزدا هەیە.

* فەندەمینتالیزم تا چ ئاستێك بووەتە كێشەیەكو ڕوبەڕوی جیهانی ئیسلامی بووەتەوە؟

- فەندەمێنتالیزم بووەتە كێشەیەكی سەرسوڕهێنەرو بەربەستێكە لەبەردەم پێشكەوتنی گەلانی عەرەبیو ئیسلامیدا، چونكە بیروڕاكانی تەواو پێچەوانەی تیۆرەكانی زانستی تازەیە، لەگەڵ ئەوەشدا خۆی وەك كۆمەڵێ بیروڕای پیرۆز دەسەپێنێ كە مەعسومەو شوێنی مشتومڕو قسەلەسەركردن نییە. لێرەوە مرۆڤی موسڵمان خۆی لە حاڵەتی دوڵەتبونێكی سەختدا دەبینێتەوە، ئەو لەلایەكەوە گەر ئیشی بە تیۆرە تازەكان كردو گوێی بە ئەفكاری فەندەمینتالیزم نەدا، ئەوا هەست بە گرێی گوناه دەكات، چونكە ئەم فیكرانە وەك فیكرەیەكی پیرۆز خۆیان بەسەر كۆمەڵگادا سەپاندووە. لەلایەكی دیكەوە گەر پشتی كردە ئەفكارو تیۆرە تازەكانو ملكەچی بیروڕاكانی فەندەمێنتالیزم بوو، ئەوا هەستدەكات لە سەردەمەكەیو لە پێشكەوتنی زانستیو فەلسەفیو عەقلانییەت دادەماڵرێ. لێرەوە ئەو سەری لێتێكچووەو كەوتووەتە ناو كێشەیەكی ڕاستەقینەوەو نازانێ چۆن چۆنی لێی بێتەدەرەوە یان چۆن چارەسەری بكات. ئەم كێشەیەش چارەسەر ناكرێت تەنها ئەو كاتە نەبێت كە بیرمەندانی عەرەب خوێندنەوەیەكی تازە بۆ پەیامی قورئان یان بۆ پەیامی ئیسلام دێننەئاراوە: واتە خوێندنەوەیەك لەگەڵ تازەگەریدا بگونجێت نەك دژی بێت، وەك ئەوەی لە ئێستادا هەیە. بە مانایەكی دیكە پێویستمان بە خوێندنەوەیەكی لیبراڵیانە یان عەقلانی بۆ ئیسلام هەیە، ئەمەش بۆ ئەوەی ڕوبەڕوی ئەم خوێندنەوە تاریكبینە توندڕەوە ببێتەوە كە لەمرۆكەدا دەستی بەسەردا گرتوین.

* بەڕای ئێوە بۆچی تەنها جەخت لەسەر فەندەمێنتالیزمی ئیسلامی دەكرێت، لەكاتێكدا

فەندەمێنتالیزم پەیوەستە بە هەموو ئاینەکان و عەقیدەکان؟ ئایا مەسەلەکە بەپێی گوزارشتی "جیل کبیل" تۆڵەسەندنەوەی ئاینە بۆ خودی خۆی؟

– وەك پێشتریش وتومە فەندەمێنتالیزم لە هەموو ئاینەکاندا هەیەو تەنها تایبەت نییە بە ئاینی ئیسلام، بەڵام مەسیحییەکانی ئەوروپاو هەروەها جولەکەکانیش توانیان ڕەخنە لە عەقیدە کۆنەکانیان بگرن، ئەمەش دوای ئەوەی میتۆدە زانستی و مێژوییەکانیان بەسەر ئەو عەقیدە کۆنانەیاندا پراتیزەکرد، ئەمەیە تاکو ئێستا لە ئیسلامدا ڕوینەداوە، وەلێ دواتر هەر دەبێ ڕوبدات.

لێرەوە مەسەلەکە تەنها مەسەلەی کاتە، ئەوەشی تایبەتە بە گوزارشتەکەی "کبیل" تۆڵەسەندنەوەی ئاین بۆ خودی خۆی، مانای ئەوەیە ئاین بە گڕوتینێکی بەهێزترەوە گەڕاوەتەوە بۆ گۆڕەپانەکە، گەڕانەوەیەك لەو بڕوایەدابوین لە سەردەمی هەیمەنەی ئایدۆلۆژیاکانی لیبرالیەت و مارکسیزم و ناسیۆنالیزم...هتد، بە تەواوی تێمانپەڕاندبوو.

* فەندەمێنتالیستەکان بەوە تۆمەتبار دەکرێن کە مۆدێرنە ڕەتدەکەنەوە، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا ئەوان لە خەڵکانی مۆدێرن باشترو زیاتر سود لە بەکارهێنانی ئامرازەکانی و تەقەنیاتەکان وەردەگرن، ئایا ئەمە دووفاقییەك نییە لە ڕەفتاریاندا؟

– فەندەمێنتالیستەکان لە زانستی مۆدێرن تەنها لایەنە تەکنەلۆژیاکەی و ئامێرو ئالەتەکانی وەردەگرن و ئەو فەلسەفە گشتییەی لەپشت دروستکردن و هێنانەئارای ئەو تەکنەلۆژیایەوە ڕاوەستاوە، ڕەتدەکەنەوە. لەبەر ئەوە هەندێ لێکۆڵیار بە شیزۆفیرینیا تۆمەتباریان دەکەن.

* زانای تیۆلۆژی ئەڵمانی "هانز کۆنگ" وایدەبینێ گفتوگۆی نێوان مەزهەبەکانی مەسیحیەت یان ئەوەی بە بزوتنەوەی (مەسکونییە) ناسراوە، ئەوە بووە هۆی بەدەستهێنانی ئاشتی لەناو ئاینی مەسیحیدا. ئایا ئەمە لەلایەکەوە دەبێتە مەرجێك بۆ گفتوگۆی نێوان مەزهەبەکانی ئیسلام لەنێو خۆیانداو لەلایەکی دیکەوە دەبێتە مەرجێك لەنێوان ئاینە گەورەکاندا؟ بە ڕای ئێوە ئایا تەنها ئەوە بەسە بۆ لەناوبردنی فەندەمێنتالیزم؟

– من بەوپێیەی "هانز کۆنگ" زانایەکی تیۆلۆژیای گەورەیە لەناو مەسیحیەتدا، ڕێزێکی زۆری دەگرم. ئەو گەلاڵەی تیۆلۆژیایەك دەکات کە شایەنی سەدەی بیست و یەکە، واتە تیۆلۆژیایەکی ئازادو سەربەستانە کە لەگەڵ ئەو پێشکەوتنەی مرۆڤایەتی لەبواری زانست و فەلسەفەدا بەدەستیهێناوە دەگونجێ. لێرەوە ئەو تیۆلۆژیای سەدەکانی ناوەڕاستی تێپەڕاندووە، چونکە ئەو تیۆلۆژیایە چیتر بۆ ئەم سەردەمەمان دەستنادات. خۆزیا لە جیهانی ئیسلامی خۆشماندا زانای ئاینی کراوە بەسەر تیۆرە زانستی و فەلسەفییەکانی وەك ئەومان هەبوایە.

بێگومان بزوتنەوەی (مەسکونیە) لەنێو

مەسـیحیەتی ئـەوروپادا دەرئـەنجامی نایـابی لێکەوتـەوە، پێویسـتە هـەمان شتیش لەلای ئیسلام ڕووبدات، چونکە ململانێی سونەو شیعە خەریکـە سـەرتاپای ناوچـەکە وێـران دەکـاتو لـە هـەموو شـوێنێکدا ئـاگری شـەڕی ناوخۆ هەڵدەگیرسێنێ.

* لـە کتێبەکـەدا مـەیلێکی ئاشکرا هەیە، ئەویش بریتییە لـەوەی فیکـری خۆرئـاوا گەشتووەتە قۆناغی مۆدێرنەو پـاش مۆدێرنـە، چـونکە پێشـکەوتنی زانسـتی لـە خۆرئاوا هاوکات بووە لەگەڵ پێشـکەوتنی فیکـری ئـاینی، ئایـا پێویسـتە لەسـەر فیکـری عـەرەبی/ ئیسـلامی بـاوەڕ بـەم تیۆرەیە بێنێو بێ هیوابێت؟

– نـەخێر، پێویسـتە بـێ هیـوا نـەبین. بـەڵام پێویسـتە لەسـەر هـەمان ڕێچـکەی ڕۆشـنگەری ئـاینی بـڕۆین کـە نەتـەوە پێشـکەوتووەکان لەسەری ڕۆشتون، گەرنا ئەوا لەو تەڵزگەیەی کە تێیکەوتوین دەربازمـان نابێـت، هـەموو کـاتێکیش هـەروابووە کـە دواکـەوتو شـت لـە پێشـکەوتووەوە وەردەگـرێو ئەمـەش هـیچ نـەنگیو عەیبەیـەك نییـە، ئەمـە لەسـەردەمی "ئـیبن خەلـدون"ەوە یاسـایەکی سۆسیۆلۆژییە.

* ڕەئیتـان دەربـارەی ئـەو قسەیەی "هاپرماس" چییە کە وایـدەبینێ ڕاسـتکردنەوەی ڕێـڕەوی جیهـانگیری، زامـنی لەناوبردنی تیرۆرە؟

– لەوبڕوایـەدانیم "هاپرمـاس" کێشـەی فەنـدەمێنتالیزمی ئیسـلامی تـەنها کـورت بکاتـەوە بـۆ ڕەهەنـدە ئابوریەکـەی، ئـەو لەگـەڵ ئەوەشـدا داوای ڕۆشـنکردنەوەی جیهـانی ئیسلامیش دەکات، بەڵام ئەو جەخت لەسەر بەرپرسیاریەتی ستەمی جیهـانگیری دەکـات، ئەمـەش بـۆ ئـەوە وەك بیرمەنـدێکی خۆرئـاوا جێگـای شـانازیو شـەرەفە، چـونکە "هاپرمـاس" دان بـە بەرپرسـیارەتی خۆرئـاوادا دەنێ لەو بارودۆخە سەختەی کە ئێمەی تێکەوتووە. لێرەوە فەنـدەمێنتالیزم دیاردەیـەکی ئاڵۆزەو لەیەك کاتدا فاکتەری نـاوخۆییو دەرەکـی هەیـەو نابێـت تـەنها جـەخت لەسـەر فاکتەرێکیان بکەینەوەو ئەوی دیکەیان وازلێبێنین.

**سەرچاوە:**

ماڵپـەری: القنطـرە 2007/4/17.

# میلان کۆندێرا لە دەقێکی نوێدا

# "سەد ساڵ لە تەنهاییدا" ماڵئاواییەکە لە ڕۆمان

لە عەرەبییەوە: ساکار ڕەووف بێگەرد

لە سێ دەقی نوێدا، ڕۆماننوسی چیکی فەرەنسی میلان کۆندێرا، تیشك دەخاتە سەر چەمکی "حیکمەتی بوون" لە ڕۆماندا. ئەم سێ دەقە باس لە سێ ڕۆمانی گەورە دەکەن کە ئەوانیش "گەمژە"ی دیستۆفسکی و "سەد ساڵ لە تەنهاییدا"ی گابریل گارسیا مارکیز و"دوا ئاخی مور"ی سەلمان روشدیە و لە پاشکۆی (جیهانی کتێب)ی ڕۆژنامەی لومۆندی فەرەنسی بڵاوکراوەتەوە. لێرەدا تەنها ئەو دەقە دەخەینە



میلان کۆندێرا

ڕوو کە باس لە ڕۆمانی"سەد ساڵ لە تەنهاییدا" دەکاو لەژێر ناوی"ڕۆمان و لەدایکبوون"ە.

ڕۆمانی"سەد ساڵ لە تەنهاییدا"ی مارکیز بە سەرکەوتنێك بۆ ڕۆمان دەژمێررێت، وەلێ بە پێچەوانەوە ڕۆمانەکە تەواوبوونی سەردەمێك ڕائەگەیەنێ کە تاکی بە(بنەمای هەموو شتێك) دائەنا.

لە درێژەی خوێندنەوەی ڕۆمانی"سەد ساڵ لە تەنهاییدا" بیرۆکەیەکی سەیر بە خەیاڵمدا هات، پاڵەوانی ڕۆمانە مەزنەکان منداڵیان نییە، لە کاتێکدا بەدەگمەن و لە سەدا یەکی ئەوانەی لە ڕۆمانەکەدان منداڵیان نییەو و بەلای کەمەوە لەسەدا پەنجای کەسایەتیە گەورەکانی

ڕۆمانەکە بێ دوبارە لەدایکبوونەوەی ژیانی خۆیان، کۆتایی بە ڕۆمانەکە دێنن. کەسایەتی ڕۆمانەکان لەسەر شێوەی غرار بنتاگرویال و بانورج و دون کیشوت و فالمون و مارکیزە میرتوی لە ڕۆمانی "پەیوەندیە ترسناکەکان" و توم جونز، کە ناودارترین کەسایەتیی ڕۆماننوس (هنری فیلنگ) ە، ئەمانە هەموویان هیچ کەسایەتیەك لە پاش خۆیان جێناهێڵن کە جێیان بگرێتەوە. بۆ دڵنیابوونی زیاتر، زۆربەی هەرە زۆری پاڵەوانەکانی ستندال یان منداڵیان نییە یاخود هەرگیز بە منداڵەکانیان نەگەشتوون. بە هەمان شێوەش پاڵەوانی ڕۆمانەکانی بلزاك و دیستویفسکی و مارسیل پروست لە "گەڕان بە دوای زەمەنی ونبوو"دا و هەروەها پاڵەوانەکانی موزیل، ئولریش و ئاگاتا و والتەرو ژنەکەی کلاریس و دیوتیم و شفیك. هەروەها پاڵەوانی ڕۆمانەکانی فرانز کافکا، جگە لە کەسایەتی کارل روسمان کە سکی کارەکەی پڕ دەکاو پاشان بۆ سڕینەوەی هەموو ئاسەوارێکی ئەو منداڵە لە ژیانیدا، بۆ ئەمەریکا هەڵدێت، هەر ئەو ساتەش ڕۆمانەکە لەدایك دەبێت. ئەم نەزۆکییە پێشتر نە وێنا کراوەو نە نەخشەی بۆ دانراوە لەلایەن ڕۆماننوسەکانەوە بەڵکو لە بیرکردنەوە لە هونەری ڕۆماننوسین (یاخود لە نەستی هونەری ڕۆمان) کە نەفرەت لە بیرۆکەی لەدایکبوون دەکات، هاتۆتە ئاراوە.

بەپێی وەسفی هایدگەر، ڕۆمان لەگەڵ مۆدێرنیتەدا لەدایك بووە، کە تاکی بە "بنەمای هەموو شتێك" دائەنا. هەر بەهۆی هونەری ڕۆمانەوە مرۆڤ تەوانی وەك تاکێکی ناو کۆمەڵگا لە ئەوروپادا بژی. بەڵام لە واقیعدا ئێمە لە وردەکاریەکانی ژیانی باوك و دایکمان، پێش لەدایکبوونمان، بێئاگایان و بەهۆی چەند زانیاریەکی پەرش و بڵاوەوە خزمەکانمان دەناسین و هاتن و ڕۆشتنیان دەبینین، هەرکاتێکیش بڕۆن کەسانێکی تر جێگایان دەگرنەوە. ئەمانە زنجیرەیەك زیندەوەری شیاو بە جێگرتنەوەن. تەنها ڕۆمانە کە تایبەتمەندی دەداتە مرۆڤ و لایەنەکانی ژیان و بیر و هەستەکانی بە تەواوی دەخاتەروو و ناهێڵێ شوێنی بگیرێتەوە: کە ئەمەش تەوەری هەموو شتێکە.

کاتێك دون کیشوت دەمرێ، بەشەکانی ڕۆمانەکە کۆتایی پێدێت چونکە ئەو منداڵی نییە جێی بگرێتەوە، ئەگەریش خاوەن منداڵ بوایە ئەوا درێژە بە ژیانی ئەدراو لاسایی دەکرایەوە یاخود دەبووە جێی مشتومڕ یان بەرگری لێدەکرا یان هێرشی دەکرایە سەر چونکە مردنی باوك دەرگا لەبەردەم هەموو گریمانەکان والا دەکات.

ئێمە هەر لە منداڵییەوە ئەوە دەبیستین کە منداڵەکانت بەردەوامی ژیانتە و ئەوان نەمری تۆن. ئەگەر ژیانی تاك تا دوای مردنیشی بەردەوام بێت مانای وایە ژیانی ئەو کەیانێکی سەربەخۆی خۆی نییەو کەیانێکی ناتەواوەو هیچ مەنایەکی نییە.

ئەوەی لە پێشەوە باس کرا کە تاك، "بنەمای هەموو

شتێك"ه، تەنها خەیاڵەو خەونێكە سەدەكانی فیكری ئەوروپی وێنەی كێشاوە.

لە رۆمانی "سەد ساڵ لە تەنهاییدا" خوێنەر بۆی دەرئەكەوێ كە خەون سەرچاوەی هونەری رۆمانە و تاك چیتر تەوەری بایەخپێدان نییە، بەڵكو كۆمەڵێك كەس كە هەریەكەیان دەگمەنێتی خۆیان دەپارێزن و وەك تیشكی خۆرێكی هەڵهاتوو كاتێ گەمە لەگەڵ ئاوی رووباردا دەكات، تێئەپەڕن. هەریەكەیان ئایندەی حوكمكراو بە فەرامۆشی خۆی هەڵگرتووە، هیچكام لەوانە لە سەرەتاوە تا كۆتایی لەسەر شانۆی رۆمانەكە نامێننەوە. بۆ نموونە، ئورسولای پیرەژن كە دایە گەورەی خێزانی بویندیایە، لە تەمەنی سەدو بیست ساڵیدا دەمرێ و رۆمانەكە دوای ئەویش هەر بەردەوام دەبێت. ئەم بەردەوامیە تەنانەت لە ناوە لەیەكچووەكانی كەسایەتی ناو رۆمانەكەدا بەرجەستە دەبێت وەك ئەركادیو خوسیە بویندیا و خوسیە ئەركادیو وخوسیە ئەركادیوی دووەم و اوریلیانو بویندیا و ئوریالیانوی دووەم، مەبەست لەمەش تەنها ونكردنی سیمای كەسایەتیەكانە كە یەك لەوی دی جیا دەكاتەوە، بەمەش خوێنەر تووشی سەرلێشێوان دەكات. ئەم كەسایەتیانە چیتر پابەند نین بە سەردەمی تاكێتی ؟ ئەی پابەندی چ سەردەمێكن؟ تۆ بڵێی بە سەردەمی هیندیەكانی ئەمەریكا؟ یان لەوانەیە پابەند بن بەو ئایندەیەی كە تاك تیایدا لە دەریای مرۆڤایەتیدا دەتوێتەوە؟ وەلێ بەلای منەوە ئەم رۆمانە ،كە بە لوتكەی هونەری رۆمان دەژمێررێ، تەنها ماڵئاواییەكە لە سەردەمی رۆمان.

**سەرچاوە:**


سایتی دار الحیاة رۆژی 5–6–2007

# زۆرزانێتیەکانی کیژۆڵە نەگریسەکە

ئیبراهیم حاج عەبدی

لە عەرەبییەوە: سەهەند

لە کۆتایی ڕۆمانی "زۆرزانیەتەکانی کیژۆڵە نەگریسەکە"ی ڕۆماننووسی پیرۆیی ماریۆ بارگاس یۆسادا، ژنە قارەمانی ڕۆمانەکە لەگیانەلآدایە، وەسیەت بۆ گێڕەرەوە– قارەمانە پیاوەکە دەکات و دەڵێت: "ئەگەر ڕۆژێك لە ڕۆژان بیرت لەوە کردەوە چیرۆکی خۆشەویستیمان بنووسیتەوە، زۆر بە خراپ دەرم مەخە گێڕەرەوە عاشقەکە پێی دەڵێت: "چۆن ئەمەت بە




بیرداهات؟" ژنە عاشقەکە کە لەسەرەمەرگدایە وەڵامی دەداتەوە: "تۆ هەمیشە کەڵکەڵەی ئەوەت هەبوو ببیتە نووسەر، بەڵام پرکێشیت نەدەکرد، ئێستا کە بە تەنیا دەمێنیتەوە، لە دەستت دێت ئەم هەلە بقۆزیتەوە، من ئەمەم زۆر بەلاوە، سەیر نیە، هەقە دانی پێدا بنێیت، هەر هیچ نەبێت، کە من بابەتی ڕۆمانێکم داویتیٚ، ئەی وانیە منداڵە ڕەندەکە؟"

ئەم گفتوگۆیەی لە دوا لاپەڕەی ڕۆمانەکەدا، لە نێوان ئەو دوو عاشقە پیرەدا ڕوودەدات، قارەمانی ڕۆمانەکە، ریکارد و سۆمۆکۆرسیۆ هەڵدەنێت، کە

بە تونـاوتوونی یادەوەریـە سـەختەکانیدا بچـێتەوەو هـەڵیانی کۆڵێـت، نیوسـەدە دەگەڕێتـەوە دواوە بـۆ گێڕانـەوەی چـیرۆکی خۆشەویسـتیەکی سـەیر و دانسـقە، یەکـەم پزیسـك لـە لیمـاوە دەسـتپێدەکات (واتـە پایتـەختی پـیرۆ)، کـە ئـەو دوو عاشـقە منداڵێتییـەك بەسـەر دەبـەن هەنـدێ شـتی سـەیری سـەرەتای خۆشەویسـتیەکی تیایـە کـە بـە شـەرم و پاکیزەییـەوە دروسـت دەبێـت. بـەڵام وەکـو خـاڵێکی کـوتراو لەسـەر چارەنووسـیان دەمێنێتـەوە. بـە جۆشخواردوویی لە ناخیانداو لـە وێسـتگەکانی داهـاتووی ژیانیانـدا و بەتایبـەتیش لـە پـاریس و لەنـدەن و توکیـۆدا هەر دەمێنێت تا لـە مەدریدداو بـە مـەرگی کیژۆڵـە نەگریسـەکە کۆتـایی دێـت. ئـەم گەشـتە درێژخایەنـەی عیشـق تـەوەری دوا رۆمـانی یۆسـایە کـە وەرگێڕانە عەرەبیەکەی لەلایـەن دار ئەلمـەداوەو لـە سـاڵی 2007 دا لـە دیمەشـق چـاپ کـراوەو سـالح عـەلمانی وەریگێـڕاوە، ئەمـەش هـەر بـە ماوەیـەکی کـەم دوای دەرچوونی ڕۆمانەکە بە زمانی ئیسـپانی، واتـە زمانـە ئەسڵیەکەی.

ڕیکاردۆ بە ڕاناوی کەسی یەکـەم و بـە زەینێکـی سـاف و تیـژەوە حیکایـەتی خۆشەویسـتیەکەی دەگێڕێتـەوە، لـەم گێڕانەوەیەشـدا زنجـیرەی زەمـەنیی ڕووداوەکـان ڕەچـاودەکات. منـاڵی و کـورێتیی خـۆی بیردێتـەوە لـە گەڕەکی میرافلوریس لە لیما و لایـەنێکی ژیـانی جـەنجاڵی و هەڵەشـەیی ئـەو ساڵانە تۆمـار دەکـات. لـەوێوە یەکـەم لاپـەڕەکانی بەسـەرهاتی عیشقەکەی دەخوێنێتەوە، ئەو عیشـقەی کـە بـە هـاتنی کچێك دەستپێدەکات بۆ گەڕەکەکەیان لـە هـاوینی سـاڵی 1950 دا و بـۆ یەکـەمجار دەبێتـە مایـەی وروورژانـدنی هەسـت و سـۆزی خۆشەویستی لەلای و بە نیگا گاڵتـەجار و پێکەنینـە لاسـارەکەی کاریگەرییـەك لەسـەری جێـدەهێڵێت کـە بـە درێـژایی ساڵانی داهـاتووی لە کـۆڵی نابێتـەوە، ئیـدی لـەو ساتەشـەوە نـاوی دەبێـت بـە "کیژۆڵـە نەگریسـەکە" کـە "وەکـو قامیشـێك بـە پێـی ڕیتمـەکانی مـامبۆ لـوول دەخوات" و وەکو تارماییەکی دڵنـەوازیش کـەمێك گەمـە بـە هەسـت و سـۆزەکانی کابرایـەکی خـۆڕاگر دەکـات و، پاشـان دیـار نامێنێـت، ریکاردۆ، لەو کاتـەوەی هۆشـی بـە دونیـا کراوەتـەوە، خـەون بـەوەوە دەبینێـت لـە پـاریس بـژی "لەوانەیـە خـەتای بـاوکم بووبێـت، وای لێکـردم کتێبـەکانی پـۆڵ ڤاڤیـل و ژۆل ڤێرن و ئەلێکساندەر دۆماس و هەنـدێ نووسـەری تـر بخوێنمـەوە، بـەر لـەوەی لـە ڕووداوێکـی ئۆتۆمبێلـدا خـۆی بکوژێـت و بـە هـەتیوی جـێم بهێڵێت. ئـەو ڕۆمانانـە مێشـکی منیان پڕ کرد لـە جەربـەزەیی و قەناعـەتیان پـێ هێنـام کـە ژیـان لـە فەرەنسـا گەلێ دەوڵەمەندترو تەڕوبڕترو جـوانترە لـە دیکتاتۆریەتەکـەی ژەنـەڕاڵ ئۆردیـا کـە لـە پـەنجاکانی سـەدەی ڕابـردوودا لە پیرۆدا حوکمی دەکرد.

ریکاردۆ لە سەرەتای شەستەکاندا دەچێت بۆ پاریس کە "گەرمەی شەڕی کوبایە و ئەوێ پڕە لە کۆمەڵێك لاو کە لە هەر پێنج کیشوەرەکەی دونیاوە هاتوون و خەون بەوەوە دەبینن کە قارەمانێتیەکەی فیدڵ کاسترۆو پیاوە ریشدارەکانی لە وڵاتەکانی خۆیاندا دووبارە بکەنەوە و بە جیددی بێت یان گاڵتە لە پیلانەکانی کافیتریاکاندا خۆیان بۆ ئەنجامدانی ئەو کارە ئامادە دەکەن".

ریکاردۆ لە رێکخراوی یۆنسکۆدا وەکو وەرگێڕێکی فەوری بۆ ئەو کۆنگرە و کۆڕ و کۆبوونەوانەی کە لە پاریس و هەندێ پایتەختی ئەوروپایی تردا دەبەسترێن، دادەمەزرێ. لەگەڵ پۆڵدا ئاشنایەتی پەیدا دەکات کە یەکێکە لە لاوە خەونبینەکان کە لە پاریس پێشوازیی لەو شۆڕشگێڕانە دەکرد لە پیرۆوە دەهاتن بە مەبەستی مەشقکردن تا بیاننێرێت بۆ کوبا و پاشان بگەڕێنەوە بۆ پیرۆ بۆ شەڕی پارتیزانی لە پێناوی رووخانی دیکتاتۆریەتدا لەو وڵاتە.

کیژۆڵە نەگریسەکە یەکێکە لەوانەی دێن بۆ پاریس تا بچن بۆ کوبا، کاتێ ریکاردۆ دەیبینێت سەر لەنوێ ئاگری خۆشەویستی کڵپە دەکاتەوە..

گەمەی خۆشەویستی لەم رۆمانەدا لەسەر بنەمای ون بوون و دەرکەوتنەوەیە. ئەم کیژۆڵە نەگریسە هەر ئەوەندەی دێتە ژیانی ئەم وەرگێڕە عاشقەوە، هێندە نابات وەکو هەورێکی هاوینەی تێپەڕ لە مانەوە بێزار دەبێت. "بۆ ساڵانێکی زۆر ئافرەتێکم خۆشویست کە وەکو ئاگرێکی درۆزن لە ژیانمدا دەرکەوت و ون دەبوّوە، بۆ ماوەیەکی کەم ژیانمی دەخرۆشاند، پاشان بە وشکوبرنگی جێی دەهێشت و لەبەردەم هەر جۆرە جۆش و خرۆش و ئەوینێکی تریشدا رێگر بوو". شووی بە کابرایەکی فەرەنسایی کرد و گەڕایەوە بۆ لای ریکاردۆ، پاشان شووی بە مەیتەرێکی ئینگلیز کرد و دواتریش دوای سەرابێکی ئاسیایی دوور کەوت و لەگەڵ پیاوێکی ژاپۆنیدا ژیا. بە درێژایی ئەم رووداو و ساڵانە ریکاردۆ بە گێلێتیی عاشقێکی سادەوە هەر چاوەڕوانی ئەم کیژۆڵە نەگریسەیە کە تا ئەوپەڕی سەرچڵی مل دەنێت و کاتێکیش شکست دەهێنێت، دەگەڕێتەوە لای ریکاردۆ تا کەمێك پشوو بدات و دواتر دەست بە سەرچڵیەکی تر بکاتەوە. عاشقەکە پەی بە سروشتە فێڵاوییەکەی خۆشەویستەکەی دەبات و دەزانێت خۆی لە کەسێك دەچێت کە لەو خۆشەویستەی دەپاڕێتەوە تا بە ئەمەك و دڵسۆز بێت و ئەویش بەردەوام دەست بە روویەوە دەنێت. بەڵام بانگەوازێکی شاراوە وای لێ دەکات بەردەوام دوای ئەو سەرابە دڵرفێنە بکەوێت. دەڵێت: "تاقە شتێك کە من لەم ژیانەدا بەهەمان خولیاوە دەمەوێ کە خەڵکی بۆ سەروەت و شکۆداری و سەرکەوتن و دەسەڵات هەیانە، ئەوەیە کە ئەو بۆ من بێت، بە هەموو درۆ و فریو و خۆپەرستی و خۆشاردنەوەکانیەوە" بە

دڵشکاوییەوە پێی دەڵێت: "تا ئێستا نازانیت؟ من عاشقتم، شەیداتم، لە مناڵییەوە شێتی ئەو شیلییە بچکۆلانەیەم، ئەو خۆ فیداکەرە، هاوسەرەکەی فەرمانبەرە فەرەنساییەکە، ژنی مەیتەرەکەو دۆستی ڕێگرە ژاپۆنییەکە.. من هەتا هەتایە خۆشم دەوێت لەبەرئەوەی لە هەموو ئافرەتانی دنیا دڵڕفێنترو جوانترە".

ئەم حیکایەتی عیشقە نامانباتەوە سەر ئەو چیرۆک و ئەفسانە کلاسیکیە نەمرانەی خۆشەویستی کە لە کەلەپووری میللەتاندا هەن و دوو عاشقەکە وا پیشان دەدەن کە کۆسپ و تەگەرە ناهێڵن بەیەک بگەن. لێرەدا جگە لە سروشتە ناسەقامگیرەکەی ئافرەتەکە هیچ کۆسپێکی دی لە ئارادا نییە. گەرچی ڕۆمانەکەش لەسەر ئەم بەسەرهاتی عیشقە بنیات نراوە بەڵام یۆسا لایەنە ڕۆمانسیەکەی کەم دەکاتەوەو لە وەسفکردنی دیمەنە حیسییەکاندا زۆر دەڕوات و پاڵەوانی ڕۆمانەکەی دەکات بە شاهیدێک بەسەر ڕووداو و گۆڕانکارییەکانی وڵاتەکەیەوە کە لە ساڵی 1968دا کودەتایەکی سەربازی بەخۆیەوە دەبینێت بە سەرکردایەتیی ژەنەراڵ خوان فیلاسکۆ ئەلفارادۆ کە کۆتایی بە دیموکراسیەتەکەی سەرۆک پیلاوندی تیری دەهێنێت کە دوای 12 ساڵ لەو کودەتایە دەگەڕێتەوە سەر حوکم. بە شێوەیەکی هاوتەریب بە گێڕانەوەی شتەکان لە پیرۆ باس لە سروشتی ژیانیش دەکات لە ئەورووپادا کە لەو دەمانەدا شۆڕشی خوێندکارانی بەخۆیەوە بینی، هەروەها باسی مۆسیقای جەنجاڵ و تەقەڵلای لاوان بۆ ژیانێکی ئازاد و کراوەو جەنجاڵ. لە کاتێکیشدا پاریس پانتاییەکی زۆری ڕۆمانەکە داگیر دەکات، گێڕەرەوە سەرچڵیەکانی خۆی لە هەندێ پایتەختی تری ئەورووپاشدا باسدەکات تا دەگاتە تۆکیۆش.

لەم گەشتە درێژەشدا یۆسا سیمای گەلێ کاراکتەری ڕۆمانئامێزی دانسقەمان بۆ دەنەخشێنێت. پاڵەوانی ڕۆمانەکە "ڕۆشنبیرەکە" لە ڕێی کار و هاوڕێیەتیەوە پەیوەندیی لەگەڵ دەستەبژێرێکی ڕۆشنبیردا هەیە. فیلم دەبینێت، بۆ نمایشە شانۆییەکان و بۆ کۆنسێرتەکان دەچێت و هەندێ کتێب و ڕۆمان دەخوێنێتەوە کە ناویان لە ڕۆمانەکەدا هاتووە وەکو "پەروەردەی عاتیفی"ی فلۆبێر و "باوکان و کوڕان"ی تۆرگنێڤ و "نوێژی جەنازە"ی ئانا ئاخماتۆڤاو، چیخۆف تەرجەمە دەکات و خەون بەوەوە دەبینێت ببێت بە نووسەر..

ڕۆمانەکە تۆمارێکی گەورەی کۆمەڵێک ڕووداوی نیوەی دووەمی سەدەی بیستەمە و نزیکە لە دۆکیومنتێکی مێژووییەوە، چونکە یۆسا شوێنەکان و کەسەکان وەکو خۆیان ناو دەبات.

لە سەرێکی تریشەوە ڕۆمانەکە نزیکە لەوەوەی کە ڕەنگدانەوەی ژیننامەی یۆسا خۆی بێت، ئەوەی ئاگاداری ژیانی خاوەنی "ئاهەنگی

بەران" بێت دەبینێت کە خاڵی هاوبەشـــی لەگـــەڵ ژیـــانی پاڵـەوانی ئـەم ڕۆمانـەدا زۆرە. بەڵام یۆسا وای پێباشتربوو کە ئــەو بایۆگرافیــە لــە بــەرگی ڕۆمانـدا بخاتـە ڕوو تـا بتوانـێ وا لــە ڕووداوە واقیعیــەکانیش بکـات کـە لەگـەڵ ڕۆمـانێکی سەرنجڕاکێشـــدا بگـــونجێن، ڕۆمانێك کـە تیایـدا زەمـەنێکی درێژی یـاد و خـەونی ئـاوا بـوو چـــڕ دەکاتـــەوە، بـــەڵام ئـــەو عیشـــــقەی کـــــە بەســــــەر دیمەنــەکانی ژیانــدا زاڵ بــوو هـەر بـە گـەرمی لـە دالأنـەکانی ڕۆحـدا دەمێنێتـەوەو گێڕەرەوە هانـــــدەدات نهێنیـــــەکان بـدرکێنێت و بەرەنجامەکەشـی ئەم ڕۆمانە بوو.

**سەرچاوە:**

الحيـــاة – افـــاق – 19/ 6/ 2007.

